٨٠
تشرینی یەكەم و دووەمی ١٩٨٩ ساڵی هەشتەم

# كاروان

گۆڤارێكی رۆشنبیریی مانگانەیە ئەمیندارێتیی گشتیی رۆشنبیریی و لاوان بە زمانی كوردیی و عەرەبیی دەری دەكا .





# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە: ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو
لاوان بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

لەم ژمارەیەدا

سەرنووسەر
حکمت حاجی سلیم

جێگری سەرنووسەر
حسین رەشوانی

٨٠
و دووەمی [illegible]
١٩٨٩
ساڵی هەشتەم


| | | |
|---|---|---|
| ● خزمەتگوزارانی کورد: | غازی حسن، لەتیف بەرزنجی | ٤ |
| ● مێژوو: | نەژاد عەزیز سورمێ | ١٥ |
| ● زمانەوانی: | یاسین حسن حسین | ٢٠ |
| ● رەخنەو لێکۆڵینەوە: | احمد سلام، د. عبدالله محمد حداد، عبدالله حمه سوور. | ٢٢ |
| ● دیوانی کاروان: | محمد امین پێنجوینی، عثمان عونی، هیڤی بەرواری، ملا نورالدین سندي، کەژال علی، جمال اسماعیل گردەسۆری، کاوە فیدا. | ٤٠ |
| ● جیهانی چیرۆک: | ئاسۆ احمد، محمد حسن بنافی، فاضل شەورۆ، سگڤان یوسفی. | ٥٠ |
| ● هونەر: | صلاح عبداللّه خۆشناو | ٦٧ |
| ● زانیاری: | د. پەریخان | ٧٦ |
| ● رۆشنبیریی گشتی: | مسعود محمد، سعید یحییٰ | ٧٨ |
| ● فۆلکلۆر: | احمد شادی، غیاث الدین علي. | ٩٦ |
| ● بابەتی هەڵبژاردە: | ئومێد ئاشنا | ١٠٨ |
| ● کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا: | ئازاد، مەتین | ١١٧ |
| ● پۆستەی کاروان | سۆران | ١٢٥ |


ئەدرەس:
هەولێر: ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری کاروان: ت: ٢٠٨٨٢

نرخی «٥٠٠» فلسە

لە نامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لەبەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ.

لەچاپخانەی رۆشنبیریو لاوان لە هەولێر چاپکراوە

# مرۆڤی ئەمر .. بەبڕشـــت و ڕێـــبەرە!!

● غازی حەسەن ●

ناوی تەواوی عەرەب کوڕی شێـخ شەمـۆیـە کورتکـراوەی ناوی (شمس الدین)ەو باپـیریشی ناوی (شێخ شامیل)ە، بە بنەچە سەربە بنەماڵەیەکی یەزیدی یە.

(عـەرەب شەمـۆ) کوڕی دایـك و باوکـێـکـی بەلەنگـازی کوردەو بەکـوڵە مەرگی ژیـانیـان بەسـەر بردووە، تەنیا لەڕۆژی لەدایك بوونیشی کێشەی ژین و [illegible]و چەوسێنەران پێیان ڕەوا نەدیتووە [illegible]یار ژنە ژان گرتوەکەی هێشك بگرێت.. تا بزانێت ئەو (عەرەب)ەی ئەمرۆ دەیناسین، چۆن قاچە بچـوکەکانی لە بەیاری ژیان گیردەکات و زار بۆقیژەی بێـدارانـەی هەڵدێنێ.. عەرەب شەمۆ لەبارەی لەدایك بوونی خۆیـەوە دەگـێڕێتـەوە، ڕۆژێـك کەکـەرەك بوو لەگوندی وەدەرکەوین و ڕەنجبەریمان تەواو بوو بوو.... لەناو کۆنە پەڕۆ قۆتیلکان دا پارچە کاغەزێکم دۆزیەوەو بڕیارێکی لێپرسراوی دەفەرەکی بەسەرەوە بوو. بەباوکم وت «بـاوکـە گیان دیارە پێشان مرۆیەکی گەلەك مەزن بووی، باوکم دایە قاقای پێکەنین و گوتی:

ـ نا... نا کوڕەکەم، لەگەوراتی ڕەشە ولاخ و پەزان زیاتر هیچ کاتێك مرۆیەکی مەزن نەبوویمە.

بەبـاوکم وت، ئەی چۆن لەکـاغـەزەکە نووسراوە وەکی هەرچی سەرۆك و کوێخا هەنە، هەموو بەکۆمەکت بێن؟ باوکم پێکەنیو دەستی بەقسەکردن کرد.

ـ ئەوە چەند ساڵە، بەبیرم نایێت. سەرۆکی ئەو ناوە ڕوس بوو، ئەو کابرایە ماینەکی کڕیبوو نازانم لەکێهالا ماینە عەرەبیەکەی کەجوانی لەدوا دەبێت، لێ ون دەبێت. چەند گەرام و سوڕام ماینـە وتی قەت لێم مەگـەڕێن. کابرا بانگی کردم و وتی:

ـ مۆڵەتت دەدەم، ئەگەر ماینەکەشت نەدۆزیەوە شەرت بێ پێستی پشتت لێـك بکـەمـەوەو پڕی خوێ بکـەم. ئەوەنـدە ترسام، ناوکم کەوت. گەرام سوڕام ئەو دەرو وڵاتەم گێرە کرد، ماین نەبوو. ڕۆژەك بەخەمناکی بۆماڵێ هاتمـەوەو هەموو دەستمان بەگریان کرد، چەند دەردو بەڵا هەبـوو لە سەرم خڕ بووبـۆوە، گریـانیش دادی نەدەداین. پێم لەجەرگی خۆم ناو بۆ لای سەرۆك چووین و پێم وت:

ـ ئاغا، قوربان چەند سوڕام ، گەرام کەسێك بەتەنگمەوە نەهـات، پێیان نەوتم ئەویش ئەوکاغەزەی بۆ نووسیم،

نیتر حاڵ باشتر بوو... هەرکە سەرۆکەکان ئەم نامەیان دەدێت، کۆمەکیان دەکردم. بەو ڕەنگە ماینەکەم دۆزییەوەو بەلێپرسراوەکەم داوە. دەستی لەبەرۆکم بەربوو، دەرباز بووین. باوکم ماوەیەك بێدەنگ بوو، هزری دەکردەوە.. تا شتەکی وەبیربێتەوە پاشان وتی:

- هێی هێ، ئەو ڕۆژەی ئەو کاغەزەیان دامێ چەند دڵ پڕ لەکوڤان و ڕەش بووم، کوڕەکەم تۆ ئەوڕۆژە لەدایك بوویت. خەڵك پێیان دەوتم بۆ کوێدەڕۆیت، کوڕەکت بووە. منیش ئازارو پەژارەیی یەخەی گرتبووم، گوێم بەکەس نەداو بەڕێکەوتم بۆئەوەی ماینە بۆرە بدۆزمەوە. بەم پەرە کاغەزە زانیم کەمن لەڕۆژی ٢٣ (یانڤاری) ١٨٩٧ لەدایك بووم»[1].

ژیان سەیرەو پڕ گێرەو کێشەیە، بەڵام (عەرەب شەمۆ) خێزانەکەی لەناو کەژاوەی کێشەو بەگژا چوونەوەی ژیان لەدێکانی ئەرمەنیو ڕوسیو کوردان بەشوانیو گاوانی ڕۆژیان بەسەر بردووەو دەڵێت... «شەمۆی باوکم کوردێکی هەژاری هۆزی حەسەنی بوو، خەریکی بەخێوکردنی (دەوار) ڕەشەوڵاخی خەڵکی بوو، لەقەزای (سورمەلی) کەپێش تر لەوڵاتی یەریڤان بوو، ژنە گەورەکەی دەمرێت. ئەویش بەکلۆڵی لەگەڵ هەردوو کورەکەی (دەورێش و برۆ) کە گوزەرانی بۆمەیسەر نابێت. لەقەزای (سورمەلی) وەدەردەکەوێت، لەبەر نەبوونی بارگیرێك لەڕێگا تووشی گەلێك چەرمەسەری هات و بەڕێگاوە یەکێکیانی لەئامێز دەکردو ئەوی تریانی لەپشتی هەڵدەدا. ئەوکاتە (برۆ) سێ ساڵ و (دەورێش) دووساڵ بوو، لە لێفە کۆنەکیش قەت هیچیتری شك نەدەبرد[2]»..

هەربەدەردەسەریەوە، ئەم کێوو ئەم شاخیان بڕیو. لەپەسێوی زنارو تاوێرە بەردان ڕاکشاون و لەباوەشی بەسۆزی باوکانە پتر هیچ سۆزێکی تر نەبووە، دوو کوڕە هەژار... دوو کوڕە کورمانج گەرم بکاتەوە. تا لەگوندی (ئازاتی) لە (قارسێ).. لای ژنێکی (فەلە - گاور) دەبێتە ڕەنجبەرو هەر لەو گوندەش تاقە ئافرەتی کورد دەبێت کە دایکی (عەرەب)ە دەیخوازێت، (عەرەب) بەزاری خۆی دەگێڕێتەوە «دایکم لەماڵان کاری دەکرد، خوری دەشۆردو شەیدەکردو تەشی دەڕێست و تەونی دەچنی، لەگەڵ زۆر کاریتر. دوو خوشکم بەناوی (چیچەك) و (گوگێ) هەبوو. باوکیشم هاوینێ بۆبەر مەڕومالاَت دەچوو[3]».

بۆیە (عەرەب)یش بە شوانکارەیی دەبانێت و هەرکە فام دەکات، دەبێتە دواژۆو ئاڵیکاری باوکی دەکات و لەبەر نەداریش ژیان بەگیاو گۆڵی بەهار وەڕێ دەکەن و مەمرەومەژی شەو دەکەنەوە. بەڵێ بزگوری ئەم ماڵە کرمانجە بەردەوام لەسەرپشتی وڵاخی بووەو هەر کەشەرتیان لەگوندێك هەڵدەهات بۆنان پەیداکردن بەرەو گوندێکیتر دەچوون... لەپێناو کارکردن و ڕەق نەبوونە لەبرسان تووشی گەلێك تیاهەڵدان و سەرکۆنەکردن بوونەو ژیانیان داستانێکی سەیرو سەمەرەیە..! گەلێك شتی نەوتۆیان بەسەر هاتووە، هەوێنی لێکۆڵینەوەی ژیان ئەوکاتی دەرەبەگایەتیو گوندیەکانە.

ئەوکاتەی بەئاواتەوە بۆ گوندی (ئالێکساندرۆڤسکی) وەڕێ کەوتن و لەوێ بوونە ڕەنجبەر، لەسەرەك کەیف خۆشی و لەلایەکیترەوە دڵ گیر، چونکە کۆلاکی ڕوسەکان زۆر دڵ ڕەقانە مامەلەیان لەگەڵ ڕەنجدەرەکان دەکرد..

تەنیا لەسەر پنجە گیاو دەغڵ بەزمیان پێ دەکردن و تا ڕادەوەستان شلم کوتیان دەکردن (عەرەب) لەبارەی ئەو (ماتڤێ) ئاغایەی کەبەزمی پێکردوون دەگێڕێتەوە.. «خوێنی خەڵکی هەژاری فڕ دەکردو دەیچەوساندنەوە لەو کاتەدا مردن زۆر ئاسایی بوو گەلێك کەسیش لەژێر لێدان و کوتانیان لەپیاوەتی کەوتبوو، یا توانای کاری نەمابوو. ئەوەندە دڵ ڕەقانە خەڵکی بێدەرەتانیان ئازار دەدا باسی ناکرێت!! وەك دەگێڕنەوە ئەو (ماتڤێ) یە کابرایەکی گاوانی کاسبی ڕوسی لە (کاغدەگان) بەزیندوەتی چاوان لەتەندورێ خستبوو و سووتاندبووی»[4].

(عەرەب شەمۆ) کوڕی کەژو کێوو دێیەکانی ئەو دەڤـەرانـە بوو، کە تروسکـایی لەتیرۆژی (کارو نان) دەبینی. خاوەنی سەلیقـەیـەکی چاك و زمـان زانێکی لێهاتوو بوو.. بەڵێ ژیان وای گەرەکەو بەئاسایی خۆی بەڕێوە دەڕوات شەوانی گوێ ئاگردان و ڕۆژە درێژەکانی بەر مالاّت ئەوەندەیتر بیرو مێشکی (عەرەب) یان ئاو دەداو بەرەبەرەش هەراش دەبوو. کاری نان و سك سانا نییـە، بەلاّم چی لەگـەڵ نەبـوونی دەکرێت، ئەم ماڵە کوردە دەربەدەرو هەژارەش بەوە ڕازیبوون بەگاوانیو شوانی بەڕێوە بچن. (عەرەب) دەگێڕێتەوە «هەرکە لەگەڵ بەیـانیـان مەڕوماڵاتمان دەردەکرد، لەبەر دەرگاکانمان دەنـوّڕیو چاومـان چڕ دەکـردەوە، تا بزانـین کەسێك لەئافرەت وخاوەن ماڵەکان بەزەییان پێمان نایێتەوە، تیکە نانێکمـان بدەنێ. کەزۆر جاریش بەپارانەوە هاوارمان دەکرد لەڕاهی خودا پارووە نانێکمان بدەنێ[٥]». هێ.. هێ خزمینە بەر دەری سەدان ماڵ و دەولەتی گرتووە تا هیچ نەبێت، ڕۆژیتر لەپەساری زنارێك وکاولە خانووێك ڕەق نەبێتەوە بێئەوەی کەس هەست بەنوزەی بکات... ئەو دەرگـاو دەرگـا گەڕاوەو دەستی لەگـەروی هەموو قەمتـەرەیـەك گیرکردووە... ئێخوایەو یەکێك سکیبەم زارۆیـە بسـووتێو بەرەنجبەری رایگرێت. ئەمجارەش سکی برسی لەشەقەی باڵی دەداو لەبەردەری کابرایەکی کوێخاو دەولەتی ئۆقرە دەگرێت و کابرا پێی دەڵێت «تۆ زارۆیت، هێشتا هەراش نەبوویت، ئەو نانەی زستانێ بەتۆی دەدەین، بەقەدەری کارەکەت نابێ، بڕۆ باوە بڕۆ شەرت لەخێرت زیاترە[٦]».

«هاوارتە لەمن هەیش»، سەرباری ئەوەی بە نان و سك دەیگـرێت و کورە بەلەنگازو ساواو دەست و قاچ باریـك و هێـزلێبراوەکانی کوردەواری بە هەموو شتێك ڕازییە، کابرای خاوەن ماڵیش بە توورەییەوە پێی دەڵێت «کوڕۆ بەو مەرجە تۆ دەگرم، هیچ هەقێکت نادەمێ تەنیا بە نان و سك بەخێوت دەکەم[٧]». عەرەبی منداڵ و هەژار ئەگـەر هەرچی هاتبێتە پێشێ لێی نەپرینگاوەتەوە تەنیا ئابڕو نەبێت... ئەمجارەش لەم ماڵە دەولەمەندە کوڕی کابرا بە ناچارییەوە دزی پێدەکات و ئەگەر نا هەرەشەی دەرکردنی لێدەکات... ئای ناخۆشە بکەویتە سەر دوو ڕیانێك و هەردووکشیان بەرەو ڕەوەزی هەزار بە هەزارت ببەن. کوڕی (ماتفێ) ئاغاش، ئاغایەکی تری (عەرەب) بوو چاوی لێسوور دەکردەوە کە هێلکەو ئاردو ڕۆنی بۆ بدزێ.. ئای لەڕۆژگار کوڕی ئاغا لە ماڵی باوکی دزی پێ دەکـات... عەرەبی برسیو بێتـاوان هەر بۆی دەبێت و کوردواتەنی «نسکۆ شانی گرتووە..!!». ئەمجارەشیان کار ئاشکـرا دەبێت و لەبـەر قەمتـەرەی حەوشـە ئاغا دەیگـرێت و دەردەسـەری پێدەکـات.. بەلاّم عەرەبی ڕاستگۆو برسی چی دیوە ئاوەها قسەکە دەگێڕێتەوە. بۆیە کابـراش دوای بەزم پێکـردنی، تا شەرتـەکەی تەواو دەبێت لای خۆیی دەهێلێتەوە.

هەر بەرێکـەوتیش مامـۆستـایـەکی ئافـرەت لە گوندەکەیان لە ڕاستی (عەرەب) دێت و بۆ قوتابخانەی دەبات و تا بەردەستیان بکات. (عەرەب)یش تامەزرۆی ئەو ژینە دەبێت و هەرلایَ ئەو ئافرەتە مامۆستایە دەست بە خوێندن دەکات.. سەرباری ئیشی زۆری قوتابخانەو بە سەروبـەر داهـاتنی مامـۆستاو خزمەت کردنیان.. عەرەب هۆگـری ئەو پەیکەرو وێنانە بوو کە بە دیواری قوتـابخانەکەوە هەڵواسرابوون. سەرەتا لێیان دەترساو دوای بەرەبەرە لە گەڵیان ڕاهات.

دیـارە لێرەش لەنێـو منـداڵە دەولەمەندەکان بە چاوی (بـاوك کوشتـە) سەیـریان کردووە، پێیان ڕەوا نەدیـووە دەگـەڵیـان بخـوێنێت و زۆر ئازاریـان داوە دەگێڕێتەوە «هەر چەندە جلەکانم پاك و نوێ بوون، بەلاّم منـداڵی ڕوسـەکان وەکو جاران ئاسا بێزیان نەدەهات لەگـەڵم لەسەر تەختێك دانیشن و دەیانووت... هەی.. هەی عەرەبی بۆگەن و شوان و گۆلکەوان لەتەنیشتمان دانـیشێ. جوانـە، ئێـمـە لەتـەنیشت گۆلکـەوانـان دانـانیشـین[٨]». مامـۆستـاکەش بە ناچاریەوە بەتەنیا لەسـەر تەختێکی دادەنـا.. چۆن ڕقیـان بەرامبەر ئەو

خەلکە هەلناستێت کە بەردەوام لەبەر کارو نەبوونی بواری خوێندنیان بۆ هەلناکەوێت، وەکو عەرەب شامیلۆف لەم بارەوە «لەمەر نوتەکە چاوی نەخوێندەواری دەلێت «من تاقە خوێندەوار بووم لەناو کوردەکانی پشت قەفقاس دا... [9]».

کە شەری جیهانی یەکەمیش هەلیاسا، عەرەب شامیلۆف بەرەو شار وەردەچەرخێ‌و بۆ (قارسێ) وەرێ دەکەوێت. کورە گوندی نامۆکە لەگەل کاروانچیان هەی پێ‌ی لێ‌دەکات. هیوایەکی گەورەشی لە دلابوو، بەلام چاوێکی هەر لای دایك و باوکە هەژارەکەی بوو... لەشاریش ژیانی دژوارو کاری وەدەست نەدەکەوت. لە خانێك دا لەبری نووستن تەوێلەی هێستری خاوێن دەکردەوە. هەر ئەو کاتە بەرەو کۆنە دێی (ئالێکساندرۆفسکی) ڤەدەگەرێ، چونکە لەوێ کارگەی (خەلوز) کرابۆوە. ئێ خوایە کارێکی وەچەنگ بکەوێت. تازە شەر دەستی پێکرد بوو.. عەرەب هەر لە دێ‌کاری دەکردو فێری ئەم کارەش بوو. لەپایزی سالی ١٩١٤ ئەو کاتەی سەربازی قازاخی لەو دەڤەرەی کە کارگەی خەلوزی لێبوو، هێور دەبنەوەو دۆستایەتیان لەگەل پەیدا دەکات و سەرنجیان رادەکێشێت، هەر کە هەست دەکەن عەرەب زمانی کوردی‌و تورکی‌و ئەرمەنی‌و رۆمی‌و روسی دەزانێت، کاکە پاروی دەکەوێتە رۆن و دەبێتە وەرگێر. دوای ئەوەش لەترسی کوشتن بە تەنیا زنارو زۆزان و هەلەت و کێوەکان دەبرێ‌و بەرەو گوندی (قزنە فەرێ) دەگەرێتەوە. لەمالی پوری دەمێنێتەوەو لەوێ تەماس لەگەل سەربازی روسەکان لەگوندی (ساریبلاخێ) دەگرێت و لەگەلیان دەبێتە وەرگێر. هەر لەوێش ئەشقی (کارێ)ی کچە پوری دەبێت، تا سالی ١٩١٥ کاردەکات و پارەیەکی چاك پەیدا دەکات و بەدەمی باوکی (کارێ)ی وەدەکات. بەلام دیارە باوکی کارێ دەبێتە بەکرۆکەو ئاقیبەتیشی بە خراپی دەگەرێتەوەو بەرێکەوت کابرا (باوکی کارێ) بەدەستی عەرەب دێتە کوشتنێ. بۆیە بە ناچاریەوە نێرەش بەجێ دەهێلێت و بۆ مالی باوکی دەفرێتەوە.

لە (شاری قامیشێ) لەناو کارگەدا زۆر کرێکار دەناسێت و پەیوەندیان لەگەل پەیدادەکات و فێری وانەی خەبات و تێکۆشین دەبێت و لەگەلیان دەست بە خەبات دەکات و هەر لەم ناوچە دەگیرێت و زیندانی دەکرێت، بەلام دیارە باوەر ناکەن کە کورد ببێتە بولشەڤیك، بۆیە دوای لێدانێکی زۆر ئازاد دەکرێت. ئەمە سەرەتای گۆرانێکی گەورە بوو لە ژیانی عەرەبی شەمۆ... چونکە لێرە مێشکی کرایەوەو ئەو شتانەی دەیخوێندەوە رۆژانە لە دەردو کولی خۆی هەلیدەهێنجاو بەچاوی خۆی بینیبوونی. بۆیە زۆر دلێرانەتر پەرەی بەم سەرەتایە دەداو دوای بۆ ناوچە کوردنشینەکان دەگەرێتەوەو دەست بەخەبات و بلاوکردنەوەی بیرو باوەری پێشکەوتنخوازی دەکات، تا سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر.

لێپرسراوو ئاغاو کەدخوردی دێ‌و شارەکان پێیان سەیر بووە کە کوردەکانیش لەم رۆژانە بزافێکیان بە نێو کەوتبوو، جوولە جوولیان دەکرد... تەنیا وتیانە «بۆ کوردیش ئەم جۆرە قسانە دەزانن؟!!». عەرەب بەزاری خۆشی دەلێ کە پۆلیس بینیان من کوردم بۆ چوونیان وەها بوو کە کورد نابێتە بولشەڤیك، بۆیە بریاریان دا کە باشچاوەشە هەرە دواکەوتوەکان لێم بدەن» [10] دوای ئەوە لە گوندیش تەنگی پێ‌هەلدەچنن و سیخورو پیاوە ئامێر ئاساکانی دەولەتی قەیسەری بەدوای‌دا دەگەرێن. بەرەو کێو دەکەوێتە رێگاو ئەمجارە دەست بەشەری پارتیزانی دەکات و قولّ لە خەباتێکی سەخت تر هەلدەکات تا سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر بەردەوام دەبێت. لەو ماوەیەش کە بەکاری پارتیزانی نێردرا بوو چاوی بە (کیرۆف) سەرکردەی شۆرشی دەکەوێت و ناسیایی لەگەل پەیدا دەکات.. دەبێت (عەرەبی شەمۆ) ئەم هەموو بینەو بەردەی بۆچی بوو بێت؟! با خۆی بێتە گۆ.. «لە تەمەنی دوانزە.. سێزدە سالی‌دا کە هەندێکم خوێندو فامم کرد، دیم هەموو میللەتان بەهەقی خۆیان

گەیشتوون، تەنیا کوردنەبێ، هەژارو بێچارە ماوەتەوە، پێم وابوو وە ئێستاش پێم وایە بیرو باوەڕی کۆمۆنیزمی چاکترین ڕێگایە بۆ ڕزگار بوونی نەتەوەکەم، بۆیە ئەو ڕێگەیەم گرت[11]».

لە ساڵی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٤ لە مۆسکۆ خوێندویەتی‌و پاشان لە ساڵی ١٩٢٤ بۆ یەریڤان گەڕاوەتەوەو لەساڵی ١٩٣٢ بۆ لینینگراد چووەو لە بەشی دکتۆرای (ئامۆژگای مێـژووی ئەکـادیمیـەی زانستی سۆڤیـەتی) بووەتـە قوتـابی.. ساڵی ١٩٣٧ کاتی پێشکـەش کردنی نامەی دکتـۆراکـەی بەنـاهـەق و لەخت وخـۆڕا بە تاوانی «سـەردەمی پاراستنی تاك ڕەوی» لە یەکێتی سۆڤیەت ڕەوانەی سیبریا دەکرێت و (٢٠) ساڵی ڕەبەق، تا ساڵی ١٩٥٧ تەمـەنـی لەوێ بەسـەر دەبـات.. ئەو کاتـە بەشـداری دروست کردنی هەمـوو هێڵە ئاسنینەکانی سیبریا دەکات. لەساڵی ١٩٤٦ لەسیبریا ژن دەهێنێت و هەر لەوێ سێ کچی دەبێت (ڤـێرا) ١٩٤٦ و (ئاسێ) ١٩٥٢و (زینێ) ١٩٥٤.

د. کەمال مەزهەر نووسیویە «چیرۆك نووسێکە کە تا ئێستـا ئەدەبی کوردی هاوچـەرخ وێنـەی بەخـۆوە نەدیتـووە، هەروەهـا تاکە چیرۆك نووسی کوردیشە کە گەیشتۆتە ئاستی ئەدەبی جیهانی. کارەکانی بۆ زمانی سۆڤیـەتی‌و ئەوروپی وەرگـێڕدراون و بەسەدان هەزار دانەشی لێ چاپ کراوە[12]».

عەرەبی شەمـۆ چەند جار خەڵاتی بەرکەوتووە، لەسـاڵی ١٩٧٧دا ئاهـەنگێکی ڕێـز لێنـانی گەورەی بەبۆنەی لەدایك بوونی هەشتایەمین ساڵەی بۆ گێڕدرا... پێش ئەوەش کۆبوونەی یۆبیلی ٧٥ ساڵەی لەدایك بوونی بۆکـراوە.. عەرەبی شامیلۆف «نـووسـەرو زانـایـەکی بەنـاوبانگەو یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئەدەبی کوردی سۆڤیەتی، کابرایەکی کۆمەڵایەتی بە بڕشت و ئەندامی پارتی کۆمـۆنیستی سۆڤیـەتی بووەو لە ساڵی ١٩١٨ ڕا[13]». شەمۆ لەلایەن دەوڵەتەوە ڕیزێکی زۆری لێنراوە، هەر زوو لینـین دیـویەتی‌و لەبارەی کوردەوە گفتوگۆی لەگەڵ کردووە. شامۆ تاقە کوردە کە لە کۆنگرەی سێیەمی (کـۆمێنتـرن) بەشـدار بووە[14].. بەڵام سەد حەیف و مەخـابن ساڵی ١٩٧٨ لە کاروانـە سەختـەکەی ژیان، کۆتـری مرازی باڵی ئارام لێك دەداو بۆ بارەگای مردن دەفڕێت... هەتا هەتایە بەنەمری دەمێنێتەوە.

### ★ بەرهەم و کارە زانستیەکانی عەرەبی شەمۆ ★

ئەم بەرهەمە ئەدەبیانەی لەخوارەوە ناویان ڕست دەکرێت بەزمانی کوردی نووسیویەتی‌و بۆ زۆر زمانی ڕوسی‌و گورجی‌و ئەرمـەنی‌و ئاسـوری‌و ئازربـایجانی‌و فەرەنسی‌و ئەڵمانی‌و ئینگلیزی‌و عەرەبی وەرگێڕدراون.

١ـ شڤانی کورد ـ ١٩٣٠، ڕۆمانێکی کورتە ساڵی ١٩٦٩ بۆ ڕوسی وەرگێڕراوەو سەد هەزار دانەی لێ چاپ کراوە. ساڵی ١٩٣١ چاك کراوەو ساڵی ١٩٥٧ کراوە بە گورجی‌و بۆ ئەڵمانی‌و فەرەنسی‌و ئەرمەنیش وەرگێڕاوە.

٢ـ ڕەبەن ـ ١٩٣٠، چیرۆکێکی شانۆیە.

٣ـ کوردی ئەلەگەز ـ ١٩٣٦

٤ـ بەر بانگ ـ ١٩٥٧

٥ـ ژینـا بەختەوەر ـ ١٩٥٩ بۆ ڕوسی وەرگێڕدراوەو سێ جار چاپ کراوە (٣٠٠) لاپەڕەیە لە ساڵەکانی ١٩٦٥و ١٩٧١و ١٩٧٤دا. (٧٥) هەزار دانەی لێ چاپ کراوە.

٦ـ کوردی ئەرمەنستان ـ ١٩٦١، سیناریۆ بۆ سینەما.

٧ـ قەڵای دمدم ـ ١٩٦١، ڕۆمانێکی مێژوویە، لەساڵی ١٩٦٩ کراوە بەڕوسی‌و (٣٠) هەزار دانـەی لێ چاپ کراوەو لای خۆشمـان مامـۆستای هێژا شکور مستەفا کردویـە بە کرمـانجی خواروو کۆڕی زانیـاری کورد بەچاپی گەیاندووە.

٨ـ حەکایەتی خەڵکی کورد ـ ١٩٦٧.

٩ـ کۆکراوەی بەرهەمەکانی عەرەبی شەمۆ ـ ١٩٦٩.

١٠ـ لە بابـەت مەسـەلەی دەرەبـەگـایـەتی لەنـاو کوردان[15] کـۆکـراوەکـانی «مەسەلەی مێژووی کۆمەڵی پێش سەرمـایـەداری»، لینینگـراد، ١٩٣٤، ژمـارە (٩ـ١٠)، ل ١١١ـ١٣٤.

ئەم کتێبە ساڵی ١٩٣٦ لەیەریڤان بەزمانی ڕوسی چاپ کراوە.

١١ـ چەند د استانێکی میللی کوردی ـ ١٩٧٢، بە ڕووسی دایناوە، (٣٠٠) هەزار دانەی لێ چاپ کراوە، بۆ منداڵانە.

١٢ـ ژیانی لینین ـ ١٩٣٠، دوو هەزار دانەی لێ چاپ کراوە.

١٣ـ مێژووی شۆڕشی ئۆکتۆبەر ـ ١٩٣٠.

١٤ـ کۆڵخۆزو کەلکی بۆ جووتیاران ـ ١٩٣٠، دوو هەزار دانەی لێ چاپ کراوە.

١٥ـ هاڵاو[١٦] ـ ڕۆمان.

★ وتارو نووسینە زانستیەکانی ★

وەکو دەزانرێت عەرەبی شەمۆ گەڵێك وتاری زانستی بڵاوکردۆتەوەو ئەمڕۆ سەرچاوەیەکی چاکی لێکۆڵینەوەی زانستین لەخوارەوە ئەوەی دەستمان پێراگەیشتبێ ڕستی دەکەین.

١ـ لەناو کوردان ـ لەنامەی کوردێکی حیزبی، ڕۆژنامەی (زاریا ڤۆستکا ـ گزنگی خۆرهەڵات) تفلیس، ١٧ی نیسانی ١٩٢٤.

٢ـ لەناو یەزیدیان ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١٤ی حوزەیرانی ١٩٢٤، ژمارە (٦٠٢)، لاپەڕە (٣). لەبارەی پێداویستی هەڵسان بەهەڵمەتێکی ڕێکخراوەیی و پەروەردەیی لەنێو یەزیدیەکان بۆ بەرزکردنەوەی ڕادەی ڕۆشنبیریو لەنێوبردنی نەخوێندەواریدا

٣ـ کاری حیزبی لەناو یەزیدیان ـ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ موستەشاری لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان عەرەبی شەمۆ، (گزنگی خۆرهەڵات) ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٢٤.

٤ـ دێی یەزیدیان لە ئەرمەنستان ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ٨ی نیسانی ١٩٢٥، ژمارە (٨٤٥)، ل ٤. (جێگرکردنی یەزیدیەکان لە ناوبردنی نەخوێندەواری ڕزگارکردنی ئافرەتی یەزیدی).

٥ـ دێی یەزیدی ـ «ڕاپۆرت بۆ پلینۆمی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمینیا»، ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ٢١ی حوزەیرانی ١٩٢٥، ژمارە (٩٠٦)، ل ٢. دەربارەی پێداویستی بەرزکردنەوەی ڕادەی ڕۆشنبیری لای کوردە یەزیدیەکان.

٦ـ دێی کوردی یەزیدی ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١٩ی تەموزی ١٩٢٥، ژمارە (٩٣٠)، ل ٤.

٧ـ لە گەشتی کوردستان ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١٢ی ئەیلولی ١٩٢٥، ژمارە (٩٧٥)، ل ٣. مەبەستی لەناوچە کوردی‌یەکانی (ئازربایجان و لاچین و کەلبەجار)ە کەلەوێ کوردستانی پێدەڵێن.

٨ـ یەزیدی‌یە کۆچەرەکان ـ نامەیەك لە ئەرمینیاوە، ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات) ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٦، ژمارە )١٠٧٨)، ل ٣.

٩ـ ئەنجامی کۆنگرەی کوردی ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١١ی حوزەیرانی ١٩٢٦، ژمارە (١١٩٨)، ل ٢. دەربارەی کۆنگرەی کوردەکانی ئەرمەنستان کە لەوساڵەدا بەسترا بۆ لێدوان لەچاك کردنی باری کشتوکاڵ و ژیانی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئەلفباو نووسینی کوردی لەناو کوردەکان دا.

١٠ـ بێلاقی ئەگماگانی (هاوینەهەواری ئەگماگان) ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١٦ی مایسی ١٩٢٦.

١١ـ داشناك و کوردو بەریتانیا ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١٠ی تەموزی ١٩٢٨، ژمارە (٥٥٣)، ل ٤. دەربارەی پێداویستی هەڵسان بەهەڵمەتێکی پەروەردەیی لەنێو کوردەکان بەتایبەت ئافرەتی کوردو لەناوبردنی نەخوێندەواری.

١٢ـ ئەلفبای کوردی بەلاتینی ـ ڕۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ٢١ی تەموزی ١٩٢٨، ژمارە (١٦٨)، (١٨٣٤)، ل ٢.

١٣ـ نووسین و ئەدەبی کوردی ـ ڕۆژنامەی (گزنگی

خۆرهەڵات)، بەزمانی ئەرمەنی.
١٤ـ ئەلفبای کوردی تازە ـ بەزمانی ئەرمەنی، یەریڤان، ١٩٢٩.
١٥ـ کوردی قەفقاس ـ گۆڤاری (شۆرش و خوێندەواری)، مۆسکۆ، ١٩٣٠، ژمارە (١٥ـ١٦)، ل ٨٦ـ٨٩. لەبارەی کورد لە روسیای قەیسەری‌و دامەزراندنی کۆمەڵگای کوردی هاوچەرخ پاش شۆرشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی.
١٦ـ لێکۆڵینەوە لەخوێندەواری لەناو کوردانا ـ رۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ١١ی ئابی ١٩٣٣، ژمارە (١٤٨)، ل ٤. دەربارەی گەشتی خوێندەواری‌و لێکۆڵینەوەی ئامۆژگای نەتەوەکان بەسەرۆکایەتی عەرەبی شەمۆ، لەناوچە کوردیەکانی ئازربایجان و گورجستان و ئەرمەنستان بۆگەیشتن بەئامانجی یەکخستنی کورد لە وڵاتی سۆڤیەت دا.
١٧ـ لەبابەت ئیزافەتەوە لەزمانی کوردی ـ گۆڤاری (شۆرش و نووسین)، ژمارە (١)، ساڵی ١٩٣٣، ل ٥١ـ٥٦. بەهاوکاری لەگەڵ (کوردۆییڤ و تسووکەرمان نووسراوەتەوە).
١٨ـ لەبابەت مەسەلەی تیپی دەنگداری «ا» لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (شۆرش و نووسین)، مۆسکۆ ـ لینینگراد، بەشی (١)، ١٩٣٣، ل ١٧٩ـ١٨٠. بەهاوکاری (نووسکەرمان نووسراوەتەوە).
١٩ـ مەسەلەی نێرو مێ لەزمانی کوردیدا ـ گۆڤاری (شۆرش و نووسین)، بەرگی (١)، مۆسکۆ ـ لینینگراد، ١٩٣٣، ل ١٦٠ـ١٧٨.
٢٠ـ ئیملای کوردی‌و ئەدەب ـ بەزمانی ئەرمەنی، یەریڤان، ١٩٢٩.
٢١ـ دەربارەی کۆنگرەی لێکۆڵینەوەی کوردەکان ـ گۆڤاری (مێژوی کۆمەلگای پێش سەرمایەداری)، لینینگراد، ١٩٣٤، ژمارە (٩ـ١٠)، ل ١٩٣ـ١٩٤. (بەهاریکاری ڤیلچیفسکی) نووسراوەتەوە.
٢٢ـ دەروێشی کورد ـ گۆڤاری (ئیتینست ـ مۆسکۆ) کانوونی یەکەمی ١٩٣٠، ژمارە (٥٩)، ل ٤١ـ٤٦.
٢٣ـ لەنێو یەزیدیەکان دا ـ (ئەرمینیا ـ لینینکاسکی)، رۆژنامەی (گزنگی خۆرهەڵات)، ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦، ژمارە (١٠٨٣). ل ٤.

## سەرچاوەو پەراوێز

١ـ عەرەبی شەمۆ، بەربانگ، ١٩٥٨، یەریڤان، ل ١١٤ـ١١٧. ئەم رۆمانە بەکوردی بەپیتی سلاڤی چاپ کراوە.. باسی ژیانی خۆی دەکات.
٢ـ هەمان سەرچاوە، ل ٣.
٣ـ هەمان سەرچاوە، ل ٥.
٤ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٠.
٥ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٦.
٦ـ هەمان سەرچاوە، ل ٢١.
٧ـ هەمان سەرچاوە.
٨ـ هەمان سەرچاوە، ل ٣٨.
٩ـ د. کەمال مەزهەر، کام رێگا، گۆڤاری بەیان، ژ (٨)، ١٩٧٢ ل ٨.
١٠ آ. شامیلۆف، حول مسألة الاقطاع بين الاكراد، ترجمة ومقدمة د. كمال مظهر أحمد الطبعة الثانية، الحوادث، بغداد، ١٩٨٤. ل ٢٢.
١١ـ د. مارف خەزنەدار، عەرەبی شەمۆ، رۆژی کوردستان، ژ (٦)، ساڵی (٢) ١٩٧٣ ل ٣٥.
١٢ـ آ. شامیلوف، حول مسألة الاقطاع بين الاكراد، ل ٢٦.
١٣ـ هەمان سەرچاوە، ل ٢٦.
١٤ـ د. کەمال مەزهەر، کام رێگا، گۆڤاری (بەیان)، ل ٩.
١٥ـ د. کەمال مەزهەر وتیەتی «عەرەب شەمۆ خاوەن یەکەم کتێبی زانستی‌یە لەبارەی دەرەبەگایەتی‌یەوە لەناو کورددا... لەم کتێبەدا شامۆ وەك زانایەکی بەتوانا خۆیپیشان داوەو گەلێك رووی ئاڵۆزی ئەم باسە گرنگەی زانایانە شیکردوتەوەی بروانە گۆڤاری بەیان ژمارە (٨)، ل ٨.

١٦ـ بۆ زیاتـر ڕوون کردنـەوەی ئەم ڕۆمانە وا چاکە نامەکەی عەرەبی شەمۆ وەکو خۆی ڕێنوس بکرێتەوە کە بۆ د. مارف خەزنـەداری ناردووەو ئەویش لە گۆڤاری ڕۆژی کوردســتــان لە ژمــارە (٦)ی ١٩٧٣ بڵاوی‌کـردۆتەوە.. چونکە ئەم نامەیە تا ڕادەیەکی زۆر ناوەڕۆکی عەرەبی شەمۆو وەدیار دێخێت. ئەمەش دەقی نامــەکی‌یــە «من هیــچ شتێـك لەتـۆ ناشــارمــەوە، تۆ خۆشەویستی هەمووانی مارفی ئازیز. ئێستاکە ڕۆمانێکی تازەم لەژێر چاپ دایە، ناوم ناوە «هالاو» لەڕۆمانەکەدا ئەوە دەگـێڕمەوە کە چۆن شۆڕشی ئۆکتۆبەر شەرەفێکی گەورەی بەزەوی ئێمــە بەخشی، کەس ئەو شەرەفــەی وەرنــەگرتووە، کە نووسەرانی ڕووس ناوی ڕۆمانەکەی منیان بیست، ووتیان ئێمە بۆ ئەوە نەچووین، کەشۆڕشی ئۆکتــۆبــەر بکەین بە هالاوێك هەموو ڕووی زەوی پێ ڕووناك بکەینەوە.. لەم ڕۆمانەدا ئەوە دەنووسم کە چۆن ئەم هالاوە هەمــوو شاخــە سەختەکانی بڕیو گەیشتە کوردستان و چۆن ئەحمەدی هەریری نامەی بۆ لینین نووسی‌و چۆن لیـنــین وەڵامی دایــەوە. وەچــۆن کورد ڕاپەڕی‌و دەستی‌کرد بە شۆڕش. شۆڕشی یەکەم لەئێران هەڵگیرسا، فەرماندەی ئەم ڕاپەڕینە سمایل ئاغای سمکۆ بوو، داوای سەربەخۆیی کوردستانی لەشای ئێران کرد، بەڵام شای ئێران کەوتــە جەنـگــەوە لە دژی خەڵکـی کوردستان. ئەم ڕاپەڕینە ماوەیێکی زۆر بەردەوام بوو. بەڵام لە دووایی‌دا شای ئێران ڕاپەڕینەکەی لەناو خوێنی کوردو سمکۆدا خنکاند.

لەپاش ئەمە شێخ سەعید دەستی‌کرد بەشۆڕش لە دژی تورك، لەشکری شێخ سەعید بێ ژماربوو، جگە لەکـورد ئەرمەنی‌و ئاسووریشی تێدابوو، سوپای شێخ سەعید وان و مووش و دەشت و دۆڵەکانی ئەلاشکرت و مەلاز گەردی گرت، چووە ناو بیـدلیســەوە، تورکـەکان کەوتنــە مەتـرسی‌یـەوە بەتــایبــەتی کە شێـخ سەعیـد لەئـەنـەدۆڵ نزیـك بووەوە، لەو کاتەدا سەرۆکی تورك

مستەفا کەمال پاشا کەوتە خۆ ویستی بەفێڵ چارەیێك بدۆزێتەوە نامەیێکی بۆ شێخ سەعید نووسی:

خۆشەویستم شێخ سەعید:

«ئێوە لەسەر هەقن، ڕاستە دەبێ کورد ئازادی‌ی هەبێ، بەڵام تکات لێدەکەم کە تەنیا مۆڵەتی دوو هەفتەم بدەی، بۆ ئەوەی بیربکەینەوە چۆن ئەم ئازادی‌یە بۆ کورد جێبەجێبکەین». شێخ سەعید باوەڕی بەمەکرد، بۆیە ڕاپــەڕینــەکەی وەستاند، لەم ماوەیەدا مستەفا کەمال لەشکـرێکی گەورەی ئامادەکردو بەیانیێك لەپڕ بەسەر ناوچەکانی کوردستانی تورکیای دادا، تەنیا لەو کاتەدا شێخ سەعید لەفێڵی تورك گەیشت، بەرەڵستی‌کرد بەڵام بێســـوود بو. بەم جۆرە ئەم شۆڕشـــەش بەئــامــانــج نەگـەیشت، سەرۆکـەکـانی خنکێنران، گەلێ بنەماڵەی کورد ئاوارەکران و زمانی کوردیش قەدەغەکرا.

بەڵام ئەم هالاوە نەکـوژایــەوە ڕووناکی گەیشتە کوردستــانی خواروو، لەساڵی ١٩٢٠دا شێخ مەحمود سەرۆکایەتی شۆڕشی کرد، لەپاش ئەویش هەر بەردەوام بوو، ڕۆمانی هالاو ئەم ساڵ دەکەوێتە دەستی خوێندەوارانی‌یەوە.

١٩ی ئاغستۆسی ١٩٧٣.

هەروەهــا د. مارف لەهەمان سەرچاوە دەبێژێت «دەبێ خەریکی کارێکی‌تر نەبێ!! بێگومان خەریکە، با تەمــەنیشی بۆهــەشتــا بڕوا، وەکـو خۆی لەنامەکەی‌دا دەنــووسێ... ئێستاکە خەریکی نووسینەوەی ڕۆمانێکە ناوی «دێی ئێمە»یە.».

١٧ـ نجاة گەردی (عەرەب شامیلۆف ١٨٩٧ـ١٩٧٨)، بەیان ژمارە (١٠٥)، ئاداری ١٩٨٥. ل ٢٢ـ٢٥.

١٨ـ عەرەبی شەمۆ، شڤانی کورد، وەرگێڕانی لەفەرەنسی بۆ کوردی نورەدین زازا... بەپیتی لاتینی‌یــە. ئەمەش وەکـو بەربــانــگ باسی ژیانی خۆی دەکات. ئەم کتێبە کراوەتە ڕوسی‌و دوایی فەرەنسی.





# کاك حوسێنی جوانەمەرگ

**لەتیف بەرزنجی**

کاك حوسێنی عەلی خورشید ئاغای دزەیی لەدەوروبەری ساڵانی ١٩١٩دا لەدێی «قەپڵان»ی ناوچەی کەندیناوەی دەشتی هەولێر هاتۆتە دونیاوە، لەبنەماڵەیەکی خانەدانی خێڵی دزەیی بووە، ئەو بنەماڵە بە بنەماڵەی «باینز» ناوبانگی یان رۆیشتووە، عەلی ئاغای باوکی کاك حوسێن یەکێك بووە لەسەرۆکە ناودارو لێوەشاوەکانی ئەو خێڵە.

کاك حوسێن چەند ساڵێك لەحوجرەو مەدرەسەی فەقێیان و، چەند ساڵێکیش خوێندنی سەرەتایی لە گوندی «قازیخانە»ی حوسێن ئاغای حاجی مەلا تەواو کردووە، کەئەو سەردەمە قوتابخانە لەدێهاتەکان زۆر کەم بووە، لەبەر ئەوەی حسێن ئاغا نائیب بووە بۆیە زوو قوتابخانەی هێناوەتە ئاوایی «قازیخانە».

کاك حوسێن هەر لەمنداڵیەوە کوڕێکی وریاو گورج و گۆڵ و قۆز بووە، کەگەیشتۆتە هەرەتی لاویش گەنجێکی هەتا بڵێی شۆخ و کەڵەگەت و سوورو سپیو چاوکاڵی لێ پەیدا بووە، زۆری پێناچێ کاك حسێن دەبێتە لاوێکی هەڵکەوتوو ناودارو شۆرەسوارو، راوچی ناوچەی قەراج و کەندیناوەو بناری شاخی «قەرەچووغ» لەدەشتی دزەیی.

کاك حوسێن زۆر دەنگی خۆش بوو، بەتایبەتی لە حەیران و لاوك دا، دەتوانم بڵێم لەسەردەمی خۆیدا مامۆستای حەیران بووە، راستە پێش خۆی جەمیل ئاغای برا گەورەی تاقە سواری مەیدانی حەیران بێژیی بووە، بەلام کاك حوسێن هەمیشە کاکی خۆی بەمامۆستای خۆی داناوە لەبواری حەیران گوتن دا.

ئەو دەنگ و ئاوازە بەسۆزەی کاك حوسێن حەیرانی پێ دەگوت بەگێرانەوەی گەلێك لە پیاوە ریش سپیو پیرەکانی ئەوساو ئێستاش هاوتای کەم بووە لەدەشتی هەولێر، خۆیشی نەك هەر لەکۆری دیوەخانی خزم و کەس و خێڵی دزەیی بەڵکو بگرە لەناو رەنجبەرو جووتیاران دا زیاتر بەشداری ئاهەنگ و شایی و زەماوەندو رەشبەڵەك و گەرەلاوژەکانی دەکردن، بەو دەنگ و ئاوازو حەیرانە جوانانەی کۆرەکانی گەرم و گورتر دەکردن.

ئەو حەیرانانەی کەکاك حوسێن دەیگوتن، یان ئەوەتا لەحەیران بێژە پیرەکانی پێش خۆی فێریان بوبوو، یان لەجەمیل ئاغای کاکی، زۆریشیانی لەدانانی خودی خۆی بووە. «لاوکیش» لەبەرئەوەی دەشتی دزەیی مەڵبەندی رەسەنی لاوك نییە بەڵکو سەرچاوەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەوبەری زێی بادینان، کاك حوسێن بەشی زۆری ئەو لاوکانەی لەو دوو لاوك بێژە بەناوبانگانە فێر بووە، «حەمەد مەندۆ»و «عەزیز ئاغا»، کەئەم دووە هەرچەندە خەڵکی دەشتی دزەیی بوون بەلام هەمیشە هاموشۆی لای سەرۆك خێڵەکانی ناوچەی بادینانیان کردووەو، هەرجارەی دەگەرانەوە بۆ ناوچەی دزەیی هەگبەی پڕ لەلاوکی تازە بابەتیان بۆ ئەم ناوچەیە دەهێنایەوەو، شەوان لە دیوەخانەکان دا هەڵیان

دەرشت.
بەداخەوە کاک حوسێن زوو ماڵ ئاوایی لەم دنیایەکرد، لە ٢١-٢٢/٧/١٩٧٢، کەتەمەنی تازە لەپەنجا ساڵی تێپەر دەبوو، بە نەخۆشی دڵ سەری نایەوە، خۆشبەختانە دوو دانە کاسێتی پڕ لەحەیران و هەندێ لاوکی لەپاش جێماوە کە لەچەند بۆنەیەکی تایبەتیدا تۆمار کراون، نزمی حەیران گوتنی کاک حوسێن نزمێکی تایبەتی بووە بەخۆی، بەر لەو نە جەمیل ئاغای کاکیو نەکەسیتریش ئەو نزمەیان نەگوتبوو، کاک فارسی برا بچووکی کە لە دەنگ خۆشەکانی دزەییە لەبواری حەیران گوتن دا تا رادەیەك نزمی کاک حوسێنی کاکی هەڵ گرتووە، ئێستاش جەمیل ئاغا کەتەمەنی ٨٠ ساڵێك ئەبێت و کاک فارسیش پەنجا ساڵێك ئەبێت، خوا تەمەنیان درێژتر بکات، جارجار کەهەستی غەریبییان دەبزوێت، حەیرانی بەسۆزو دڵ تەزێن دەڵێن، کەیادی رۆژانی رابوردووی کەندێناوەو دەشتی قەراجی ئەوسا دەکەنەوە.
خوێندەوارانی ئازیز:
وا دوو نموونە حەیرانی کاک «حوسێن» تان پێشکەش دەکەین کە لە دانانی خۆیەتی:

**حەیرانی یەکەم:**

ئەگەر مردم قەت مەرێن درەنگە؛ قەبرەکم لۆ لێدەن لەمەعبەینی سینگ و مەمکی نازدار حەیرانێ، لێمەدەن بەکورینگ و بێران، بیرازەی تەنگە.
ئەوجا ئەنگۆ لۆ من برێنە کیژۆڵەکانی مەمك نەهاتی، دەمەکێ بێنەوە سەرینگانم لۆم بگرێن بە ئاوازو دەنگە.

**حەیرانی دووەم:**

**شەحەل[1] بەمێوە:**

● گەلی براو برادەرینە، ئەنگۆ وەرن بەچاوێ من تەماشای بەژنەکێ باریك کەن کەوەتانێ لەگەر کۆمەڵەکی دەستە خوشکان دێتەوە لەسەر کانییەکەی «ژێر واوێ»، تیلاگەی خوارە دایمەل بەدایم زێدە لەهەموان حەمایلەی پێوە.
● ئەوجا ئەمن دوعایەکی دەکەم ئەوسارەکە بوارێ مارهبابی نازدار حەیرانەکەی خۆم بارکەن بێنەوە دەشتەکەی کاولە قەراجی لەکنمە بێخن مار بەمارێوە.



**خوێندەواری بەرێز:**

کاک حوسێن جگە لەوەی پیاوێکی قسەخۆش و حەیران زان و نووکتەچی بوو، زۆریش خۆشەویست بوو لەناو کۆمەلانی خەڵکی دەشتی دزەییدا، لەبەر ئەوەی زۆر لایەنگیری کۆمەلی هەژارو جوتیاران بوو هەمیشە پشتگیری ئەکردن، زۆر دۆستایەتی ئەو پیاوە نیشتمان پەروەرانەی ئەکرد کە خەریکی کوردایەتی بوون، بە تایبەتی کاک ئەحمەد حەمەدەمین ئاغای دوگرتکان و پارێزەری بەناوبانگ و خزمەتگوزار کاک عەونی یوسف و عەباسی مامەنداغای سەرکەپکان و کاکە زیادو بورهان عەزیزاغای چەمەدوبزو کۆمەڵێکی تریش لەو رۆڵە رەوشەن بیرانەی دەشتی هەولێرو شاری کۆیێ کە سەرکردایەتیو پێشرەوی کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکانی ئەوسایان دەکرد لەسەردەمی پاشایەتی عێراق دا.
زۆر بەداخەوە کاک حوسێن لەتەمەنی لاویدا ماڵاوایی یەکجاری لەگشت لایەك کرد هەموو هیواو ئاواتەکانی بردە ژێر خاك و خۆڵەوەو بەنائومێدی سەری نایەوەو هەواری لەسەر رێگەی کۆچ و کۆچبارانی دەشتی دزەیی گرت و لەگۆرستانی بەناوبانگ و پیرۆزی «پیرداود» حەسایەوە، ئەو گۆرستانەی کەلە رۆژی کۆچی دوایی کاک حوسێن بەخاك سپاردنی ئەو بۆ ناو کاروانی جوانەمەرگان و شەهیدان، ئەم چەند دێرەمان هەر لەو رۆژەداو لەو سەرگردو گۆرستانەدا بۆ داناوە.

**گردی پیرداود**

گردی پیرداود لانەی خامۆشان
جوانەمەرگانی کوردی قارەمان
سەنگەری لاوان جێی شەهیدانی
لەسەر ئەم خاکە بوونە قوربانی

**خوێندەوارانی بەرێز:**

لەبەرئەوەی دۆستایەتی زۆر خۆشم هەبوو لەگەڵ کاک حوسێنی رەحمەتیو زۆر شەوانی خۆشمان بردۆتە سەر لەگەڵ ئەم و کاک ئەحمەد حەمەدەمین و کاک عومەری



براىو كۆمەڵێكى تریش لەو دۆست و هاورێیانەى کەهەندێکیان ئێستا سەرگەردان و ئاوارەن و بەشێکی تریشیان گێژە لووکەو شاڵاوی مەرگی کاڵ و لافاوی رۆژگاری پڕ لە کارەسات راىماڵیون و بۆ ناو چاڵی نەمان.

جا کە ئەو جۆرە رۆژانەو ئەو براو رۆڵە دڵسۆزانە یاد ئەکەمەوە، حەیرانە بەسۆزو قسە خۆشەکانی کاك حوسێن و عەلی حەمەسەعیدو قوشەى فەقێ عەزیزو حەمەدبەگیم لەگوێدا ئەزرنگێتەوە، بۆیە لەکاتی نووسینی ئەم وتارەو یادکردنەوەى کاك حوسێن ئەو پیاوە ناسراوانەم بیر ئەکەوێتەوە کەماڵاوایی یەکجاریان لەهەموو لایەك کردووەو هەتا هەتایێ ناگەرێنەوە کەلەدواى ماندووبوونی رێگەو دەردەسەری ژیان بەکۆمەڵ شۆرەسواران لەم ئارامگایەدا جێگیربوون و هەواریان لەسەر رێگەى خێڵ و رێبواران گرتووە بۆ ئەوەی نەورۆزان بەگوڵاڵە سوورەى خوێناوی کەژو کێوەکان گۆرەکانیان برازێنەوە، کورگەل و لاوە رەوشەن بیرەکان گۆڕی گەرم و گوڕ بگێڕن و لەدەوری گۆڕی جوانەمەرگان بەشاییو زەماوەندو ئاهەنگ یادی سوپای خامۆشان بکرێتەوە.

جاهەر بەو بۆنەیەوە لەباسی گۆڕستان و جوانەمەرگ و شەهیدو ئەو جۆرە رووداوانەدا، دوو پارچە شیعرم هاتەوەیاد کە لەساڵانی ١٩٦٧ دامناون، یەکەمیان بەبۆنەى کۆچی دوایی رۆڵەى جوانەمەرگ کاك ئەحمەد رەشوانییەوە، هەر لەو هەڵبەستەدا داواە لەلاوان کردووە کەدرێغی نەکەن لەسەردان و چوونە سەرگۆڕی جوانەمەرگان، ئەمەش ئەو چەند دێرە شیعرەیە کە لەکتێبی فەرهەنگی هەڵبەست دا بڵاومان کردۆتەوە:

سوارێ لەسوپای کورد گەرایەوە
بەنائومێدی سەری نایەوە
نەورۆزان لاوان بێنە سەرێنی
کۆڕێ لەدەوری گۆڕی غەمگینی

پارچە شیعری دووەم بۆ جوانەمەرگی لاو کاك شێخ محەمەد مستەفای بەحرکەیی کە لەسەر کێل و گۆڕەکەى نووسراوە لەیەکێ لەگۆڕستانەکانی ناوشاری هەولێردا:

کۆڕێ ببەستن لای هەوارەکەم
بێشەى تەنهاییو هەڵبەندی ماتەم
ئاڵای رەش پۆشی رەشی گۆڕەکەم
ئەشەکێتەوە بەشەماڵی خەم
بەئاوازی خۆش بەهەڵبەستی جوان
سەڵاو بۆ گیانی پاکی خامۆشان

**خوێندەواری بەرێز:**

من زۆر حەز لەچوونە سەر گۆڕستان دەکەم بە تایبەتی چوونە سەر گۆڕی جوانەمەرگان، ئەوانەی بەنائومێدیو لەتەمەنی لاویدا سەریان ناوەتەوە، جارێك لەو جارانەو لەسەردانی ئەم گۆڕستانەدا کەوتمە ناو کەشتیی خەیاڵێکی قووڵەوەو لەسەر گۆڕی کاکم حوسێنی عەلی ئاغا ئەم چەند دێرە شیعرەم بۆ هات کەلێرەدا پێشکەشی ئەوان و ئێوەشی دەکەم:

لەناو ئەم گۆڕە گوێم لەحەیران بوو
ئاوازێکی خۆش تێکەڵ گریان بوو
بەلاوی رۆییم هیچ خۆشیم نەدی
سەرم نایەوە بە نائومێدی

جا لەکۆتایی ئەم ووتارەدا دەڵێم هەزاران سەڵاو بۆ گیانی پاکی کاك حوسێن و هەموو جوانەمەرگانی ئەم گەل و هۆزو وڵاتەبێ، بەتایبەتی ئەو رۆڵە ئاشق و جگەرسووتاوو شۆخانەی بەلاوی ماڵاوایی یەکجاریان کردوو ئەگەین بەهیواو ئاوات و لەو رێگایەدا خۆیان بەخت کردووەو بەنائومێدیو هەناسە ساردی سەریان ناوەتەوە.

کاك حوسێن چوار کوڕی لەدوا بەجێماون:
کاك محەمەد، سعدی، کاوە، ئاراس، خوا تەمەنیان درێژ کات، ئەو باوکە چاکەیان لەبیر نەکەن و لەخێرو خێرات بێبەشی نەکەن .

١ـ شەمەل: گوندێکە لەناوچەی کەندیناوە لەسەر رووباری زێی بچووك، موڵکی عەلی ئاغای باوکی بووە، کاك حوسێن ماوەیەك لەوێ کشت وکاڵی کردووە.

# ڕوانین

## ٧

● نەژاد عزیز سورمێ●

- ١ -

دۆزراوە ئارکیولۆژیەکانی ئەو چل پەنجا ساڵەی دوایی، پەردەی گومانیان لەسەر ئەوە لابردووە کە رەگەزێك لە رەگەزە پێشەنگەکانی ئادەمزاد لەو ناوچە شاخاویانەدا هەبووە کە دەکەوێتە رۆژهەلآت و باکووری رۆژهەلآتی ئەو سنوورە جوغرافیەی بە (عیراق) دەناسرێ.

ئەوەش سەبارەت بە کۆمەڵێك هۆی سرووشتیو ژیانیی کەوای لەم شوێنە کردووە دەورووبەرێکی لەبار بۆ بەردەوامی ژیانی ئەو ئادەمزادە برەخسێنێ..

دۆزراوەی پاشماوەکانی بەرهەمی شارستانیەتی دوای نیشتەجێ بوونیش هەر ئەوە دەچەسپێنن، بەتایبەتیش گوندە کشت و کاڵیەکان کە نیشانەی بەرەو پێشچوونێکی بەردەوامن.

بەم جۆرە دوای دۆزینەوەی مەعدەن و سەرهەڵدانی ئەو چاخەی کە بە چەرخی بەردی - مەعدەنیەوە ناسراوەکۆمەڵێك دەسکەوتی گرینگ هاتنە بەرێ مژدەی شارستانیەتێکی کامڵیان بەدواوە بوو، تا ئەوەی لە نیوەی دووەمی ٣٥٠٠ پ . ز نووسین لەلایەن سۆمەرییەکانەوە داهێنرا ئەم داهێنانەیش شۆرشێکی

لە ڕێرەوی ژیارو شارستانیەت دا بەرپا کرد کە ئێستاش لەگەڵ دا بێ هەر لەبرەودایەو لەبرەویش دا دەبێ..

هەر ئەوەندەش نا بەڵکو داهێنانی نووسین بوو بە هۆی تۆمار کردنی زۆربەی لایەنەکانی ژیانی ئەوان سەردەم و رۆژگارە دێرینانەی (کە دەگونجێ ئێستا خۆزگەیان بۆ بخوازین!) ئاسان نەبوو هیچیان لەبارەوە بزانین؛ بەرادەیەك ئەگەر لە تەمەنی مرۆڤ (هەمووی) وردبینەوە دەبینین لە ٩٥٪ی ژیانی بە کێویایەتیو چۆڵ پەرستییەوە بەرێ کردووە[١].

بۆیە زۆر نزیکە سەرەتا هەر یەك زمان بووبێ؛ دەمەو دەم، ئینجا لە قۆناغی دواتریدا هاتبێتە تۆمار کردن لە دوای ئەوەی کە نووسین داهێنرا..

بۆ وا نەبێ؟ ئەوەتا نووسەرانی دێرینی ئەوسا کە ئێمە بەهۆی پشکنینە ئارکیولۆژیەکانەوە تێکستە نووسراوەکانیانمان دەست کەوتوون، ئەوسا، لەوان زەمانە دێرینانەدا خۆیان بە میراتگری



→ a (ئا) → ئاو

→ gu (گو) → (کەنار) گوێ

→ utu (ئوتو) → هەتاو

→ Kalaga (کەڵەگا) → کەڵەگا

→ gudea (گودێئا)<br>(گوتی)

→ pa-bil-ga (پابیلگە)<br>(باپیرە)

→ Sag → (ساگ) → سەر

- وێنە 2 -

رابوردوویەکی پێشکەوتووترو کۆنینەتر دادەنێن:
«رابوردوویەك کە خێروبێر دنیای داگرتبوو و ئاشتی باڵی بەسەردا کێشابوو، ترس و خەم و کینە نەبوو، درندەی تێدا نەبوو.. ئەو رابوردووەی ئادەمیزاد بەیەك زمان بە (ئینلیل) یان دا هەڵدەگوت»[٢]

دیسان زمان چونکە بوونەوەرێکی زیندووە ئاشکرایە بەپێی باری دەوروبەرەوە دەگۆڕێت و گەشە دەکاو پێش دەکەوێ.. دکتۆر (جەمال رشید)یش لە کتێبەکەی (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری باشی بۆ چووە کە دەڵێ: «زمان هەبوونێکی زیندووە، دەگەشێت و دەگۆڕێت و پێش دەکەوێت بەپێی باری کات و شوێن و گۆڕینی شێوەی ژیانی مرۆڤ و تێکەڵاو بوونی نیشانەی ئەو گەشانەوەو گۆڕینەن بەچەند پلەیەکدا تێ دەپەڕن و بەسێ جۆر پەیدا دەبن:

١ـ لە سەرەتادا یا دەبێت ئەو شێوەیە زمانێکی سەربەخۆی هۆزێك بووبێت بە دوورکەوتنەوەی تیرەکانی ئەو هۆزەو تێکەڵاوبوونیان بە خێڵی میللەتانی دیدا شێوەکانی دیی ئەو زمانە پەیدا بووبێت و پاشان ئەگەر نەفەوتابن، هەر یەکەیان زمانێکی سەربەخۆیان دروست کردبێت.

٢ـ زمانێك دێتەکایەوە بەسەربەخۆیی قسەی پێ دەکرێت و دەبێتە زمانی نەتەوەیەك، لە بنەڕەتدا لەچەند شێوە زمانێکی جیاواز لەیەك پێك هاتووە لەبەر زروفێکی سیاسیو لەشکریدا (سوپایی) سەری هەڵهێناوە.

٣ـ هەندێك جاری وا هەیە کە شێوە زمانێکی ئایینی پیرۆز لە کاتی گەشانەوەدا شێوەکانی دی یا زمانانی دی دەفەوتێنێت. ـ بڕوانە سەرچاوەی ناوبراو ل ٣٤و٣٥ ـ

- 2 -

بەدەر لەوەیش کە نەژادی سۆمەریەکان تا ئێستا بە گرفتێکی مێژوویی ماوەتەوەو ساغ نەکراوەتەوە[٣] بەوەی لەکوێوە هاتوون و بەگوێرەی کۆمەڵەی نەتەوەکانی دنیا سەر بە کامیانن، ئەوە یەکالا کراوەتەوە کە ئەم گەلە بنیاتنەری شارستانیەتێکی رەسەنن نەك هەر لە رۆژهەڵاتیدا؛ بەڵکو لە تەواوی دنیاش دا.

زماناس و مێژوو نووس و ئارکیۆلۆژیستەکانیش، بەتایبەتی ئەوانەی لە زمانە کۆنەکان دا شارەزان، بە بەڵگەی ماددی ئەوەیان روون کردووەتەوە: سۆمەریەکان

کەلێک یا نەتەوەیەک نین سەر بە گرووپی ئەو کۆمەڵە نەتەوەیەی بە کۆمەڵەی نەتەوە سامی‌یەکان ناسراون، لەم بڕەیەشەوە زۆربەی زۆری سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان پەنجەیان بۆ ئەمە راکێشاوە، هەر بە نموونە:ـ ول سیورانت ـ دانەری (سەربردەی شارستانیەت)و جۆرج بۆ خاوەنی کتێبی (عیراقی دێرین)و جیمس هنری برستد و هینری فرانکفۆرت و هاری ساکزو مامۆستای سۆمەرناس سامۆنیل کرایمەر کە لە بواری بەدوادا چوون و توێژینەوەی شارستانیەتی سۆمەردا کۆششێکی بەرچاوی هەیە، هەروەها چەندین لێتۆژو ئارکیۆلۆژیست و مامۆستای عەرەبیش، لەوانە مامۆستا (تەها باقر) لە کتێبەکەی (مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة)دا و هەموو نووسینەکانی دیکەی لەوە بەدوای و دکتۆر فازڵ عبدالواحید پرۆفیسۆر لە زمانی سۆمەریدا و دکتۆر فەوزی رەشید کە لە تەواوی ئەو نووسینانەی دا پەیوەندیان بە مێژووی سۆمەری‌یەوە هەبووە ئاماژەیان بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە[4] و چەندانی تریش.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریشەوە، شارەزایانی زمان (سۆمەری)یان نەبردووەتەوە سەر خێزانی هیچ کۆمەڵە زمانێک، ئەوەندە نەبێ بە پاڵپشتی تێکستە دۆزراوەو بەردەستەکانەوە توانیویانە قۆناخەکانی پەرەسەندنی ئەم زمانە بزانن کە لە نووسینی وێنەیی‌یەوە بەرەو نووسینی هێمایی‌و پاشانیش قۆناخی برگەیی چووەو ئالکاریکی (پێکەوەلکان ـ الالصاق)یشی هەیە[5] و تا دوا قۆناخی بەکارهێنانیشی نەگەیوەتە پلەی (ئەلف و بێ)[6] و بە خەتی بزماری نووسراوەتەوە، کە خەتەکە خۆیشی هەر بەو جۆرە پەرەی سەندووە.

- 3 -

ئەم رێ روونی‌یەی سەرەوەم بە پێویست زانی پێش ئەوەی بچمە نێو باسەکەوە کە ئەویش:ـ

لە ماوەی خوێندنی ئەو چەند ساڵەم لە بەشی


وێنە (٤٠)

ئارکیۆلۆژی سەر بە کۆلێژی ئەدەبیاتی دانشگای بەغداو شی‌کردنەوەی چەند تێکستێکی سۆمەری، لەچەند وشەو (جێ‌ناو)و دەستەواژەیەک هەڵنکووتم کە هەندێکیان بەبێ ئەوەی گۆرانێکی ئەوتۆیان بەسەر هاتبێ لە کوردیدا بەکار دێن... ئەگەرچی دکتۆر (جەمال رەشید)یش لە کتێبەکەی (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)دا ئیشارەتی بۆ دوو وشە لەم وشانە کردووە؛ (ئوتتو ـ utu )و (کور کورـ Kur – Kur ) کە وشەی دووەمیان لەگەڵ شاخی (کور کورداغ)دا یێک دەبەستێتەوە، لەمەشدا



مَن = mu (مو)

ئەو = a-ne (ئا-نێ)

ئەوان = a-ne-ne (ئا-نێ-نێ)

ئێمە(مە) = me (مێ)

- وێنە - ٦ -

دکتۆر جەمال چاکی بۆ چووە، چونکە لە بنچینەدا (کور ـ Kur) کە مانـای شاخ دەگـەیێنێ لە سۆمـەریدا، بە دارشتەی (کۆ ـ Plural)[9] هاتووە کە دەکاتە (شاخەکان[8]).

دکتۆر رای وایە هەر ئەو (کور ـ Kur)میە پاشان لە کوردیدا بووە بە (کو)[9].

من خۆیشم بە دووری نابینم (کێو) یش هەر لەمەوە هاتبێ.

بەهـەر حاڵ دوکتـۆر جەمال پەنجەی بۆ وشەی دیکە رانەکێشاوە، ئەوە نەبێ کە لە دواییدا بەراوردی مەسەلەی بنچینەو دەرهاوردەکانی چەند زمانێك بەهی کوردی دەکـا باسی چەنـد وشەیەکی دیکەی سۆمەری کردووە لەوانە:

(گیش تو ـ Gishtu) کە دەکاتە (گوێ قولاخ)و (ئینەننا ـ Inanna)ی خوداوەندی جوانیو کچی ئاسمان و (لولو ـ Lu - Lu) کە دارشتەی (کۆ ـ Plural)ی (Lu)ە واتە (پیاو ـ man).

**بەش بە باری خۆم لەگەڵ پارێز وەرگرتنیشم دا لە مەسـەلەی پێك چوونی ئەم وشە سۆمەریو کوردییانەدا[10]، وا لە خوارەوە بەشێکیان بە ماناو نیشـانەوە: وەك ئەوەی لە تێکستە ئەسڵیەکان دا هاتوون (ئەو تێکستانەی راستەوخۆ لەبەر تابلێتە قوری یا بەردیەکان دا نووسراونەتەوە) دەخەمە بەرچـاو، لێکۆڵینـ وەو لێدوانیشی بۆ ئەو پسپۆڕو مامۆستا بەرێزانە دەهێڵمەوە کە لە زانستی زمان و مێژوو و پەرەسەندنی زمانە کۆنەکان دا بەڵەدن:**

**وشەکان:**

● **(ئا ـ a)**: لە سۆمەریدا بە مانای (ئاو) هاتووە[11]، بروانە وێنە ـ 2 ـ.

● **(گو ـ gu)**: لە سۆمەری بە (گوێ ـ edge) هاتووە ـ بەنموونە گوێی ئاو ، گوێ چەم[12]. بروانە وێنە ـ 2 ـ.

● **(ئوتتو ـ utu)**: لە تێکستە سۆمەرییەکان دا بە dingir utu دینگیر ئوتتو) واتە خوداوەندی هەتاو یا هەتاو هاتـووە کە بە ئەکـەدی دەکاتە (شەمەش ـ shamash) بروانە وێنە ـ 2 ـ.

**(ساگ ـ sag)**: لە سۆمەریدا بە مانای (سەر ـ head) هاتووە سەرنج دەدەمین ئەم وشەیە هەر تەواو لە (سەر)ی کوردییەوە نزیکە. بروانە وێنە (2) و (5).

● **(کـەڵەگا ـ Kalaga)**: لە سۆمەریدا هەر بە مانای (کەڵەگا)ی کوردی هاتووە، هەروەها بە مانای (بەهێز) یا (پاڵەوان) هاتووە کە لە (کوردی)یش هەر بەو جۆرەیە. بروانە وێنەی (2) و (3).

● **(پـابیلگـە ـ Pabilga)**: لە سۆمـەریدا بە مانای (باپیرە)وە هاتووە.

سەرنج دەدەمین تەواو لەگەڵ وشەی (باپیرە)ی کوردی دا پێك دەچن.

بروانە وێنە (2).

● **(نومۆزو ـ numuzu)**: لە تێکستە سۆمەریەکان دا بە مانای (نازانێ) یا (نازانم) هاتووە.

خۆی لە بنەرەتیشدا (zu) واتای (دەزانێ)یە کە لە کاتی کۆکردنەوەیشیدا دەبێ بە (زو زو ـ zu - zu) واتە (زۆر زان).

● **گودێئا ـ Gudea)**: ئەم وشەیە، یا راستتر ئەم چەند برگەیە، بە سۆمەری دەکاتە (ئەوەی قسان دەرێژێ) بە واتا (گۆتی) یا (گوتی) کوردی.

لە هەمان کاتیشدا ناوی مێرێکی بەناوبانگی لەگەشە، کە

چەندین کوتەڵی بۆ دروست کراوە، تەنانەت مۆزەخانەی (لوڤـر) لە پاریس بەشێکی تایبەتی بۆ کوتەڵەکانی ئەم میرە تەرخان کردووە.

بروانە وێنە (2) و (4).

● (مو ـ mu): جێناوە بە واتای (من)[13].

بروانە وێنەی (6).

● ئا نێ ـ a - ne): جێناوە، بەواتای (ئەو)[14].

بروانە وێنە (6).

(ئانێنێ ـ a - ne - ne): جێناوە، بەواتای (ئەوان[15]).

بروانە وێنە (6).

● (مێ ـ me): جێناوە، بەواتای (ئێمە) یا (مە[16]).

بروانە وێنە (6).

## پەراوێزەکان

١ـ صموئیل نوح کرایمر ـ السومریون، تأریخهم وحضارتهم و خصائصهم ـ وەرگێڕانی دکتۆر فیصل الوائلي ـ وكالة المطبوعات ـ كويت ل ج.

٢ـ طه باقر ـ مقدمة في أدب العراق القديم ـ بغداد ١٩٧٦ ل ٣٥.

٣ـ هەر چەندە زۆر لە توێژەرو ئارکیولۆژیست و مێژوونووسەکان لەو باوەڕە دان لە باکووری عیراقەوە هاتوون، بە نموونە دکتۆر (فـوزی رشید) لای وایە کە سۆمەرییەکان لە واقیع دا هەر ئەو کۆمەڵە بوون کە لە پێشدا لە باکور دادەنیشتن، ئەو تیوری (دی مۆرگـان)یش دێنێتـەوە کە لای وایـە بەهـۆی ڕێو ڕەسمێکی ئاینییەوە کە پەیوەندی بە پەرستنی چەند هۆیەکی پەیوەندار بە سرووشتەوە بووە.

لەم بارەیەوە بروانە د. فوزی رشید ـ المسألة السومرية ـ ڕۆژنامەی ـ الجمهورية ـ ی بەغدایی ژمارەی ڕۆژی ٢٠/٩/١٩٨٤.

٤ـ بۆ نموونە بروانە زنجیرە وتاری ـ المسألة السومرية ـ د. فوزی رشید لە ڕۆژنامەی ـ الجمهورية ـ ی بەغدایی‌دا کە لە سەرەوە نیشارەتمان دا وە.

(٥) پێکەوەلکان (الالصاق)، واتە بەهۆی پێکەوەلکانی دوو دەنگ وشەیەکی نوێ دروست دەبێ، یا لە ئەنجامی پێکەوەلکانی دوو وشەوە، بۆ نموونە وشەی (لو) کە بە مانای پیاو دێ لەگەڵ وشەی (گال ـ gal) کە مانای (مەزن) یا (گەورە) دەگەیێنێ: لە ئەنجامی پێکەوەلکانیانەوە دەبێ بە (Lugal ـ لوگال) کە بە مانای (پاشا) وە هاتووە.

(٦) زمـانی سۆمـەری تا ئەوەی بەکارهێنانی بری کرد، هەر بە برگـەیی مایـەوە، بەڵام ئاشکـرایە کە خەت و شێوازی نووسین گۆڕانـێـکی زۆری بەخـۆیـەوە بینی بەوەی زۆربـەی زۆری نەتـەوەکـانی ڕۆژهـەڵاتی نزیك، زمانی خۆیانیان پێ نووسیوە، ئەوەبوو لە (ئۆگاریت) ـ رأس الشمرة / شێوەی ئەلف و بێی وەرگرت.

(٧) (نـاو ـ الاسم) لە زمـانی سۆمـەری‌دا بە سێ ڕێگـا کۆ دەکـرێتـەوە، یەکێـك لەو ڕێگـایـانـە کە لێرەدا مەبـەستـە بە دووبارەکردنەوەیەتی لێرەشدا (کور کور ـ Kur - Kur) بە مانای چیاکانەوە دێ چونکە شێوەی کۆی وەرگرتووە.

(٨) (kur) جگە لەوەش، بە مانای (وڵاتی بێگانە)و هەروەها بە مانای (دەروازەی دنیای خوارەوە ـ العالم السفلي)یش هاتووە.

(٩) بروانە: دکتۆر جمال رشید ـ دراسات كردية في بلاد سوبارتو ـ بغدا ١٩٨٤ ـ چاپخانەی (آفاق عربية) ل ١٢.

(١٠) بەڵام دکتۆر جەمال لە زنجیرە باسەکانی‌دا (زمانی کوردی نێوان زانستی زمان و مێژوودا) لەم ڕووەوە جیاوازی سۆمەری لە زمـانـە کۆنەکانی دی ڕوون دەکاتەوە (بروانە د. جمال رشید ـ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ١٢٠ تا ١٢٢).

(١١) من لێرەدا مەبەستم لە (ئا ـ a)ی ژمارە (1)ە. چونکە (a)یەکانی‌تر مانای دیکە دەبەخشن:

بروانە:

F. A. Ali, A. Suleiman ...

(Introduction to The Study OF Ancient Languages)

چاپخـانەی (دار الكتب) ـ دانشگای مووسڵ ـ ١٩٨٠ شایانی باسە کە تێکستەکان لەم کتێبە دەرهێنراون.

(١٢) د. فوزی رشید ـ قواعد اللغه السومرية ـ لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕاگەیاندن ـ بەغدا ـ ١٩٧٢ ل ٤٤.

(١٣) هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ٤٤.

(١٤) هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ٤٧.

(١٥) هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ٤٧.

(١٦) هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ٤٧.

تێبینی: کاتێ خۆی کە ئەم نووسینە بۆ گۆڤاری (بەیان) نارد، نزیکەی ساڵێکی ڕابواردوە وا دیارە بڵاوکردنەوەی لەوێ بە نسیب نەبوو!!

# چەند ووشەیەکی سادەی کوردی لەرووی واتاوە

● یاسین حسن حسین گۆران ●

ئەگەر چی زمانی کوردی هێشتا بە تەواوی نەهاتیتە پارزنین دەستوری زمانیشی هێشتا گەلەك ساواو سادەیە ، زۆر ووشەی کوردیی رەسەن بزر بووەو ، هەرچەندە زۆر جاران زانایانی زمانمانو ئەدەب دۆستانو رۆشنبیرانی لە راست ووشەیەکی سادەی کوردی رادەوەستن ، یان چەند بیروراو مانایەکی جیاوازیان بۆ دیار دەکرێت .

پێویستە بە چاوێکی پیرۆز تەماشای ووشەی کوردی بکرێت لەهەر ناوچەو شوێنێکی کوردستان هەبێت بۆ زیندوو کردنەوەی ووشەی کوردی رەسەن ، داکو ببێتە بەردی بناغەی پێکهێنانی زمانێکی یەکگرتووی نەتەوەییان .

چەند ووشەو ناوی سادە لە رووی واتاوە

**١ – خڕ**

١ – خڕ = گشتی ، هەموو : ئەمرۆ خڕ قوتابیان خاوێنن

٢ – خڕ = بازنەیی : زەوی وەکو هێلکە (خڕ)ە

٣ – خڕ = بە کەندێك دەگۆترێت ئاو قوری کردبێتو زۆر بەردی تێدا هەبێت

٤ – خڕ = توند ، قایم : دەرگاکەی خڕ داخست

٥ – خڕ = کۆم بوونە ، چڤیانە [1]

٦ – خڕ = دەحف‌دانە – تام دانە دبێژن :– خڕکیْ بدە بارام یانی تام بدە «الازدحام والدفع»[2]

٧ – خڕ : گۆتنەکە دەنکییە . گۆ خڕو دخەورە چو یان : گۆ خڕو هاتە خوار[3] ٨ – خڕ = گرد[4]

٩ – خڕ = چەمی ووشكو بێئاو ، بەرد زۆر .[5]

**٢ – کۆڵ**

١ – کۆڵ : ئەو سیکاردە چەند (کۆڵ)ە .

٢ – کۆڵ : دارێکی درێژو ئەستوور بە درێژی خۆی شەق دەکەنو ناوەکەی دەردەهێننو ئاوی تێدەکرێت بۆ خواردنەوەی مەڕومالأت ، کۆلی ئاسنیش هەیە .

٣ – کۆڵ = ئەستوونە

٤ – کۆڵ = پشت : بە کۆڵ هەڵم گرت

٥ – کۆڵ = بار : ئەو کۆڵە بدە بە کۆڵی

٦ – کۆڵ = زۆر : کۆڵێك ئیشم هەیە .

٧ – کۆڵ = ناوی ئەو دارە بۆشەیە کە دۆشاوی لێدروست دەکرێ •

٨ – کۆڵ = بالأف ، کۆڵو کانی ، کۆڵو قەسار

٩ – کۆڵ : ئەو پیاوە لە خەبات کۆڵ نادات

١٠ – کۆڵ = واز لێنەهینان : ئەومنداڵە لە (کۆڵ)م ناگەرێت

١١ – کۆڵ = بزنی بێ شاخ . کورد دەڵێ :–

دحەقی بزنی کۆڵ ، لەسەر بزنی بە شاخ نامینێ

**٣ – دۆڵ**

١ – دۆڵ = دەهۆڵ

٢ – دۆڵ = کورت : سەری ئەوبانە (دۆڵ)ە

٣ – دۆڵ = گیان ، بەدەن . کاتی دایك لە منداڵەکەی توڕە دەبێت دەڵێ :– خۆ دێیەوە ماڵ (دۆل)ت هەر دەکوتم

٤ – دۆڵ = گەورەو بەرین ، بۆ نموونە :–

ئەو کراسەی لەبەرت زێدە دربو (دۆڵ)ە .

٥ – دۆل : شتێکی قوولە دروست ئەکرێ لە دار یا لە بەرد شتی تیا ئەکوترێ[6]

٦ – دۆڵ = شیوو دەرە .[7]

٧ – دۆڵ = دنگ[8] .

٨ – دۆڵ = زەریەتە – بەرمابێ جاندارە .[9] دەرباس بویە دغەیدێ دەدبێژن : فلأن کەس دۆلأ – دەولأ کەرایە

**٤ – تەپ**

١ – تەپ = تەپداری ، خوی هەیە (صرع)ع

٢ - تەپ = چەپەلۆك - دایە بەر (تەپ)ان

٣ - تەپ = شل‌وخاوو تەوەزەل

٤ - تەپ : دەنگێکە لە کەوتن یان لێدانی شتێك دەبیسترێ

٥ - تەپ = لەناکاو : ئازاد تەپ‌و کور مرد

٦ - تەپ = دەستار ، لەو مەتەلە کوردیە بەدیار دەکەوێت «تەپ لەسەر تەپێ ، دەست لە رەپێ»[10]

**٥ - شاخ**

١ - شاخ = کەور ، کێو ، چیا .

٢ - شاخ = توونلو رەق - ئەو زەوی‌یە دەلێ (شاخ)ە

٣ - شاخ : دەفرێکی دارینە باروونی تێ‌دەکرێ‌و ئەکرێتە مل[11]

٤ - شاخ = شتێکی رەق درێژە بە پشتی سەری گاوو بەرانو بزن هێندێ گیانداری ترەوە[12]

٥ - شاخ : ناڤێ گوندەکی پاکەڤنە پاژارەکی کوردە ل راسەری بازارێ جزیرا بۆتا دکەڤی وناف چیایێ (جودی - گودی) بهشتا دنیایێ دچیرۆکا دە بزۆرو لۆبێنە بیرا مروف ، هاڤینگها میرێ بۆتا بو[13]

٦ - شاخ = ناڤێ گوندەکە ل‌ناف هەکاریا دکەڤی مەلای جزیری دیژی :-

شاخە عمری ب خوە بەر ژێ

وژ قیصر مکە بحث[14] ...

٧ - شاخ = ترح‌و کات‌و پەنجێ کۆ ژدارا ولەم‌و گەیا ڤەدکەڤن - درێژدبن (سەر شاخ)

شەبەش‌و پەتیخ‌و هەر تشتێ کو ب سەرێ شاخا ڤەدمێنی (مایطول او یتشعب من جداول الاشجار والحشائش)[15]

**٦ - دێ**

١ - دێ = گوند

٢ - دێ = دێت ، دهێت

٣ - دێ = رازی‌بوونی بەنەبەدلێ ، هەروەکو دەلێن

دێ قەیناکە دێ یان : دێ بابۆ دێ

٤ - دێ = دایك ، بارام بێ دێ‌و بافە[16] ٥ - دێ = گەلای دار بەروو مازووەکە لە پایزدا ئەپاچرێ‌و لەناو پەلی درەختا هەل‌ئەگیرێ بۆ زستانی ئاژەل[17] ٦ - دێ = دەنگێکە لە وولاخ ئەکرێ بۆ گێرانەوەی لە کارێك[18]

**٧ - دەق**

١ - دەق = پێت . دەق ژنو مێر جارنا دەقا ل‌لاشێ خوە دکن . لەز جارەکێ هاتم کۆ کەچك سەرێ پزێ - لوێ کورەکی بچووك‌د دەقێن دەما من ژوا پرسی :- چما دلۆ دکن ؟ !

دبەرسڤا من دەگۆتن :- دا خوەدێ پی‌رازی نەبی یانی : لێ ب دەق ل‌جەم خوەدێ نەمقبولن (الوشم)[19] ع

٢ - (دەق) - کابا مەزنە کۆ پێ‌ل‌کابا دخن پاشی بویە ناڤێ وێ مروڤ کۆ دناف ائێل‌و باڤلك‌و مرۆڤێ خوە دە خوە بەل دکی

دەقو - دەقێ - دەقك ، بونە ناف (الكعب)[20] ع

٣ - دەق= قەدی شتی‌قەدکراو[21]

٤ - دەق = کەیف : وولاخەکە بە (دەق) یا بێ (دەق)ە[22] .

٥ - دەق = تەواو : بە دە رۆژی تەواو گەیشتمە کرماشان[23] .

٦ - دەق = میچ (ز)[24]

٧ - دەق = ئەندازەو پایە : فیسارکەس لە (دەق)ی خۆیا ماوە واتە هەر وەکو خۆیەتی[25]

٨ - دەق = گیاندارێکە بەهێزو قەڵەو : ئەسپەکەم بە (دەق)ە یان : گاجوونەکانم : بە (دەق)ن[26]

٩ - دەق = وەکو خۆیەتی جێزەگەنەکە لە (دەق)ی خۆیەتی

**سەرچاوەکان**

١ زمانی کوردی‌و دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی فؤاد حمە خورشید . وەرگێرانی بۆکوردی عثمان علی قادر ل ٤٢ ٤٣

٢ فەرهەنگا کوردی جگەرخوین . لەژمار ٢ دوو چاپی ١٩٦٢ ل ٦٦

٣ - سەرچاوەی پێشوو .

٤ - سەرچاوەی پێشوو .

٥ فەرهەنگی کشتوکال . بەرگی یەکەم . معروف قەرەداغی مەردۆخی ل ١٢٢

٦ - هەمان سەرچاوە

٧ - فەرهەنگی خال . جزمی دووەم . لاپەرە ١٣٩

٨ - هەمان سەرچاوە

٩ - فەرهەنگی کشتوکال . بەرگی یەکەم . چاپی یەکەم معروف قەرەداغی ل ٤٢

١٠ - فەرهەنگا کوردی جگەرخوین . هەژمار ٢ دوو چاپی ١٩٦٢ لاپەرە (٩٨) لە گوندەکانی دۆلەمەری سەربە ناوچەی مێرگەسۆر بە مەتەل دەگۆترێ

١١ - فەرهەنگی خال . جزمی دووەم . چاپخانەی کامران سلیمانی لاپەرە٣١٥

١٢ - هەمان سەرچاوە .

١٣ فەرهەنگا کوردی جگەرخوین . هەژمار ٢ دوو . چاپی ١٩٦٢ ل ١٦٥

١٤ هەمان سەرچاوە .

١٥ هەمان سەرچاوە .

١٦ هەمان سەرچاوە ل ١٠٥

١٧ فەرهەنگی محمدی خال جزمی دووەم . چاپخانەی کامران سلیمانی ل ١٦٥

١٨ هەمان سەرچاوە .

١٩ فەرهەنگا کوردی جگەرخوین . هەژمار ٢ دوو چاپی ١٩٦٢ ل ٨٦

٢٠ هەمان سەرچاوە

٢١ فەرهەنگی محمدی‌خال جزمی‌دووەم چاپخانەی‌کامران سلیمانی ل ١٥٦

٢٢ هەمان سەرچاوە

٢٣ هەمان سەرچاوە .

٢٤ - هەمان سەرچاوە

٢٥ هەمان سەرچاوە

٢٦ فەرهەنگی کشتوکال بەرگی یەکەم چاپی یەکەم . معروف قەرەداغی ل ١٤٦



ئەحمەد سەلام

# ئەو لایەنە تاریکانەی لە ڕێڕەوی: کاروانی شیعری نوێی کوردی دا ڕۆشنایییان دەوێ!

ماموستا کاکەی فەلاح ماوەیەك لەمەو بەر کارێکی پەسەندی کرد بەوەی نەك هەر نەیهێشت شوێنەواری کارەکانی ماموستایان (رەفیق حیلمی و عەلادین سەجادی) کوێر بێتەوە، بەڵکو هات خشتێکی تری خستە سەر بناغەی ئەو هەڵسەنگاندن و بۆ چوونانەی پێشتر ماموستایانی ناوبراو و نووسەرانیتر بنیاتیان نابوو.

کاکەی فەلاح بەم کارەی کە بریتی‌یە لە چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی بەرگی یەکەمی (کاروانی شیعری نوێی کوردی).
بە قەدەر تواناو رادەی پەی پێ بردنی خۆی خزمەتێکی باش بە باری سەردەمێکی ئەدەبیمان دەگەیەنێ. پێش هەموو شتێکیش نووسەری ئەم کتێبە خۆی دانی بەوەدا ناوە کە هیچ دوور نی‌یە ئەم کارەی لە هەڵەو ناتەواوی بەدەر بێ، هەر بۆیەکەش زمانی حاڵی خۆی لە پێشەکی باسەکەیدا لە (ل ٩)دا دەڵێ:
(رەنگە لەم نووسین و بۆ چوون و هەڵسەنگاندن و کۆڵینەوانەدا بەشی خۆم هەڵەم هەبێت و چەند نیشانێکم نەپێکابێت بەڵام لەلای من گرنگ هەڵە کردن و ناتەواوی نیە، بەڵکو ئەرکی هەرە پێویستمان لەسەر نووسین و روون کردنەوەو دەرخستنی بیرو راو تێ بینیو سەرنجی ئەدەبی و هەڵگرتنی بناوانی راستیو دروستی و ساغ کردنەوەی حەقیقەت و کاروباری رەوایە. بۆیە لەم بارەیەوە لە بارەی هەڵەو ناتەواوی نووسینەکەمەوە هیچ تکاو داوای چاو پۆشین و بەخشین و لێ بووردن لە قەڵەمی هیچ نوسەرو رەخنەگرو شاعیرێك ناکەم ... هەتد).
پێش ئەوەی بێمە سەر یەکالا کردنەوەی بۆ چوونەکانی نووسەر دەبێ ئەوە بڵێم کە کاکەی فەلاح بەم داواکارییەی خاڵێکی چاك بۆ خۆی تۆمار دەکاو خۆیشیو خوێنەریش لەو گومان و رارایانە رزگار دەکات، چونکە مەرج نی‌یە نووسەر هەر نووسەرێك بگری (لە هەر پلەو پایەیەکدا!) ئیتر مانای وابێت لە هەموو هەڵەو ناتەواوییەك بەدوور بێ!. منیش وە نەبێ لێرەدا بتوانم گفتی ئەوە بدەم کە بەم چەند تێبینیو و سەرنجانە هەرچی باری کتێبەکە هەڵی دەگرێ هەروا سووك و ئاسان بیخەمە روو، بۆیە هەر بایی ئەوەندەی ماوەم بۆ رەخساوەو هەلم بۆ هەڵکەوتوە توانیومە ئەم چەند ووردە سەرنجانە بخەمە بەر دەست، ئومێدەوارم جێی رەزامەندی نووسەر خۆیو خۆشەویستیش بێت.
ماموستا کاکەی فەلاح لە سەرجەمی باسەکەیدا ئەوەی پێوە دیارە کە مەبەستی بێ زیاتر لە (گۆران)ی شاعیر بکۆڵێتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ماندووبوونەیشیا خوێنەر هەست بە هەندێ کەم و کورتی دەکا لە ناو چوار چێوەی سەرنج و بۆ چوونەکانیا بۆ نموونە لە (ل ١٧)دا دەڵێ:
(وەك دیارە «گۆران» لە ساڵی ١٩٠٤ز یان ١٩٠٥ز لە شاری هەڵەبجە هاتۆتە دنیاوە...).

وەك ئاشکرایە هەموو کەسێ بەوە دەزانێ کە مرۆڤ لە یەك کات و شوێن دا لە دایك دەبێ کەواتە دەبێ ماموستا گۆران بێ سێ و دوو لە یەکێ لەو ساڵانەدا لە دایك بووبێ، یا ئەوەتا لە ساڵی ١٩٠٤ز لە دایك بووبێ یا دەبێ لە ساڵی ١٩٠٥ز لە دایك بووبێ، خۆ ئاشکرایشە مێژووی لە دایك بوونی یەکێکی وەکو ماموستا گۆران ئەوەندەی بەسەردا تێنەپەریوە تا ئەو گومانەی بخرێتە پاڵ.
ئەمە جگە لەوەی کاکەی فەلاح خۆی و دەیان کەسی تریش ماون هاوتەمەن و هاوچەرخی «گۆران»ی شاعیر بوون و ئەم راستیە دەبێ بزانن. ئەگەر هەر بەمەیش ساغ نەبێتەوە خۆ ئاشکرایە ماموستا گۆران سەردەمێك لە کارو باری میری دا موچەخۆر بووە (بۆ ماوەیەکیش کاکەی فەلاح خۆی لە تەکیا بووەو لە یەك دایرەدا بوون).
تۆ بڵێی ماموستا گۆران تەسکەرەی نەبووبێ! کە هەیشی بووبێ

ئایا ئەشێ سەروەر نووسرابێ: (لە ساڵی ١٩٠٤ز یان ١٩٠٥ز لە دایك بووە).

ئەم هەڵەیە لە ئەسڵا زۆر کەسی تر پێش کاکەی فەلاح لەسەری رۆیشتون دیارە ئەمیش بێ ورد بوونەوەو ساغ کردنەوە بەهەمان شوێنی ئەوان دا رۆیشتۆتەوە.

ئەگەر سەرنج بدەین هەمان هەڵە لە پێشەکی دیوانەکەی گۆران دا دووبـارە بۆتەوە، هەروەها سەردەمێکیش لە بەرنامەی خوێندنی زمـان و ئەدەبی کوردی قوتـابخـانەو ناوەندییەکان دا کە باسی مامۆستا (گۆران)ی تیا دەخوێندرا دیسانەوە ئەم هەڵەیە بینراوە!).

لە (ل ٢١)ی کتێبـەکـەیدا کاکەی فەلاح دێرە شیعرێکی ئەبو عەلای مەعەری) هێناوەتەوە و بەم چەشنەی خوارەوە وەری گێراوە و دەڵێ:

«ئەم گۆڕەم نیشانەی تاوانی باوکمە
بۆیە منیش تاوانی وام نەکرد»

من بەش بە حاڵی خۆم ئەوەنـدەی زەیـنـم لێرەدا یاریـدەم بدا شیعرەکەم بەم چەشنە دێتەوە یاد:

**(هذا ماجناه علی ابی وما جنیت علی احد)**

لەگـەڵ ئەوەیشـا دڵم ئاوی نەخـواردەوە ناچـار پەنام بردە بەر سەرچاوەیەك لەوێ بەم چەشنە هاتوە:

**(جناه ابی علی وما جنیت علی احد)**

(بروانە جواهر الادب / الجزء الثانی / تألیف احمد الهاشمی ص ١٩٩ من ادبیات وانشاء لغة العرب).

دیارە ئەم دەقە لەگەڵ نموونە وەرگێراوەکەی مامۆستا کاکەی فەلاح دا جیاوازییان ئاشکرا و روونە.

ئەوەی زۆر سەرنـج رادەکێشێ مامـۆستـا کاکـەی فەلاح چ لە پێشـەکی باسـەکـەیداو چ لە باسی مامـۆستـا گۆران خۆیدا هەوڵێکی بێ ووچان ئەدا کە «گۆران» بە پێشەنگی کاروانی نوێی شیعـری کوردی لەقـەڵەم بدا هەر چەنـدە لە پاڵیشیـەوە بە ئیشـارەتێکی رێزەوانە نایەوێ رەنجی شاعیرانی پێش «گۆران» کوێرکاتەوە، بە بڕوای من ئەم هەوێرە ئاوێکی زۆری کێشا، بێ دەنگ بوون لێی زیان بە رێرەوی ئەدەبیمان دەگەیەنێ، راستە (گالیلۆ) رۆیشت بەڵام زەوی لە سوڕانەوەی خۆی نەکەوت!

لە هەموو دنیادا وا رۆیشتوە ئەوی لە کارێکا دەست پێشکەری کردبێ ئەکەسە بە (پێشەنگی) ئەو کارە دادەنرێ.

وا بزانم (ئەدیسۆن) کە کارەبای داهێنا وای دانەهێنا بوو کە وەکو ئەمـڕۆ دێتـە بەرچاو مان و بەم حازریە سوودی لەبەر دەبینین کەچی ئێستاکەش هەر کەسێ باسی داهێنانی کارەبا بکات دەبێ بە رێزو ستایشەوە لە ئاستی داهێنانەکەی (ئەدیسۆن)دا مل کەچ کات جا، با کارەکەی (ئەدیسۆن)یش لە سەرەتاوە ساکارو تێرو تەسەل نەبووبێ!

ئەم قسەیە رامان دەکێشێ بەلای ئەوەدا لە کاکەی فەلاح بپرسین چۆن ئەو هەقە بە خۆی رەوا دەبینێ کە سەر قافڵەی کاروانی نوێ کردنـەوەی شیـعـری کوردی لە (شیـخ نوری شیـخ ساڵح) بسێنێتەوەو بیداتە دەست گۆران ئەمە لە کاتێکا کاکە خۆی دان بەوە دەنێ کە شێخ نوری پێش گۆران کەوتوە لە مەسەلەی نوێ کردنەوەی شیعری کوردیدا ئەوەتا بۆ نموونە لە (ل ٢٩)دا دەڵێ:

(شێخ نوری شێخ ساڵحیش لە بەر ئەوەی بە تەمەن لە «گۆران» گەورەتر و لەگەڵ ژیانی رۆژنامەگەری ئەو رۆژگارەی کوردیشدا پەیوەندی راستەو خۆو لە باری بە رۆژنامەوە هەبوو، بەرهەمەکانی زۆرتر بڵاو دەرکردەوەو ناو و هەوا ئەدەبیەکەشی سازگارتر بوو بۆیە لەو سەردەمەدا هەنگاوی یەکەمی گۆڕین و بەرەو پێشەوە چوون بەسەر شیعری تورکەکان زیاتر بە کنەو تەقەلای ئەدەبی شێخ نوری دەردرێتە قەڵەم و ئەو دەرکەوتوتر دەبینرا لە حەوتەوانەکە...).

لە پاڵ ئەم هەموو راستیانەیشەوە کە کاکەی فەلاح لێرەدا دەست نیشـانی کردون دێت لە زمـانی مامـۆستـا گۆران خۆیشیـەوە جارێکیتـر ئەو راستیـەمان بۆ دەسەلمێنێ ئەوەتا کاکەی فەلاح راکـانـی مامـۆسـتـا گۆران لەم رووەوە لە (ل ٢٦ و ٢٧)ی کتێبەکەیدا بەم چەشنە دەخاتە روو:

(نـوسـەر و شاعـیرانی ئەوسا بە تایبەتی شێخ نوری و رەشید نەجیب وەمن «مـەبەست مامۆستا گۆران خۆیەتی» کە پێکەوە بە ئەدەبی تورکی متأسیر بووین و پێکەوە دەمان نووسی بەڵام تەنها (شێخ نوری) شیعرەکانی بڵاو دەکردەوەو من بڵاوم نەدەکردەوە ئەو لەم بارەیەوە نیشاطی دەردەکەوت...).

هەر دوا بە دوای ئەمەش لە شوێنێکی ترشیدا مامۆستا گۆران ئەمە دەڵێ: (کەوا بێ هەموومان بە یەکەوە دەمانروانیە یەك کلاو رۆژنە، بەڵام دەتوانرێت بەشێخ نوری بوترێ سەرۆك (خوێنەری بەرێز سەرنج بدەرە تەعبیری سەرۆك و لە زمانی گۆران خۆیەوە) بە هۆی

١ـ زۆری بەرهەمی

٢ـ بڵاو کردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێ گومان تأسیری دەبەخشیە سەر ئەدەبی کوردی).

پاش ئەم راستیـانەو تەنها چاوگێرانێکی خێرایانەش بەو زنجیرە

نووسینە رەخنەییانەی شێخ نوری شێخ سالْح کە لە دەورو بەری سالآنی ١٩٢٦ و ١٩٢٧دا لە رۆژنامەی (ژیان)ی ئەو سەردەمانەدا بلاْوی‌کردوتەوە بەلْگەیەکی تری پێشرەویی و سەرقافلەیی دەسەلمێنن بۆ شێخ نوری.

(بروانە شێخ نوری شێخ سالْح لە کۆری لێکۆلْینەوەی ویژەیی‌و رەخنەسازیدا نووسینی د. کامل حسن عزیز البصیر).

ئەمەو ئەگەر بێتو ئەو نووسینانەی شێخ نوری و لەو سالآنەدا بەراورد بکەین لەگەلْ دەست پێ کردنی گۆرانی شاعیر کە لەو کاتانەدا لە دەروازەی رێبازی کلاسیکەوە هاتە ناو مەیدانی شیعرەوە دەبینین شێخ نوری لەو کاتانەدا پێشبینی‌و نەخشە دەرێژێ بۆ شیعری نوێی کوردی.

ئەگەر هەموو ئەمانەش بخەینە لاوە خۆ ئەوی کەمێ چێژ لە مۆسیقاو ئاهەنگی شیعری کوردی وەرگرتبێ لاری لەوەدا نی‌یە (لەوانەیە کاکەی فەلاح خۆیشی) کە «مەولەوی»

ئەمرو زۆربەی شاعیرانی شێوە لەهجەی گۆران کەیەکەم کەسانێك بن کەوا رۆحی نوێکارییان کردبێتە بەر شیعری کوردی بەلْگەیشمان بۆ ئەم قسانە نموونەی شیعرە رۆمانسیەکانی مەولەوی شاعیرە کە بەکێشی دە برگەیی خۆماڵی‌و جووت سەرواوە (قافیەوە) وتوونی!.

لێرەدا ئەبێ ئەوەش بلْێم کە هیچ مەرج نی‌یە پێوانەکردنی ئەدەبی کوردی (بەتایبەتی شیعر) بە پێوانەی قوتابخانە ئەدەبیەکانی ئەوروپی (کلاسی‌و رۆمانسی... هەتد) دەقاو دەق بەراورد بکرێ، چونکە زۆر جایزە شاعیرێکی سەردەمی کلاسیکی لای ئێمە بابەتی هەبێ بەرخانەی رۆمانسی یا ریالیستی بکەوێ چاوخشاندنێك بەناو شیعری شاعیرە کۆنەکانمان دا گەلێ نموونەی وامان بەرچاو دەکەوێ راستی ئەم قسانەمان ساغ بکاتەوە.

ئەوەندەی بۆ ئەم شوێنە باری قسە مابێتەوە بۆچوونێکی تری مامۆستا (گۆران)ە کە لە ئاستیا کەمێ وەستانی دەوێ، مامۆستا کاکەی فەلاح لە (ل ٢٧)دا لە زمانی مامۆستا (گۆران)ەوە دەلْێ:

(ئیتر من بە تەنها بەکۆششی ئەوان نەوەستام و وەزنی هیجاشم وەرگرت و بەکارهێنا).

بەم پێیە دەبێ ئەسلْ کۆششەکە دەستی ئەوانیشی تیا بێ (واتە شێخ نوری‌و رەشید نەجیب) بۆ وەزنی هیجاکەش مامۆستا گۆران نەهاتوە بلێ من دام ناون بەلْکو دەلْێ وەرم گرتوەو بەکارم هێناون، دیارە ئەسلْ داهێنانی وەزنەکەش دەگەرێتەوە بۆ شیعری کوردی خۆی‌و شاعیرانی پێش مامۆستا گۆران بەلْگەیشمان بۆ ئەمە شیعرە فۆلکلۆرییەکان و شیعری شاعیرانی شێوە لەهجەی گۆرانە وەك (مەولەوی و بیسارانی... هتد)

ئەوەندە هەیە مامۆستا گۆران هاتووە ئەو کێشانەی جارێکی‌تر سەرلەنوێ بووژاندوتەوەو گیانی هاوچەرخانەی بە بەردا کردون.

مەزنی‌و نامەزنی شاعیرێك یا ئەدیبێك بەوەوە بەند نی‌یە کە لەلیستەی ناو ریزکردن دا ناوێك پێش خرێ یا ناوێك دواخرێ، بەلْکو ئەسلْ مەزنیەکە لەوەدایە (کە حەقیقەتە ئەدەبیەکە) نەکرێ بە قۆچی قوربانی بۆ مەبەستە تایبەتیەکانمان!.

مامۆستا کاکەی فەلاح لە (ل ٣٥)دا لەشوێنێکا دەلْێ:

(... بەرهەمی ئەو شاعیرانەیە، کە، بە لەهجەی هەورامی‌و لەسەر کێشی (٥+٥) شیعریان هۆنیوەتەوە).

جارێ ئەسلْ زمانەکەی ئەو شیعرانەی پێ ـ وتراوە پێی ناوترێ لەهجەی هەورامی بەلْکو شێوە زاراوەی ـ گۆران ـ ی پێ‌دەلْێن، لەهجەی هەورامی لقێکە لەو شێوە زاراوەیە (مەلای جەباری‌و فەقێ قادری هەمەوەندو چەندانی‌تر هەن شیعریان بەم لەهجەیە هەیەو هەورامیش نین!).

ئەم کێشەش پێی ناوترێ کێشی (٥ + ٥) بەلْکو زیاتر وا باوە بەم چەشنە کێشە بوترێ کێشی (١٠ دە برگەیی) ئەوەندە هەیە لە کاتی برگە کردنیا دەوترێ هەنگاوەکانی (پێنج بە پێنجن). بۆ نموونە مەولەوی دەلْێ:

گولْ چوون رووی ئا زیز هەنگاوی یەکەم ٥ برگە
نە زا کەت پۆ شان هەنگاوی دووەم ٥ برگە
وەف را وان چوون سەیل هەمان هەنگاو
دی دەی من جۆ شان هەمان برگە

لە (ل ٣٧و ٣٨)دا کاکەی فەلاح دەلْێ:

(زۆر کەم رێك کەوتوە کە یەکێتی بابەت وەکو کشتەکێك شیرازەی هەموو بەیتەکانی بە یەکەوە بەستبێتەوە، جا بۆیە هەتا «گۆران» هیچ شاعیرێکی دیکەی کورد بەو خەست و خۆلْی (خەست و خوری) و پێ داگرتن و چرییە بە تەنگ یەکێتی بابەتەوە نەبووە).

ئەم حوکمە بەم (مطلق)یە سەرنج و وورد بوونەوەیەکی زۆر هەلْدەگرێ، ئەگەر هەر خوێنەرێك کەمێ خۆی ماندو کات و چاوێك بگێرێ بە دیوانی شاعیرەکانی پێش سەردەمی مامۆستا گۆران دا دەتوانێ بە دەیان نموونەی شیعری دا بدۆزێتەوە کە هەموو بەلْگەن بۆ یەکێتی بابەت.

من لیرەدا هەر بۆ نموونە سەر دێری یەك دوو شیعری شاعیران دێنمەوە بۆ بەڵگەی قسەکەم (خوێنەر دەتوانێ بچێتەوە سەر پاکی شیعرەکان بە پێی تواناو دەرفەت) سەرنج بدەنە شیعرە ناودارەکەی (شوکری فەزلی ۱۸۸۲ ـ ۱۹۲٦)

**نیش کە ئێستــا رووی لە هەورازە سەرەو لێـژی نەکبەی**
**بیری ووردیشی دەوێ هەر بە دووعــاو نوێـژی نەکــەی**

تا کوتایی هەموو شیعرەکە یا نموونەی شیعرەکەی شیخ رەزا کە، لە دیوانەکەیدا هەیە) دەڵێ:

**لە بیرم دێ سلێـمــانـی کە دار الـملکـی بابــان بوو**
**نە مەحکـومی عەجـەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو**

یا قەسیدەکەی (نالی) کە لە ستایشی یەکێ لە میرەکانی بابان دا ووتویەتی:

**تا فەلەك دەورەی نەدا صەد کەوکــەبــی ئاوا نەبــوو**
**کەوکــەبــەی میهری موبــارەك طلعــەتی پەیـدا نەبــوو**

ئەمــانــەو دەیــان نموونەی تری لەم بابەتانەمان هەن لەدیوانی شاعیرەکانی پێش گۆران جێ دەستی ئەو دەست پێشکەری پێوە دیارو ئاشکرایە.

کاکــەی فەلاح لە (ل ٦٢)دا لە پەراوێــزیکــدا چەنـد خالێکی ووروژانــدوە خوێنەر ناچار دەکا لە عاستیانا ئیستێکی بۆ بکا، ئەوەی لە خاڵی (۳ سێـیـەمی) ئەو پەراوێزەدا سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە دەڵێ:

(ئــەمە بێجگە لەوەش کە مێژووی ئەو شەرو شۆڕانە لە یەکەوە دوورن، بۆ نموونە جەمیلە وەك کچە قارەمانێك لەگەڵ بەسەرهات و شەری کۆریادا جێی بەراورد نیە ).

ئەم بۆ چوونــەم زۆر بەلاوە سەیرە ئەمە لە کاتێکا کاکەی فەلاح یەکێکــە لەو کەســانــەی باوەری وایە کە خەباتی میللەتان دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەران زنجیرەیەکن بە هیچ جۆرێك نابێ لەیەك بترازێن ئیتر مێژووی دوور و نزیك و میللەتی گەورەو بچووك چۆن لە تین و تەوژمی ئەو خەبــاتــە کەم دەکــاتەوە؟! . بە بروای من هونەرمەندیو دەسەلاتی شاعیر لەوەوە دەست پێ دەکا کە بتوانێ لە شتێکی بچکۆلانەوە کارێکی گەورە بەرپا بکات لەم کارەیشدا (کــامەران)ی شاعیر دەسەلاتێکی هونەرمەندانەی خستۆتە کار بەوەی لە رەمــزێکی وەکــو (جــەمیلە)وە توانیویەتی تەعامولێکی مرۆڤایەتیانە لەگەڵ خەباتی گەلی (جەزایر)دا بکات، ئەم دێرانەی خوارەوە شایــەدی ئەوە دەدەن بە شاعــیر کە مەبەستی بووە لە رێی کچە قارەمانی وەکو جەمیلەوە هەستی مرۆڤایەتی خۆی و نەتەوەکەی ئاوێتەی خەباتی گەلی جەزایر بکات و وبڵێ:

**ئەی باڵندەی هەستم بەگور**
**بفرە بۆ ناو بلێسەو گر**
**بۆ (جەزایر) خلکی ژیلە**
**بڵێ بە خوشکە جەمیلە**
**«سلاوی کردەکەی سەیوان**
**سلاوی گەرمی نیشتمان»**
**پێشکەش بە تۆ ئەی کچی لاو**
**ئەی پەروەردەی گر و خوێناو**

یا لە شوێنێکیتردا شاعیر دەڵێ:

**ئەی کیژۆلەی بۆمبا هاوێژ**
**بانگ ئەکەین (زۆرداری خوێن رێژ)**
**ئەکەی دەس و پەنجەی مردن**
**(تەور)درێژکەی بۆ گەردن**
**«تاوانبار دانێ تەورەکەت»**
**ژێر ئاکەوێ هێزی میللەت**
**ئەی خلکی ئاگر و ژیلە**
**هەزار سلاو لە جەمیلە**

(خوێنەر دەتوانێ بچێتەوە سەر دیوانی «ئاگرو ژیلە»ی کامەرانی شاعیر بۆ ئەوەی زیاتر لە مەبەستەکە نزیك بێتەوە).

دیارە تەعبیری (خاکی ژیلە) ئاشکراو روون مەسەلەی سەرجەم خاکی گەلی جەزایر دەگەیەنێ نەك تەنیا باس لە کچە قارەمانێکی وەك جەمیلە بێ (هەروەکو کاکەی فەلاح وای بۆ چووە!).

لە خاڵی (۵ پێنجەمی) هەمان پەراوێزدا کاکە دەڵێ:

(۵ ـ زۆرتــر نووســەر گلەیی لەوەیە کە (گۆران) نەیتوانیوە یان نەیویستوە مەسەلەی کۆریا بە مەسەلەی کوردەوە ببەستێتەوە بە پێی رەخنەی لە تاقە بەیتێك:

نەیەوێ ئازاد یەککرتوو
بژی نەك وەك کورد نووستوو)

ئەوەندەم مەبەست نییە کە پشت گیری گلەیی نووسەر (خوا لێ خۆشبــوو مامــۆستــا کامــل بەســیر) بکــەم بە قەدەر ئەوەی کە

مەبەستمە تیشکی سەرنج بخەمە سەر ئەم تاقە بەیتەو چەند بەیتێکی تری لەم چەشنە.

کاکە ئەیەوێ بڵێ بۆ ئەم تاقە بەیتە ئەوەندە باری گلەیی هەڵناگرێ ئیتر وەك ئاگای لە چەند بەیتێکی تری ئەم شیعرە نەبێ کە هەر خۆی لە (ل ٦١)دا بەرچاوی خستوین، کورد ئەڵێ: (جێ زەخمی خەنجەری ناحەز سارێژ دەبێتەوە بەلام تانووت و پلاری خزم و خوێشان سارێژ بوونی زەحمەتە!) ئینجا ئەگەر هەر مەسەلە ئەو تاقە بەیتە بوایە رەنگە ئەوەندە باری گلەیی هەڵنەگرتایە بەلام لە ئاست ئەم دێرانەی تردا ئەبێ چیبووترێ؟!

**تۆ هەر رەنگ بی، من هەر رەنگ بم**
**گەر نەتپەرستم بە پەنگ بم**

یا هەر لە هەمان شیعردا لە (ل ٦١)ی کتێبەکەدا دەڵێ:

**(گەر دوژمنی ئازادی تۆ**
**بە دوژمن نەزانم بۆ خۆ**
**خوایە بەشم هەر دیلی بێ**
**هەر روو زەردی و زەلیلی بێ)**

ئێمە ئەو هەقە بە خۆمان رەوا نەبینین بپرسین بۆ و لە پای چی؟ کوردیش ئەڵێ (کەس کچی خۆی ناکا بە قوربانی کوری خەڵکی!) شیعرەکان ئەوەندە روون و ئاشکران پێویست بە هیچ ووردکردنەوەیەك ناکەن، ئەوەندە هەیە بە پێوانەی سەردەمی رامیاری ئەو رۆژانە حیساب بۆ شیعرەکە بکەین کە (ساڵی ١٩٥١) ساڵی دانانی شیعرەکە بێت (هەر وەکو کاکەی خۆی ئەمەی روون کردۆتەوە).

ئەبێ بەو پێیە بڵێین لە ئەدەبیاتی ئەو رێبازەی ئەوسا مامۆستا گۆران باوەری پێی بووە لەو کاتانەداو تا (٥ پێنج ساڵێکیش دوای ئەو مێژووە) مشت و مڕێکی زۆر لە ئارادا بووە کە ئایا ئەشێ کورد بخرێتە خانەی (ئوممەت)ەوە یان نا؟.

دیارە کە حوکمی ئەوسای بەرەیەکی رامیاری وا بووبێ دەبێ مامۆستا (گۆران)یش وەك سەربازێکی ئەو رێگایە لەو جغزە دەرنەچێ و هەر دەبوو هەستی مرۆڤایەتی خۆی بەو جۆرە دەربڕی!.

لە (ل٦٤) دا مامۆستا کاکەی فەلاح دەڵێ:

«ئەم چەشنە کێشە کە شیعری (مستزاد)ی پێ دەڵێن و لە سەر کێشی یازدە برگەیی پەنجەیە واتە (٦ بە ٥)... هتد)

ئەوی راستی بێ کێشی شیعرەکان خۆماڵین و ناکەونە بەر خانەی (مستزاد)ەوە کە رواڵەتیکە لە رواڵەتەکانی کێشی عەروز، هەنگاوی شیعرەکانیش بەم جۆرەیە (٤ + ٤ + ٣) یا (٣ + ٤ + ٤) نەك (٦ بە ٥) وەك کاکە دەڵێ.

هەر بە برگە کردنی نموونەی شیعرەکانی ئەم بەشەی ناو کتێبەکە خۆی ئەو راستیەمان بۆ ساغ دەبێتەوە ئەوەتا هەنگاوەکان پاش برگە کردنیان و وا دەر دەچن:

کۆ شی گەر می / ٤ هەنگاو
دا یك جێـ گای / ٤ هەنگاو
نا زم بوو / ٣ هەنگاو
ناو بان گی چاو / ٤ هەنگاو
رە شی ش نەی / ٤ هەنگاو
رازم بوو / ٣ هەنگاو

یا دەبینین لە نموونەی دووەمی شیعرەکان دا هەنگاوەکان بەم جۆرە دەپێورێن:

ئەو کوڕ بوو / ٣ هەنگاو
سە رە ڕای ئە / ٤ هەنگاو
وەش دەس دار بوو / ٤ هەنگاو
نا پا کی / ٣ هەنگاو
کر دە وەی دوور / ٤ هەنگاو
لە پرس یار بوو / ٤ هەنگاو

بەم پێیەدەرکەوت شیعرەکان کێشی خۆماڵی پانزە برگەیین ناچنە ژێر دەواری (مستزاد)ەوە چونکە وەك پێشتر ووتمان (مستزاد) خاسیەتێکن لە خاسیەتەکانی کێشی عەروز وەك (ملمع، مسمط، موشح ترجیع بند، ترکیب بند... هتد) بۆ نموونە (نالی) لەم بارەیەوە دەڵێ:

**ئەی تازە جەوان پیرم و ئیفتادە کەوتووم تا ماوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لەدەس چووم قوربانی وەفاتم**

یا شیخ سەلامی شاعیر دەڵێ:

**یەك سەر دابگرە سەراسەر بە ئەم وەکو دڵ بەخەم**
**باران برێژە ئاو بە ئاو خورەم فرمێسکەکەی چەم**

ئەوەیشی زیاتر هونەری (مستزاد) دەر دەخا لە پارچە شیعرێکدا ئەوەیە ئەگەر هاتو ئەو (کەرتە ووشانەی) دوای سەرە دێری سەرواکانی شیعرەکان لابەرین دەبینین هیچ کارێکی ئەوتۆ ناکەنە سەر مانا و ئاهەنگی پارچە شیعرەکە. خوێنەواری ئەو بابەتە

شیعرانەش ئەتوانێ بۆ تاقی کردنەوە لەم شیعرەی (نالی و سەلام)دا ئەم کەرتە وشانە هەڵگرێ:

(تا ماوە حەیاتم، قوربانی وەفاتم)

(وەك دڵ بەخەم، فرمێسکەکەی چەم)

پاش لابردن بۆ بەڵگە جارێکی تر شیعرەکە بخوێنیتەوە دەبینێ وەك خۆیەتی‌و هیچ لە ماناو ئاهەنگی موسیقای شیعرەکە کەم ناکاتەوە.

مامۆستا کاکەی فەلاح لە (ل ٨٥ و ٨٦)دا دەربارەی بەختیار زێوەر دەڵێ:

(دانی بەخۆیدا گرت تا ٣ی تەموزی ١٩٣٨ لێرە بە دواوە بلبلی شیعر وتنی کەوتەوە بەستەو دەڵێت: «واتە بەختیار زیوەر»

ئەم کوردە کەوا ئێستە لە هەموو مەرتەبە دوونن

هەر مائیلی بێ عیلمی بوو دواکەوتن و بوونن

بەم چەشنە هەستێکی پاك و سادەی کوردایەتی...هەتد)

وا دیارە مامۆستا کاکەی فەلاح دەیەوێ بەم دێرە شیعرە وای بخاتە هەستی خوێنەرانەوە کە بەختیار زێوەر دەست پێشکەری کردوە لە نەخشە دانان و دارشتنی رێبازی کوردایەتی‌دا. ئەمە لە کاتێکا دەبوایە کاکە ئاگای لەوە بوایە کە زاراوەی کوردایەتی بۆ خۆی سەردەمی سەرهەڵدانی وەکو زاراوێك (مصطلحێك)و وەکو بزوتنەوەش دەگەرێتەوە بۆ دوای ئەو مێژووەی ئەو شیعرەی تیا وتراوە بە بروای من دوای سەرهەڵدانی پارت و کۆمەڵە کوردیەکان (هیچ نەبێ لەم ناوچەیەی ئێمەدا) ئەم زاراوەیە کەوتە سەر زمان و لاپەرەی نووسین و بڵاوکردنەوە.

بەو پێیەش بێ نموونەی زۆر لەو بابەتانەی بەختیار زێوەر پێش ئەم سەر دەمانە بەرچاو دەکەون، هەڵبەتە نموونەی شیعرە نەتەوەییەکانی (خانی و حاجی قادری کۆیی و پیرە مێرد و ئەحمەد موختار جاف... هەتد) گەلێ پێش ئەو سەردەمە کەوتوون.

لە (ل ٩٩)دا لە شوێنێکا کاکە تەعبیرێکی بەکار هێناوە لە رووی مێژووییەوە راستی ناپێکن ئەوەتا دەڵێ:

(حوکمەتە نەخۆشەکەی تورکیاش...) راستی‌یەکەی ئەم تەعبیرە زیاتر بۆ سەردەمی لەناو چوونی دەوڵەتی عوسمانی بەکارهاتوە. ئەویش ئاشکرایە کاتێ ئەڵمان وێژەی تێك شکان بە دەستی وڵاتانی هاوپەیمان، ئەوسایش دەوڵەتی عوسمانی یەکێ بوو لە دۆست و هاوپەیمانەکانی ئەڵمانیا ئیتر کە وڵاتانی هاوپەیمان سەرکەوتن، کەوتنە وێژەی پاشماوەکانی دەوڵەتی عوسمانی (بە تایبەتی لە لایەن فەرەنساو بەریتانیاوە) بەپێی پەیمانی (سایکس بیکۆ) میراتی دەوڵەتی عوسمانییان لە نێوان خۆیانا بەش کرد ئیتر لەوەوە دەوڵەتی عوسمانی بە (دەوڵەتە نەخۆشەکە!) ناوبرا، ئەوسا ناوی تورکیا لە ئارادا نەبوو، هەر لە ئەنجامی ئەم حاڵەتەوە رژێمێکی نوێ بەسەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك هاتە کایەوە بە جێگیر بوونی ئەم رژێمە پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی بەم تورکیایەی ئێستا ناوی دەرکرد.

مامۆستا کاکەی فەلاح لە بارەی (هەردی) شاعیرەوە گەلێ راو بۆ چوونی خستۆتە روو کە سەرجەمیان جێی سەرنج و وورد بوونەوەن، من لێرەدا بە پێی توانای خۆم بەشێکیان شی دەکەمەوەو باری سەرنجی خۆمیان دەخەمە سەر.

کاکە لە (ل ١٣٩)دا دەڵێ (بەلای منەوە ناوبانگی شاعیرانەی «هەردی» زۆرتر ئەگەر نەڵێم هەمووی قەرزاری شیعرو سروودی ئەو سەردەمەیەتی).

بە بروای منیش ناوبانگی ئەو سەردەمەی شاعیر ناگەرێتەوە بۆ باری هونەری شیعرەکانی بەڵکو زیاتر دەگەرێتەوە بۆ باری پێوەندی رامیاریانەی شاعیر لەو سەردەمەدا. ئەگینا ئەگەر بەپێی تەرازوی هونەری شیعر پێوانە لەگەڵ ئەو شیعرانەی شاعیردا بکەین و بەراوردیان بکەین لەگەڵ شیعرەکانی لەوەو دوای دەبینین شیعرەکانی دوای ئەو سەردەمانەی بەهێزترو پرچێژترن تا شیعرەکانی ئەو سەردەمانەی کە کاکە مەبەستێتی بۆیە من بروام وایە مەسەلەی ئەوسا مەسەلەی شیعر نەبووە بەڵکو زیاتر جۆری پێوەندی زاتی هەردی بووە بە رێبازی ئەو سەردەمەوەو هیچی تر ئیتر خوای نەکرد دوای ئەو سەردەمە گەوهەری شیعری باراندبێ ئەوە بەلای ئەو بەرمیەوە کێش و تای تەرازووەکە پارسەنگیان ئەمبەرەو بەر دەکا!!

کاکەی فەلاح لە (ل ١٤٢)دا حوکمێکی قورس ئەداتە پاڵ هەردی و زۆر ئاواژوانە بە خوێنەری دەناسێنێ کاتێ دەڵێ:

(ئەمەو بۆ ئەوەش باشتر لە حاڵەتە بیری و دەروونیەکەی شاعیرو بروا نەمانەکەی بەبایەخی مرۆڤ و وڵات پەروەری بگەین حەز دەکەم گوێیەك لە تەپڵی بەتاڵ بگرین)

پاش ئەمە کاکەی فەلاح دێت نموونەی شیعری (تەپڵی بە تاڵ) دەخاتە روو بۆ سەلماندنی ئەم قسانەیشی دێ لە دامێنی شیعرەکەدا بە لێکدانەوەی خۆی رووکەشانە بەم جۆرە لە شیعرەکە دەکۆڵێتەوەو دەڵێ:

(کەواتە بە پێو دانی بروای ئەم شیعرە ناموس و حەیاو راستگۆیی وڵات پەروەردەی سووکن و ناوێکی زلن وەك تەپڵی بەتاڵ دەنگ گەورەو بەناو بۆشن) بەڵێ مامۆستا




کاکەی فەلاح ئاوا لە ناوەرۆکی شیعرەکە دەگا، لە کاتێکا ئەگەر سەرنج بدەینە سەرجەمی شیعرەکە دەبینین رسواکردنی ئەو پاڵەوانانەیە کە بەدەم لاف و گەزاف بەو جۆرە بابەتانەوە لێ ئەدەن.

کە دێتە سەر وورد کردنەوەی حیسابیشیان دەبینی هەڵگرانی ئەو دروشمانە لە سنووری قسە ناچنە دەرەوەو لە کردەوەیشا بۆش و بەتاڵ دیارە پەردە هەڵماڵین لە رووی ئەو پاڵەوانانە خۆی لە خۆیا ئەوپەری بایەخ دانە بە (مرۆڤ و وولات پەروەری و حەیا و نامووس) بەم پێیە ئەم رەخنە گرتنەی هەردی شاعیر لەو سەردەمانەدا ئەو پەڕی دەست پێشکەری و ئازایەتیە. دەست خستنە سەر پەتاو دەردە کۆمەڵایەتیەکانمان تازە بە

تازەو پاش دەیان ساڵ دوای (هەردی) شاعیران و نووسەرانی تر دێن و خەریکن پەنجەی بۆ درێژ دەکەن و وورده وورده ئەگەر بابەتی وایان هەبووبێ دەیخەنەروو!

نموونەی شیعری تەوس و پلار هاویشتن نەك هەر لە ئەدەبی کوردیدا بەڵکو لە هەموو ئەدەبی جیهانیدا باوە هەر دوور نەڕۆین لە ئەدەبی عەرەبیدا نموونەی بەرهەمی شاعیرێکی وەکو(نزار قەبانی) گەلێ نموونەی لەم بابەتانەیمان بەرچاو دەکەوێ بەتایبەتی پاش کارەساتەکەی شەشی حوزەیران.

هەروەها ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەدەبی کوردی کوردی خۆمان لەم نموونانە بە زەقی لە بەرهەمی (گۆران و بێ کەس)دا ئاشکراو روون دێتە بەر چاومان.

مامۆستا گۆران لە (ل ٢١٥)ی دیوانەکەی دا لە ژێر ناوی (بەندیخانە)دا ئەمە دەڵێ:

(ئیتر من هیچ نە ئادەمیم نە نیشتمانی نە ئەندامی ئەم کۆمەڵە، نە کوردستانی نا، بۆ کوردێك کفرە ئێستا کوردستان وتن چەرچیەکانی ئیستعمارم لێ ئەبنە دوشمن) یا شاعیرێکی وەکو (بێ کەس) دێ لە (ل ١٦٦)ی دیوانەکەی دەڵێ:

(خوێندەواری شێتیە ، هەر جەهلە ئینسان سەرئەخا گەر لەمەولا ناوی عیلم برد بزانن سەرسەریم هێندە تەعقیبی هەقم کرد تاکو نانی خۆم بری سووك و ریسوا بووم لە ناوا گیرۆدەی ئاخرشەریم ئەگەر ئەم تەوس و پلار هاویشتنە هەمە بێ بۆ شاعیرێکی وەکو گۆران و بێکەس و شاعیرانی تر ئیتر بۆ ئەم بابەتە بۆ یەکێکی وەکو هەردی بەباریکی پێچەوانەوە لێك بدرێتەوە کە بە بڕوای من ئەم نموونانە لەو (ساتە ژانە شیعردا =اللحظة الشعرية)م مەبەستە ئەوپەری راستگۆیی شاعیر دەردەخا بەرامبەر بەخۆیو خەڵکەکە (هەر هیچ نەبێ بۆ ئەو کاتەی ئەو شیعرەی تیا ووتراوە).

کاکەفەلاح لە (ل ١٦٢)دا هەر دەربارەی هەردی دەڵێ :

(نەبوونی فەلسەفەو بیرێکی رۆشنی باوەڕ پێ کراوی ناخ و قەناعەتە دەروونیەکەو پشت کردنە قوناغی یەکەم و

شۆرشگێرانەی سەر بە مەسەلەی چەوسەوەکان و گەل و مرۆڤایەتی... ) دوا بە دوای ئەمەیش دیسانەوە لە ( ل ١٦٤ )دا دەڵێ:

(کەواتە نەبوونی فەلسەفەو بیرێکی رۆشن و بزوێنەر و بەنج بوون و لە هۆش خۆ چوونێکی درێژخایەنی...)

ئەم قسانەی کاکەی فەلاح ئەم چەند خاڵە دەوروژێنن:

١ـ بەم پێیە بێ هەر چی هەڵگری ئەو فەلسەفەیە بێ هەرچی هەڵگری ئەو فەلسەفەیە بێ کە (کاکەی فەلاح لێرەدا مەبەستێتی) ئاوا لە چاوتروکاندنێکاو بە قودرەتی قادر دەبێ بە شاعیر!

٢ـ هەر شاعـیرێك پێش سەر هەڵدانی ئەم فەلسەفەیە شیعـری ووتبێ دەبێ لە ئێستـاوە ناوی لە لیستـەی شاعیران دا بسرێتەوە !

٣ـ ئەو شاعیرانەی کە سەر دەمێك لەژێر تەوژمی ئەو فەلسەفەیەدا شیعریان ووتوەو ئێستا (لەبەر هەر هۆیـەك)دەستیـان لە رێبـازی ئەو فەلسـەفـەیـە هەڵگرتبێ دەبێ لە شاعیرێتی کەوتبن! بەم حیسابە بێ دەبێ چ‌ی بڵێـین لە ئاستی ئەو شاعـیرە مەزنـانەی ئەمرۆی ئەدەبی عەرەبی شانازی‌یان پێوە دەکا وەك (بدر شاكر سەیاب)و (عەبدولوەهاب بەیاتی )و (حەسەب شیخ جەعفـەر)...هـتـد. ئەگـەر بمـانـەوێ بە ووردی بۆ چوونـەکانی مامۆستا کاکەی فەلاح دەربارەی هەردی شاعیر وورد بکەینەوە دەبینین لە گەڵ شوێن دا رامان دەگرێو بیروڕای دژاو دژمان بە رووەدا دەتەقێنێتەوە بۆ نموونە لە (ل ١٤٧) دا دەڵێ:

(لەم قۆنـاغـی دوومم و وا دیـارە دواییـەی شاعـیر بدوێین).کەچی لە (ل ١٦٤)دەڵێ :

(بـەلای خۆی و خەڵکـیـەوە خۆی بە شاعـیرێـکـی راستـەقینـەو ناودارو بە تواناو خاوەن بەهرەو بەرهەمی جوان و سەرکەوتوو دەزانێ).هەر دوا بە دوای ئەمەش دەڵێ:

(بە تاقی کردنەوە بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت شیعرێکی هاوبیرو هاوسۆزو بەهرە دارانەی وەك ئەوانەی پێشووی بڵێت مەسلەحـەت وایە بێ دەنگ بێت ...)ئەگەر بیینە سەر تاو توێ کردنی ئەم بۆ چوونانە هەر لە دوو توێی خۆیان دا هەست بە (تەناقضێکی )زەق دەکەین، جارێ بەقەدەر ئەوەندەی ئاشکرایە مەرج نی‌یە هەر ئەدیبێك ئەگەر بۆ ماوەیەك لە کاری ئەدەبی خۆی وەستا ئیتر ئەمە ئەوە بگـەیـەنێ هیچی پێنـەمابێ! بە بڕوای من هەر ئەدیبیـك بگرین (بە شاعیری لەمەر ئەم باسەیشەوە) ئەگـەر ئێستاش بە قەناعەتی خۆی بڵێ ئیتر هیچ ناڵێم ناتوانێ ئەو حوکمە بەسەر هەست و موعاناتی دوا رۆژی خۆی‌دا بسەپێنێ (چونکە هیچ کەسێ نازانێ لە دوا رۆژیا چی چاوەڕوانی دەکا!)

لەبـەر ئەوە مەسـەلەی دەست هەڵگـرتنی ئەدیبێـك لە نووسـین لە دەسەڵاتی زاتی کەسەکە خۆی بێ ئیتر چۆن یەکێك لە دەرەوەی ئەو زاتەوە ئەتوانێ ئەو حوکمە بدا.

راستە زۆر ئەدیب هەیە لە سەردەمێکی ئەدەبی خۆی‌دا بۆ ماوەیەك بێزارو نائومێد ئەبێ بەڵام ئەنجام کەم و زۆر هەر ئەچێتەوە بەلای ئەو رێبازەدا ئیتر رادەی سەرکەوتن و سەرنـەکـەوتنی لەو رێگـایـەدا ئەمیـان باسیکی تر هەڵدەگرێ، کەواتە بە (مطلق)ی وەختێ ئەتوانین بڵێین فلانە ئەدیب لێبۆتەوە کە مەرگ تەنگی پێ هەڵچنێو بە زۆری زۆردارەتی لە دەستمـانی بفرێنێ. ئێستاش لە دنیای ئەدەبی ووڵاتە پێشکەوتووەکاندا وا باوە ئەدیب لە دوای تەمەنێکی (٧٠ ـ ٨٠) ساڵان دا سەر هەڵ ئەداو ناوی ئەکـەوێتە ناو ناوانەوە.. ئەگەر بۆ چوونی دووەم بکەین بە پێوانە بۆ شاعیر کە کاکە فەلاح لە زمانیەوە دەڵێ:

(بەلای خۆی و خەڵکیەوە خۆی بە شاعیرێکی راستەقینە و ناودار... هتد) دیارە هەر شاعیرێ ئەگەر بەلای خۆی و خەڵکیەوە وا ناسرابێ مانای وایە قەت وەستانی بۆ نییە چونـکـە ئەو (واتـا هەردی) کە لە خۆی رازی بێ و (خـەڵکـەکـەیشی لە پاڵ دابێ) مانای وایە هەرچی بڵێ (بەرِازی بوونی خۆی و خەڵکەکە) دەبێ بە شیعر! ئیتر

بۆ لە قسەی ئەم و ئەو سڵ بکاتەوە، ئەمیشیان با لێرەدا بوەستێ ئەی چۆن ئەم قسانە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا یەك دەگرنەوە:

(بەتاقی کردنەوە بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت... بڵێت .. هتد) کەواتە بەم حیسابە ئەم شیعرانەی شاعیر ئەیەوێ دایان رێژێ ناگەنە پلەو پایەی ئەو شیعرانەی لەمەو بەری بۆیە مەسلەحەت وایە بوەستێ (بەپێی قسەی کاکەی فەلاح) ئەگەر وابێ ئەی ئیتر شاعیر (هەردی) چۆن لە خۆی رازی بوو؟!

لەمەوە ئەتوانین بڵێین کە مامۆستا کاکەی فەلاح لەم بۆچوونانەیدا کەلێ پەلەی کردووەو حوکمێکی قورسی هاویشتوە!.

مامۆستا کاکەی فەلاح لە باسکردنی خۆی دا لە (ل ٢٠٥)دا ئەم تەعبیرەی زۆر سەرنجی راکێشام و بە بروای من حوکمی وا ئەقل بە رەوای نازانێ، بەم چەشنە فریشتە ئاساییانە مامەلە لەگەڵ ئادەمیزادا ناکرێ ئەوەتا دەڵێ: (لە شاعیرانی ئەم چەرخەش «گۆران»ی هەرە تەواو وەك بلیمەتێکی هەڵکەوتو بە دڵە ئەگەر خوێنەر سەرنج بدات (هەرە تەواو!) تەعبیرێکە رەنگە لە موریدی شێخێك قەبووڵ کرێ بەلام بۆ رۆشنبیر و خوێندەوارێکی ئەم سەردەمە ووردبوونەوەو ئێستێکی دەوێ، چونکە مەردوم چەند تەواو بێ هێشتا (هەر تەواو) نییە، ئەشێ ئەوە بسەلمێنین کە گۆران شاعیرێکی هونەرمەندو هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی بووە و بەرهەمەکانی کاریگەرییان بووەو دەبێ بۆ سەر باری ئەدەبیمان، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە چاو پۆشی کرێ لە لایەنە ناتەواویەکانی تری ژیانی شاعیر (هەروەکو کەسمان لە هەڵەو ناتەواوی بێ بەری نین هەڵبەتە (گۆران)نیش لەم قاعدەیە بە دەر نابێ!.

بۆیە هەر بۆ بەڵگەی رەت کردنەوەی تەعبیری («گۆران»ی هەرە تەواو) سەرنجی کاکەی فەلاح خۆی و خوێنەرانیش دەبەمەوە بۆ پەراوێزی ( ژمارە ٥٧ ل ٧١)ی کتیبەکە خۆی ئەوسا ئەو راستی‌یە یا لە زمانی گۆران خۆیەوە ببیستن بێ هیچ چەندوچوونێك!. من بروام وایە نووساندنی سیفەتێکی باش لە خۆڕایی بە یەکێکەوە (با، لە رووی دڵسۆزیشەوە بێت بۆ کەسە وەسفکراوەکان) زیانی ئەمە بە قەدەر زیانی ئەوە وایە کە بە ناهەق سیفەتێکی خراپ بەو کەسەوە بلکێنین!.

شتێکی تر کە لە کتیبەکەی کاکەی فەلاح دا سەرنجی راگرتم لە (ل٢٦١ و ٢٦٢)دا مەسەلەی ذەست نیشان کردنی سەرچاوەکانی کتیبەکە بوون، مامۆستا هاتوە سەرچاوە عەرەبیەکانی یەکسەری وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی، ئەمەی وەختێ لێ قەبووڵ دەکرا ئەگەر بهاتایە ئەو نووسراوانە سەرپاکیان گۆرابوونایەتە سەر زمانی کوردی، کەچی نەك هێشتا ئەتوانم بڵێم هیچ لەو سەرچاوانە نەکراون بە کوردی بگرە هەندیکیشیان زۆربەی خوێنەرانی کورد بە زمانە ئەسلیەکەیشی بەرچاویان نەکەوتوە، بۆیە وەك ئەمانەتێك (تا خوێنەری کوردیش سەری لێ تێك نەچێ) دەبوو ناونیشانی سەرچاوە عەرەبیەکان هەر بە زمانە ئەسلیەکەی خۆیان دەست نیشان کرانایە بێ دەست کاری!.

لە کۆتایی ئەم نوسینەمدا جاریکی تر دەڵێم ئەو ئەرك و ئەزیەتەی مامۆستا کاکەی فەلاح لەم کاروانەی دا کێشاویەتی شایانی ستایش و رێزلێنانە ئومێدەوارم مامۆستای شاعیر کاکەی فەلاح ئەم رایانەم وەك سەرنجێکی برایانەم لێ وەربگرێ لەگەڵ رێزم بۆ بیرو بۆچوونەکانی خۆی، دیارە هەموو هەڵەیەکیش هەر لە ئەنجامی کارکردنەوە دێت، هەر چەندە دەڵێن ئەو کەسە هەڵە ناکا کار ناکات کەچی بەبروای من ئەو کەسانەی کارێك دەزانن و نایکەن ئەوانە گەورەترین هەڵە دەکەن لە ژیانیانا.. هەر لەم روانگەیەوە هەستم هانی دام ئەم بۆچوونانەی خۆم بخەمە روو.. دیارە کارێکیش لە نیازێکی پاکەوە سەرهەڵ بدا ئەنجامی لەبەرچاو دەبێ و بەلای چاکەدا دەشکێتەوە.



# «نـالی» ...

# هەندێ زانیاری تازە



دکتور عەبدوڵڵا محەمەد حەداد

پێشەکی:
ووردبوونەوە لە لایەنەکانی جیهانی فراوانی (نـالی) و قوتـابخـانـە شیعـرییـەکەی، مەبەس و ئامانجی ئەم کورتە باسە نیە.. لەم دەرفەتەدا، تەنیا هەوڵ دەدەین تیشکێك ئاراستەی سووچێکی ژیانی ئەم لووتکە سەرکەشەی ئەدەبیاتی کوردی بکەین و هەنـدێ زانـیـاری لەم بارەیـەوە پێـشـکێش بە خوێنەری هێژاو خۆشەویست بکەین..

بێ گومـان بەرهەم و نووسینی هەر شاعیرێك ـ وەکـو یاسـاییکی گشتی ـ، بەهێزترین سەرچاوەیە بۆ تێگەیشتنی بارو دۆخی ژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی و رۆشنبیریی ئەو شاعیرە..
بەم هۆیەوە بۆی هەیە هەندێ شتی نادیارو نەزانراو بدۆزرێتەوە.. لە بارەی (نالی) شەوە، چەند مامۆستاییێك ئەم ئەرکەیان گرتۆتە ئەستۆ و هەوڵێکی باشیان داوەو تا ئەندازەیەکیش نیشانەیان پێکاوە[1]..
ئاشکرایە کە قسەو شاهێدی ئەو کەسانە پتر بروای پێ دەکرێ ئەگـەر هاتـوو هاوچەرخی شاعیرەکە بوون.. یاخود لە نزیکەوە شاعیرەکەیان ناسیبێ.
هەر سەرچـاوەیـەکیش لەسـەر دەمی شاعـیرەکـەوە نزیکتـر بێت، پتـر چاوەروانی «راستی» لێ دەکرێت، بەتایبەت ئەگەر نووسەرەکەی یەکێکی راستگۆ و دەست پاك و ئەمین بێت.

### (نالی) و (خۆدزکۆ)

بە پێی ئاگـاداری ئێمە، کۆنترین سەرچاوە کە تیـایـدا باسی «نـالی» کرابێت، باسـەکەی (ئەلکساندر خۆدزکـۆ)یـە لە بارەی «دیـالێکتی سلێمـانی»[2] ەوە...
(خۆدزکۆ) لە پێشەکی باسەکەیدا ـ کە لە سالی (١٨٥٧) بە فرنسی بلاو کراوەتـەوە ـ سێ چوار دێـری بۆ «نـالی ئەفەندی» تەرخان کردووە.. زانیاریەکانی لەم بارەیەوە، لە سالەکـانی (١٨٥٣ ـ ١٨٥٤) لە شاری پاریس لە ئەحمەد پاشای بابان[3] وەرگرتووە...
(خۆدزکۆ) بەم چەشنەی خوارەوە لە (نالی) دواوە:

«.. زانـایـەکی بە ناوبانگی کورد ـ ئێستا ـ لە شاری دیمشق لە سوریـا دەژی، ناوی ئەو زانـایە مەلا خدر «مـولا خضر ـMoLLa Hezir ، بەڵام زێـتـر بە ناوە ئەدەبیـەکەی نالی ئەفەندی «نعلی أفندی»ەوە ناسراوە. ئەم زاتە بەهرەی خۆی ـ وەکو پسپۆڕێکی شارەزا ـ بۆ دیـراسـەکردنی دیالێکتەکانی کوردستانی وڵاتەکەی تەرخان کردووە، هەروا لەمەو بەر کتێبێکی ڕێزمانی «Grammaire » عەرەبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیەوە..

«ئەحمەد خان[4]، کە لە نزیکەوە نالی ئەفەندی دەناسێ، بەڵێنی دامێ کە .. لە دەرفەتێکی لە باردا ـ بە سەروکی زمانەوانەکانی میللەتەکەی بمناسێنێ.[5]».

ئەو مامـۆستایانەی کە لەم سەرچاوەیە دواوون (بـەتایبەت مامۆستا مسعود محمد). لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون: نرخی لەوەدایە کە (نالی) لە سالانی ١٨٥٣ ـ ١٨٥٤ لە شامـدا بووە، ئەمـەش بۆتـە هۆی ڕاستکردنەوەی هەندێ هەڵە لە بارەی ژیانی نالیەوە[6].

ئەوەی ڕاستی بێ، نووسینـەکەی (خۆدزکۆ) بە سەرچاوەیێکی باوەڕپێکراو لە قەڵەم دەدرێ، نەك تەنیا لەبـەر ئەوەی کە نووسـەرەکە هاوچەرخی شاعیر بووە، بەڵکـو لەبەر ئەوەش کە ئەو کەسەی باسی «نالی»ی بۆ کردووە، «ئەحمەد پاشای بابان»ە ..

ئەم پاشـایـەش، لە هەمـوو کەسێـك زیـاتـر «نالی»ی ناسیووەو بەو پەڕی ڕێزو حورمەتیشەوە ناوی بردووە.

وا دەردەکەوێ هەر لەو سالانەدا، (نالی) قەسیدە بەناو بانگەکەی:

[قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور)]ی بۆ سولەیمانی ڕەوانەکردوە[7]

ئەوەندە هەیە، ئەو کتێبەی کە «نالی» لە بارەی ڕێزمانی عەرەبیەوە کردووە بە کوردی، تا ئەمڕۆ نەدۆزراوەتەوەو هیچیشی لێ‌ی نازانین..

بەدووری نازانـم لە داهـاتـوودا دەستنـووسێکی لە شوێنێکـدا بدۆزرێتـەوە.. هەر وا جێگـەی داخیشـە لێکـۆڵینەوەکانی «نالی» لە بارەی (دیالێکتەکانی زمانی کوردیـەوە) هیـچ سەرو سۆراغێکیـان دیار نیە.. وا دەردەکـەوێ ئەم بەرهـەمـانـە، بە ئاگـاداری «ئەحمە پاشا»وە ئامادە کراون.

**شیعرەکەی حاجی قادری کۆیی:**

سەرچـاوەیێکی ڕەسـەنی دیکە کە دوای نووسینەکەی (خـۆدزکـۆ) نووسراوە، شیعـرەکـەی «حـاجی قادری کۆیی»یە (١٨٢٤؟ ـ ١٨٩٧):

شەهسواری بەلاغەتی کوردان
یەککە تازی فەصاحەتی (بابان)[8]..

مامۆستا (مستەفا حەمە بۆر) لە سالی ١٩٨٣، لە ووتاری «مژدەی دۆزینەوەی سالی تیا مردنی نالی»دا لێ‌ی دواوەو لەبەر ڕۆشنایی دەستنووسێکی (علی ئاغای نەوتچی) ـ کە لە نێوان سالانی (١٢٩٦ . ١٣١٢ هـ) واتە (١٨٧٨ ـ ١٨٩٥ عیسەوی) لەناوچەکانی کەرکوك و سولەیمانی و کۆیـەدا نووسراوە ـ «مێـژووی وەفـاتی (کـوردی)و (نـالی)ی بەپێ‌ی شیکردنەوەی شیعرەکە (بە حیسابی ئەبجەد) دەست نیشان کردووە. ئینجا ڕوونی کردۆتەوە کە مستەفا بەگی صاحیبقران (کوردی) لە سالی (١٢٧٦ هیجـری = ١٨٥٩ عیسـەوی) وەفـاتی کردووە، مەلا خدری (نالی)ش لە سالی ١٢٨٩هـ = (١٨٧٢ ـ ١٨٧٣) میلادی وەفاتی کردووە[9].

ئەم نوختەیە لەگەڵ بۆ چوونەکانی مامۆستایان: (مسعود محمد و حەمەی مەلا کریم) یەك دەگرێتەوەو لەو ڕاستیـیـەش نزیکمـان دەکاتەوە کە (نالی) لەسالی (١٨٥٥) یا (١٨٥٦)دا وەفاتی نەکردووەو بەڵکو پتر ژیاوە.

**سەرچاوەیەکی تازە**

جا بۆ ئەوەی سالی کۆچ کردنـی مەلا خدری شارەزووری (نـالی) زیـاتـر ڕوون بێـتـەوە، ئەو «ڕاستی»یەش لای گشت ڕووناکبیرانی کورد بچەسپێ، وا پەنا دەبەینە بەر سەر چاوەیێکی تر کە تیادا، ئاشکرا

ساڵی کۆچی دوایی شاعیری مەزنمان دەست نیشان کراوە، هەر وا ناوی ئەو گۆڕستانەش تۆمار کراوە کە تیادا بەخاك سپێردراوە.

ناو نیشانی سەرچاوەکە «عثمانلی مؤلفلری»ە (واتە: نووسەرانی عوسمانی) کە لەلایەن (محمد طاهر بەگی بورسەلی)ەوە نووسراوە.

ئەم کتێبە بریتیە لە چەند بەرگێك و لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ئامادەکراوە.. بەداخەوە چاپە کۆنەکەی کتێبەکەمان لە کتێبخانەکانی (پاریس) دا نەدۆزیەوە، بۆیە پەنامان بردە بەر چاپە تازەکەی کە بە حەرفی لاتینی لە ساڵی (١٩٧٢)دا لە ئەستەموول بڵاوکراوەتەوە..

لە لاپەڕە (٢٨٤)ی بەرگی دووەمی کتێبەکەدا ئەم چەند دێڕەی خوارەوە دەربارەی (نالی) نووسراوە:-

«نالی- مەلا خدر (١٢٩٠هـ)=١٨٧٣

«لە گوندێکی سەر بە سلێمانی لە دایك بووە، خوێندن و تەحسیلی لە شاری سلێمانی و قەسەبەی قەرەداغ تەواو کردووە، بە زمانی کوردی دیوانێکی کامڵی هەیە، بەسێ زمانیش شیعری ئەوەندە رەنگینی هەیە کە بەهونەرەکانی جوانکاری رازاونەتەوە ..

«لە ساڵی (١٢٩٠)دا لە حەجی شەریف هاتەوە ، ئەو ماوەیەی کە لە ئەستەمووڵ مایەوە، بەو پەڕی رێزو شکۆداریەوە زاناو شاعیرەکانی ئەستەموول روویان تێ دەکرد ..پاش بەینێك وەفاتی کرد و لە گۆڕستانی (قاراجا احمد)

– Karaca Ahmed – تەرمەکەی بە خاك سپێردرا.. ئەمەش نموونەیێکە لە شیعرە بەرزو بەتامەکانی :

**گاهی تسبیح و گەبادە**

**گاهی نقشی رخی سادە**

**سنگ دردنلە دنیادە**

**نلر چکتم،نلر چکتم...»[١٠]**

★★★

لەبەر رۆشنایی ئەم کورتە سەرگوزشتەیەدا، دەتوانرێ بەدڵنیاییەوە هەندێ قسە دەربارەی (نالی) یەوە بکرێ:

١- (نالی) لە ساڵی (١٢٩٠)ی هیجری [=(١٨٧٣)ی عیسەوی]دا لە حەج گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەموول .. ئەم نوختەیە قسەکەی خوا لێخۆشبوو مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە دەسەلمێنێ ، چونکە ئەو (مەلا عەبدوڵڵا)- هەر وەکو مامۆستا (مسعود محمد) دەگێڕێتەوە- لە ساڵی (١٢٨٨)ی هیجریدا لە حەج (نالی)ی چاو پێ کەوتووە،(نالی) ئەوسلکە زۆریش پیر بووە[١١]..ئەم راستیەش لەگەڵ ناوەرۆکی شیعرەکانی دەوری پیری (نالی)دا دەگونجێ.

کەواتە، شیکردنەوەی شیعرەکەی (حاجی)بەحیسابی ئەبجەد، تەنیا ساڵێك جیاوازی هەیە لە گەڵ ئەوەی کە لەسەرچاوەی پێشوودا تۆمار کراوە..

دیارە کە هەڵەکردن لە (حیسابی ئەبجەد) یا لە شیکردنەوەی دا مەسەلەیێکی سروشتیو ئاساییەو نابێتە هۆی ئەوەی لە راستی لابدەین.

جا پێویستە نووسەرەکان ئاگاداری ئەوە بن کە (نالی)لە ساڵی [١٢٩٠هـ / ١٨٧٣م] کۆچی دوایی کردووە. بەپێی ئەو بەڵگە زانستیانەی سەرەوە، هیچ هەنجەتوو بەڵگەیەك بەدەست ئەو کەسانەدا نەماوە کە ساڵی (١٨٥٥)یا (١٨٥٦) بۆ کۆچی دوایی ئەو شاعیرە گەورەیە تۆمار دەکەن چونکە ئەم ١٧ ـ ١٨ ساڵە لە ژیانی شاعیرێکی وەکو (نالی)دا گەلێ حیسابی ووردی بۆ دەکرێ.

٢- تەرمی پاکی (نالی) لە گۆڕستانی «ابو ایوب الانصاری» دا نەنێژراوە[١٢]، بەڵکو لە گۆڕستانی (یاخود مەزاری): قەراجا احمد نێژراوە. ئەم نوختەیە لەگەڵ

راستیدا زیاتر دەگونجێ، چونکە (محمد طاهر بورسەلی) بە خۆی لە ئەستەموول ژیاوە و دیارە لەنزیکەوە ئاگاداری وەفاتی (نالی) بووە. ئەوەش هەیە کە گۆرستانی «ابو ایوب الانصاری» کەوتۆتە بەشی ئەورووپای ئەستەموولەوە کەچی گۆرستانی (قەراجا احمد) لە بەشی ئاسیای ئەو شارەدایە.
بە دووری نازانین تا ئێستاش کێلی سەر قەبرەکەی (نالی) مابێتەوە بەلام کێ هەیە بەدوایدا بگەرێ ؟!.
٣-(نالی) نەك تەنیا لە کوردستاندا وەکو شاعیرێکی پایە بەرز بەناوبانگ بووە، بەڵکو وەکو زانایەکی بەرزی ئیسلامی سەردەمەکەیشی لای زاناو شاعیرانی ئەوساکەی حیجازو شام و ئەستەموولیش رێزو حورمەتی هەبووە.
٤- هەر وەکو دەرکەوت. جگە لەو دوو پارچە شیعرە تورکیەی کە لە دیوانی (نالی) دا بلاوکراوەتەوە[١٣] چەند شعرێکی تریشی بەو زمانە هەیە، ئەو دوو بەیتەی سەرەوەش، نموونەیێکی تازەیە - کە بێ گومان جێی خۆی لە دیوانی(نالی)دا دەکاتەوە.

## ئەنجام :

دەست خستنی سەرچاوەی تازەو زانیاری نوێو بەڵگەی مێژوویی باوەر پێ کراو لە بارەی ژیان و بەرهەمی شاعیر و ئەدەبیانی کوردەوە، ئەرکێکی سەرەکیی تۆژینەرو رەخنەگرانی ئەدەبیاتی کوردیە ئەم هەنگاوە - خۆی لە خۆیدا - دەبێتە هەوێنی پەرەپێدانی ئەدەب و رۆشنبیری گەلەکەمان لە هەمان کاتدا دەبێتە بەردەبازێك بۆ راستکردنەوەی هەڵەو بۆ چوونی ناتەواوو پرکردنەوەی کەلێنێکی تر لە بواری بەر فراوانی ئەدەبیاتی گەلی کوردی ئێمەدا.. ئینجا چەند سەر ئەنجامێکی سودبەخش وەدەست دەهێنین.
ئومێدمان ئەوەیە، لەم ووتارەدا، کەرەستەیێکی دیکەمان خستبێتە بەر دەستی رەخنەگرو نووسەرانی کوردەوە..

## سەرنج و پەراوێزەکان:

(١) بۆ نموونە بروانە:
- علاءالدین سجادی: مێژوی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا (١٣٩١هـ-١٩٧١م)، ل (٢٥٠-٢٥٥).
- مسعود محمد: چەپکێك لە گوڵزاری نالی، بەغدا (١١٧٦).
- محمدی مەلا کریم: نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە بەغدا (١٩٧٩).

(٢) Alexandre chodzkd: Etudes philoLogigues Surlalangue kurde Cdiatecte de Soleymanie, J. As. No 4 (1857).
ئێمە سودمان لە نوسخەکەی کتێبخانەی ئاموزگای ئاسیوالی زمانە زیندوەکانی رۆژ هەلات [ I.N.L.C.o ]لە پاریس وەرگرتووە، ئەم نوسخەیە - کە تەواوی فوتوکۆپیەکەیمان لایە. لە ژمارەی چواری Journal Asiatique ، سالی (١٨٥٧)ەوە دەرهێنراوە.)

(٣) هەر وەکو ئاشکرایە ئەحمەد پاشای بابان - دوای شکستانی لەشکرەکەی بەرامبەر لەشکری دەوڵەتی عوسمانیو لەناوچوونی ئەمارەتی بابان و کەوتنی شاری سلێمانی ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی دەولەت چوتە ئەستەموول و لەوێ گەلێ وەزیفەی بەرزی لە دەرەوەی ئەمارەتەکەیدا پێ دراوە،
لەدەوروبەری سالانی (١٨٥٣-١٨٥٤) نەخۆش کەوتووەو چۆتە (پاریس) بۆ زیارەتی پزیشکەکانی ئەوێ، ئەو کاتە (خۆدزکۆ) لە قونسلخانەی روسیای قەیسەری لە پاریس فەرمانبەربووە، هاتنی ئەحمەد پاشای بەهەل زانیووە بۆ تەواوکردنی لێکۆلینەوەکانی دەربارەی زمانی کوردی (شێوەی سلێمانی).
(٤) (خۆدزکۆ) جارێك بە «ئەحمەد خان» و جارێکی کە بە «پاشا» ناوی ئەحمەد پاشای بردووە.

(٥) A. CHODZKO , op.cit. p.2 ـ

(٦) مسعود محمد: چەپکێك لە گوڵزاری نالی، ل (سی و یەك)،(سی‌ی‌و حەوت، سی‌ی‌و نۆ).

(٧)مامۆستای (رەحمەتی) علاءالدین سجادی دەڵێ
طه (١٨٣٤)دا کاغەزە بەناو بانگەکەی کە سەرەتاکەی ئەڵێ:
قوربانی تۆزی ڕێگەتم ....ئەنوسێ بۆ سولەیمانی ...»
(بڕوانە: علاءالدین سجادی: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٣).
بەداخەوە مامۆستا سجادی لە دەست نیشان کردنی ساڵەکانـدا لەبەر کەمی سەرچاوە ـ دوچاری هەندێ هەڵەبووە. مامۆستا مسعود محمد بە ووردی لە «چەپکێك لە گوڵزاری نالی»دا بۆ مەسەلەکە چووەو ئەو هەڵەو چەند هەڵەیێکی تریشی ڕاست کردۆتەوە.

(٨) لەبارەی دەقی تەواوی شیعرەکەوە، بڕوانە:
[دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی (سەردار حمیـد میران و کەریم مستـەفـا شارەزا)، پێداچـوونـەوەی مسعـود محمـد، لە چاپکـراوەکانی ئەمینـداریێتی گشتی‌ی رۆشنبـیریی‌و لاوانی ناوچـەی کوردستان، ١٩٨٦، ل (٢١٩ـ٢٢٧).

(٩) محەمەد مصطەفا حەمە بۆر: «مژدەی دۆزینەوەی ساڵی تیـا مردنی نالی»، رۆژنـامەی «هاوکاری»، ژمارە (٦٩٥) لە ١٩٨٣/٧/٧ ل (٤و١٠)؛ ژمارە (٦٩٦) لە ١٩٨٣/٧/٢١، ل (١٠و١١).

(١٠) BuRsALI, Mehmet Tahir Efendi : OsmanLi ـ Muellifleri, TI, Beyazit – Istanbul, 1972, p. 284 .

(١١) مسعود محمد: سەرچاوەی پێشوو ، ل (چل و پێنج).

(١٢) مامۆستا سجادی دەڵێ:
طه ساڵی (١٨٥٥)ی میلادی وەکو هەمو ئەمامێکی ئەم گێتیـە لە دیواخانی بادە نۆشاندا دائەنیشێ و شەرابی مردن لە تەمەنی (٥٨) ساڵیدا لەمەی گێڕی گەردون وەرئـەگرێ‌و ئەیخـواتـەوەو لە گۆڕستانی «ابا ایوبی انصـاری» دا ئەنێـژرێ‌و بۆ هەتـا هەتـایی سەری نوستویێتی ئەنێتەوە..»
(بڕوانە: علاء الدین سجادی: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٤).
هەر وەکو روونمان کردەوە، (نالی) لە ساڵی (١٨٧٣)دا وەفاتی کردووە لە گۆڕستانی (قاراجا أحمد) نێژراوە.
لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێن کە مامۆستای خوالێ خۆشبوو (علاء الدین سجادی) هەر چەندیش لە دەست نیشان کردنی ساڵەکانـدا دوچاری هەندێ هەڵە بووە، بەڵام کتێبـە نایـابـەکەی «مێژووی ئەدەبی کوردی» (کە بۆ یەکـەمـین جار لە ساڵی (١٩٥٢)دا لە چاپ دراوە)، نرخێکی مێـژوویی‌و ئەدەبی یەکجـار گەورەی هەیـە.. ئەگـەر پیـاو وورد سەرنـج بداتـە شێـوەی نووسینی مامۆستا، بۆی روون دەبێتەوە کە چەند ئەدیبێکی بەرز بووە.

(١٣) لەبـارەی دەقی ئەو دوو پارچە شیعرە تورکیەی (نـالی)وە، بڕوانـە: «دیـوانی نالی»، لێکـۆڵینـەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، (پیاچوونەوەی محمدی مەلا کریم)، بەغدا، ١٩٧٦، ل (٢١٧ـ٢١٩).

دکتور مارف خەزنەدار لەبارەی ئەم دوو پارچە شیعرە هەندێ بیروڕای تایبەتی هەیە. (بڕوانە: دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا ـ ١٩٧٧، ل (٢٢ـ٢٣).
لەبارەی ئەو تاقە شیعرە تورکیەش کە مامۆستا سجادی لە لاپەرە (٢٤٤)ی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا بڵاوی کردۆتـەوە، هەر وەکـو مامۆستا ئەحمەد تاقانە) ساغی کردۆتەوە هی (نابی)یە نەك هی (نالی).
(بـڕوانـە: ئەحمـەد تاقانە: لەنێوان (نالی)و (نابی)دا، رۆژنـامـەی «هـاوکـاری»، ژمـارە (١٠٦٧) لە ١٩٨٩/٤/١٣، ل (٧).

٩٨٩/٤/١٤



# گوڵی ڕەش و تەکنیکی نوێی دووای «مەسەلەی ژیان»

عبدالله حمه سوور

کۆمەڵە چیرۆکی دووتوێی کتێبی «گوڵی ڕەش» شەش چیرۆکی پێزدار وە دەردەخات، ئەومەندەی پەڵی ڕەخنەکاریم ئاراستە بکەم یەکەم چیرۆکی کە گوڵی ڕەشە دەخەمە بەر تێروانینی توێژینەوەی خۆمەوە بەو هیوایەی لە داهاتویەکی نزیکدا بتوانم یان بوار بۆ ڕەخنەکارانی دیکە برەخسێنت هەرکام لە ڕوانگەی ڕەخنەسازی خۆیەوە ڕەچاوی چیرۆکەکانی دیکەی بکرێت کە بریتین لە گوناهی سپی من و قالە ڕەنگاڵە، میم، زەلکاو.

سەرکەوتن بۆ هەورازێکی سەخت و بێ هەڵگرتنی چیرۆکنووس بۆ گەیشتنە کۆپی مەبەست بە دەستەوەدان لە دارشتنی چیرۆکی گوڵی ڕەشدا وای لە (شێرزاد حەسەن)ی دانەر کردووە چۆنێتی هۆنینەوەو چنینی چیرۆکی گوڵی ڕەش لەگەڵ سروشتی نەك تەنیا خودی خۆی بەڵکو لەتەك زۆربەی هەرە زۆری کەسانی نێو ژینگەو کۆمەڵگەی سەردەمی ژیانی لاوێکی ئەودا بگونجێت و لەتەواوی خاسیەتەکانی مرۆڤایەتی بگەن بەهۆی لەبەرچاوگرتن و بەراورد کردنی جوداوازی باری ژیانی کەسانی نێو چیرۆکەکەوە.

ڕاستیەکی دژوار لەگوڵی ڕەشدا کە بەدیار دەکەوێت ڕەنگدانەوەی ئەزموونێکی بەربڵاوی بیرکردنەوەی ڕەوتی ژیانی شێرزاد حەسەنی دانەرە لە نێو دەوروبەرەکەیدا بە شێوەیەکی کارامە هەڵی هێنجاوەو ئەو ئەندێشە دەروونیەی دەربڕیوەو کردویەتیە کردارێکی شیاوو پڕ بە پێستی ئەو جۆرە کەسانەی کەوەك (حەمە) بەراوردی باری دارایی خواپێداوان لەتەك بێ بژێوی‌و نەدارایی خۆیاندا دەکەن و بەهۆنینەوەیەکی گەلەك نزیك لە واقیعەوە هێناویەتیە ئاراوە

بەو پێیە بەر لەوەی بڵێم کاك شێرزاد حەسەن شارەزایی تەواوی هەیە لە وەرگێڕانی نووسراوانی ئەدەبی جۆراو جۆر لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ زمانی کوردی و لەو بوارەدا بە گوێرەی توانای خۆی پێکەمی نەکردووەو گەر ناوبەناویش ئەو ووزەو توانستە ئەدەبیەی برەخساندایە بەرەو وەرگێڕان لە کوردییەوە بۆ ئینگلیزی ئەوا گەلەك خزمەتی وەرگێڕانەکەی پایە بڵندترو دەشبووە مایەی شانازی گشت لایەك و پێناسینی ئەدەبەکەمان بە گەلانی جیهانەوە دەڵێم چیرۆکنووسێکی بیرتیژی وا بەهرەداری خۆی بە تەکنیکی نوێی دەقی نووسراوێکی ئەدەبی وەکو گوڵی ڕەش تەرخان کردووە بۆ گەڕان بە دووای ئەو هێزە نەمرەی لە مرۆڤدا هەیە کە بریتییە لە وشیاریو ویژدان تازیندوێتی بخاتە بەر ژیانێکی بەنرخ و پڕ واتای خۆشەویستییەوە، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەشی پەنای بردۆتە بەر خاسیەتەکانی مرۆڤایەتیو بەراوردکردنی باری نەدارایی هەژاران لەتەك باری دارایی سەروەت مەندانی کۆمەڵگەی سەردەمی خۆیداو وەك هێمایەك ماڵی (چەلەبی) دەستەڵاتدارو دەوڵەمەند سەدانی وەك (هێرۆ)ی کچیان بتوێننەوە لە پێناوی بژێویو بەرژەوەندی خۆیاندا کە ئەوانەی لە وێنەی هێرۆو دەستەخوشکانی ئەون بەبێ ئاگاو خونەویستی خۆیان تەواوی ڕەوانی گیانیان دەبێتە کۆچی قوربانی ئەو ڕێبازەی خێزانەکانیان داویانەتە بەر ڕاگوزاری ژیانیان و ئەنجامی هاوکێشەکەشیان کۆیلەی دراوو دۆبری خۆشەویستی و لە دەست دانی عاشقی دڵبەستەی خاوێن.

گوڵی ڕەش بەهایەکی باڵای دەربڕینی هونەری چیرۆکی هاوچەرخە .. لە شێوەی گێڕانەوەی تاکە کەسی

کۆماری عێراق وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
سەرگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (٢١٠)

کوڵی ڕەش

شەش چیرۆک

شێرزاد حسن

یەکەم و ناوبەناویش بە زمانی گەسی دووەمی تاك و تێومردانی زمانی کەسی سێیەمەوە ڕواڵەتی مل ملانێی باری گوزەرانی تیپ و تاقم و دامو دەزگایەکی تایبەت و بێبژێوی هەرە بەشە زۆرە ڕەش و ڕووتەکەی کۆمەڵگە دەردەخات هەر وەك مامەڵەو بۆ چوونی دووەم چیرۆك نووسی کوردی (ئەحمەد موختار جاف) کە لە چیرۆکی (مەسەلەی ویژادن)ە کەیدا بەر لە نیو سەدە پتر بە چیرۆك نەخشەی ژیانی گەلەکەی کێشاوەو یاخی بوونی دەروونی خۆی بەرامبەر بە چینی دەرەبەگی ساڵانی بیستەکانی عێراق دەربڕیوە کە لە پاشماوە ڕژێمە کەنەفت و پۆتکاوەکەی عوسمانیەکانەوە بەجێ مابوو.. بیری شێرزاد حەسەنیش نەخشەکێشانێکی بارو زروف ئابوری و کۆمەڵایەتی سەردەمی منالی تا تەمەن لاوێتی خۆیەتی.. کەواتە بابەتی گوڵی ڕەش هەمان بنەمای بیرکردنەوەی (مەسەلەی ویژدان)ە و قۆناغی مێژوییان جوداوازە.

هەر وەك بیری شاعیری مەزن (ئەحمەد موختار جاف) کە نووسەری (مەسەلەی ویژدان)ە لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیەکەی سەردەمی ئەوسای وولاتدا بەزمانی دەوروبەری خۆیەوە کێشەکەی نێو کۆمەڵانی خەڵکی بەشێوەی چیرۆك دەربڕیوە بۆ نموونە کە دەڵێت (بەیاناتی دەرویش تەنسیرێکی گەوردی کرد لە دڵمدا فەرش و نوێنی تۆیە موتلەقەن هەقی غەیری وا بەسەرەوە. ئەو نانی تۆیە بە تەحقیق لە نەتیجەی زوڵمێکەوە پەیدا کراوە. ئەو خانوە جوانە ئەمینم کە زۆر کەس بە نارەزامەندی ئیشی تیا کردووە...
بەعزێ شتی ئودەکەت هینی غەیر بووە).

بیرو بۆ چوونی نووسەری گوڵی ڕەشیش بە نموونەیەکی زیندوویی و سەربەستیەکی فراوانەوە دووای تێپەڕبوونی پتر لەونیو سەدەیە بەم ئەقڵ و مایە زۆرەی شارستانیەتی نوێی ئێستایەوە کە نیشانەی سەربەستی بیروڕای نووسەرانی سەردەمە بۆ داهێنان لە هونەری چیرۆکدا و دوورکەوتنەوەو خۆ قوتارکردن لە (ڕەمز) هەمان کێشەی نێو کۆمەڵانی خەڵکی بە گشتی بە جۆرێکی دیکەی سەرەتای سەرهەڵدانی نیمچە بۆرژوای دووای ڕەمانی پاشایەتی عێراق وەدەردەخات و لەگەڵ (هێرۆ)ی کەسی دووەمی چیرۆکدا (حەمە) بەبێ ئەوەی زمانی لێ ببەسسترێت وا دەدوێت ماوەی بیست ساڵ بەر لە ١٩٨٣ی کاتی لەدایك بوونی چیرۆك وە بیردەخاتەوەو دەڵێت: (هێرۆگیان .. من هەر ئەوەندەی چلە گیایەك بووم کە گوێم بە «نی‌یە» زرنگایەوە ..... بیرمە دەمووت: عانە؟
دەیات ووت: نی‌یە.. پێڵاو؟ نی‌یە ..... گەر ئێستاش هاوینان نەچمە مەیدانی قورکاری.. دەبێ زستان خەون بەئاگردانێکەوە ببینین....
ئاڵۆزم وەمێشکم گەڵێ جەنجاڵە.. بەڵام چاك دەزانم دەوڵەمەندەکانی شار، ئاغاو کوێخاو دەرکراوەکان، قۆنتەراتچی‌و بازرگانە هەرە قەبەکان، ئەوانەی دینارێك دەکەنە دەو.. دەش بەسەد..
ئەوانە ناهێڵن و نەیان هێشت و لەمەودوواش ناهێڵن من ناوی ئەو گوڵە مۆرد بزانم .... پیاوە دەوڵەمەندەکانی کەرەت کۆشکەکەی نێود.... کەلاوەکەی ئێمەش ....). جا بۆیە حەمە شوناسی گوڵە مۆردەکانی ناو نینجانەکان نەبوودو تەنانەت ناوی ئەو چەشنە گوڵانەش نازانێت کە لە بنەڕەتدا لە ژینگەیەکی نامۆود ئەو جۆرە خێزانە دەوڵەمەندانە هێناویانن و هەر بە نامۆییش لەم خاك و ناودی ئێمەدا گەر ڕێزی مرۆڤ بە پارە بپێورێت ئەو خواپێداوانە پەروەردەی دەکەن و (من تەنها ئاشنای گوڵە تەمەن کورتەکانی ژاڵەی سەر شۆستەکانم.. وردە گوڵی مورتکەکانی‌و هیچی تر).

پەژارەی لەبیرکردنی خۆشەویستی هێندەی بارستایی کتێوێك قورسە.. بەڵام لای نووسەری گوڵی ڕەش لە وەسفی ئەو خەمەی نێو دڵیدا جوانکاریەکی وای بۆ بارە دەروونیەکەی پاڵەوانی یەکەمی چیرۆك بەکار هێناوەو ئەوەندە (حەمە) تامەزرۆی بینینی (هێرۆخان)ە تا چینی ڕستەو دەستەواژەکانی دەگاتە رادەیەکی شەکاوەی ئەوتۆ (لەیاد چوونەوەی تۆ قورسە.. قورسە وەك مەرگ ، بۆشاییەکە بەقەد بۆشایی نێوان ئەستێرەکان.. خەمێکە بەقەد هەندرین و هەڵگوردو پیرەمەگرون). کاتیش دەمەو ئێوارەیەکەو جوتیاری گوندان دەڵێن هێندەی کلکە بێلێکی ماوە ڕۆژ ئاوابێ، دیارکردنی ئەو دەمەو ئێوارەیەش بە دەربڕینی خاوەن دەقی چیرۆك قەدەری باڵای شۆخی هێرۆیەو (هێندەی باڵای تۆ خۆر ماوەیەتی ئاوا بێ.. خۆم بۆ نەگیراو هاتمە سەربانەکە، حەزت سەرشێتی کردووم و خەریکە منی برسی و ترشنۆك دیواری شەرم برمێنم ....).

بەر لەو دەمەدەمی زەردەپەڕەوە هەفتەیەکە هێرۆ پەنجەرە گەورەکەی داخستووەو پەردەکانیشی دادرانەتەوەو گوڵە مۆرەکانی ناو هەردوو ئینجانەکەی بەرهەیوانەکەشی ئاونەداوە و خەریکە سیس هەڵدەگەڕێن و دەژاکێن.. ژیانی پەژارەیی حەمەی وا لێ کردووە ناوی ئەو جۆرە گوڵانە نەزانێت کە لە دوور وڵاتانەوە هێناویانەتە ئەم ژینگەیەو تەنیا ئاشنای گوڵەژاڵەی سەر پیارەوەکانە کە هەژاران بۆی دەڕوانن و بتوڵەتی خێزانی حەمەی کوڕە کۆنە پۆلیس و مانگانەنشینی باوکی سی دینار بێ بە گوێرەی چەند ساڵێك بەر لە ئێستا بۆتە هۆی ئەوەی هەر لەخانووە داڕوخاوە گڵەبانەکەیاندا بمێننەوەو بستە حەوشەکەیان تەنیا بنەمێوێکی تێدایە ئەویش زڕە، دیارە دەست ڕۆیشتووەکانی گەڕەك ڕوو بەڕوو پێی دەڵێن (کەی ئەم تەویلەیە تێك ئەدەن..؟)، هەقیانەو چاویان سوور بووەو بێ ئاگان لەحاڵی کەساس و داماوان و هەقتانە تێنەگەن، لە منداڵییەوە «نی‌یە»تان نەبیستووە.. هێرۆ گیان..

کەی هێرۆ وەك ئێستای تەمەن بازڵەو هەرزەکار بوو، منداڵێکی ساواو ساویلکە حەمەی دەدواند، بەر لە بیست ساڵ نەزان بوون و بێ هۆش یەکیان دەلاواند (ئای کە سەرمەستی ئەو ڕۆژانەم ..!) چونکە (هێرۆ تۆ هەر بەڕواڵەت لەگەڵ ئەوان بوویت) کە بەمنیان دەووت (خانووەکەتان لە نێو ئەم گەڕەکە هەر دەڵێی دوومەڵە .... ئای لە عەقڵیان ..! چی نازانن خۆیان دوومەڵن) بۆ جاران پێکەوە وا بووین و (بیرتە ئەو جارەی کە لێم پرسیت .. لەوەناچێ ئەم گوڵانە سیس بن .. هەروا دەمێننەوە؟..

حەمە کەی تۆ لە دڵما مردیت ئەوسا ئەم گوڵانەش وەك خۆت دەمرن)....

(ئەی ئێستا کوانێ؟ بۆ پەنجەرەکەت داخستووە؟ بۆ نایکەیتەوە؟ واهەست دەکەم هەموو پەنجەرەکانی دونیا لە ڕووما داخراون.. تۆ بڵێی سەفەرتان کردبێ.. هێرۆ گیان.. چی وای لێ کردی خۆت بەند بکەی..؟ تۆش وەك زۆربەی کچانی ئەم وڵاتە نەخۆشیت..) بەبێ ئاگاو خۆنەویستی خۆت دەت خەنە داوی دەڵێنەوە، سروشتی خۆشەویستیت لە بیردەبەنەوە، لەتەك شەقڵی ژیانی خۆیاندا ڕاپێچت دەکەن بۆ ناو پێ خەفێکی تاڵ زێرینی پڕ خشڵ و دراو، دۆبڕ لە سۆزی ئەوین، مەودای نێوان تۆو خۆشەویستی بە دیواری ئاسن بەربەست دەکرێت، دەت کەنە لاشەیەکی بێ گیانی ناو قاسەیەکی داخراو (تۆشیان کڕی .. تۆش وەك ئەم گوڵە بە دەستیانەوە سیس دەبێت.

هەڵدەوەرێی..!) لەتەك گوڵەی سیسەڵدا کە (هەڵیان وەشاندووی) ناپەرژێیتە سەر ئاودانی گوڵەمۆر نیشانی خۆشەویستی و هێندەش دڵت وەك (ئەو کوڕە شووشەییانەی کە لەهەتاوی هاوین خۆیان دەشارنەوە) ناسك دەبێتەوە لەوانەیە بەبای ساردی باگۆڕکێیەکی هاوینە چ جای سەرماو بەستەڵەکی ڕێبەندان و چلەی زستان تووشی ڕەقیتەو گرفتێك ببن و ئیشتهاتان هیچ نەبات و وەك زەرداوی نێو پێکی سەر مێزی مەرمەری بازنەییتان ڕەنگتان وردە وردە زەرد هەڵگەڕێو ئاکام لە شێوەی گوڵە کزەڵی نێو ئینجانەکان شین و مۆر هەڵگەڕێن و بەرگەی کزەبایەك نەگرن و گیانتان تامەتایە خەفە بکرێت و هەر بە زیندوویی ڕەنگی مردوویی لەهەناوتان دەنیشێت و ویژدانتان لێ دەتۆرێت (پێم بڵێ تاکەی ئەو گوڵەمۆرانە ئاو نادەی؟ کێ دڵی دێ گوڵ بکوژێ؟.. ئای لە بێ زەوقی ئێوە، هەموو شتێکتان هەر بە جوانی گەش و گەرمی دەوێ ، کەپیر بوو ..!

کەسیس بوو فرێی دەدەن، عومری هەموو حەزو جوانییەك لاتان کورتە) .

هێندە نووسەر لەئەزموونێکی کەسێتی خۆیەوە یان دەوروبەری هەست پێکراوەوە چۆتە ناو بێخی خودی خۆیەوەو بەجۆرێکی وا پێی لە واقیعی ژیانەکە داگرتووە جاروبارێك وای لێهاتووە لە ووتووێژی خۆبەخۆی (حەمە) خۆیدا پای بخرێتە بەرەو روخاندنی ورەی خۆی، چونکە ئەو هەستە دەروونیە قووڵەی خۆی هێندە کاریگەر بووە بۆ سەر باوەری وای لێ کردوە مرۆڤ نەفرەت لە خۆی بکات و مامەڵە لەتەك قیروسیادا بکات لە نێو موعانات و تاڵی و بێبژێویدا خۆی لەگەش بینی تەواو بێبەش کردووەو چۆکی داداوە چش چی دەبێت بابێت.. وا باشتربوو دانەر لەو بۆتە ئاگرینەی سۆزی نێو دڵی یان با بڵێم هەست و هۆشی نێو مێشکی کەمەکێك ئەندێشەی بەیەدەستی برەواندایەتەوە بەرەو بڕوایەکی پتەوی توانستەکانی مرۆڤ و گۆردران بەباری دەست تێوەردانی چیرۆکنووس لەو جۆرە هەڵوێستانەدا دەربارەی رووداوەکانی ناو کۆمەڵگە بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە پیرۆزەی کە ئاواتی زۆربەی خوێنەر نەپسێت...
وە هەر لێرەشدا کە باسی ئەو ئەندێشە دژوارو سەختەش دەکەم کە لەرادە بەدەر بۆتە خولیای نووسەر، لەهەمان کاتدا دان بەوەشدا دەنێم خاوەن دەق دەستەوسان رانەوەستاوەو گەراوە بە دووای هێزێکی سەربەستی گەورەدا کە لە ناخی مرۆڤدا رووواوە دەیەوێت سەرانسەری کۆمەڵگەی نوێخواز قوتاری بێت لەدەست ئەو داب و نەریتە کە نەفتانەی باوبوون و ئێستاش بەوشکەڵی هەر لەبەرەودان و کەسانێکی گەرمکە پێبەجەرگی خۆیاندا بنێن و خۆیان لەو هەلانە هەڵبوێرن بەشانازیەوە پێشوازی لە ئەمینداری بەدڵ بکەن، بۆیەکا لەخۆرا ئەو هەڵچوونە دەروونیە ئاڵۆزەی دەرنەبڕیوە چنینی چیرۆکەکەی لەسەر بنچینەی بیرکردنەوەیەکی پڕ هەستی بێ کووڕو خێچی دارشتووەو راستیو (واقیعی)یەتێکی نێوان خۆیو کۆمەڵەکەی بە واتای خۆشەویستی لەبەین نەبردووەو خۆی نەداوە بە دەم بوارێکی رێ نەبەدی تابەو جۆرە ئەوینە بەهیوا نەگەیشتن بتلێتەوەو سەرەنجام وەك گێژەنە سەری سوڕ بخوات فرێی بدەنە ناو گەورگی لاشانی کێوانی سەختەوە لەوەرزە زریانێکی زۆزاندا تا بەستەڵەك دایپۆشێو نەتوانێ خۆی وەدەربێنێت.. ئەوەتا بۆ پەی پێبردنی چارەسەری هەمیشەیی سەرەنجامی ئەو مەراقەی لێبۆتە ئەندێشەیەکی دژوارو گەران بە دووای نهێنی باری سایکۆلۆژی مرۆڤ و بگرە ئەو دیو دەروونیشەوە تەنانەت خۆبەخۆی خۆی لەو تولەرێ ئاڵۆزە کە بووبووە خولیای سەری پێش بینیو پێش هاتی ئەوەی دەکات کە هەر سەر رێی رۆشن دەدۆزێتەوەو دڕ بە گشت ناهەمواریەك دەدات و هەڵوێستە نامۆو نابەجێیەکانی بەجۆرێك رەت دەکاتەوە ورەی خوێنەر لە کۆتایی چیرۆکدا لە دامێن و بنارەوە هەڵدەکێشێت بەرەو کۆپی بڵندی سەرفرازیو چارەسەری گشت گرفتێکی لە ئاسۆیەکی گەش و رووندا دەنەخشێنێت و هەر والابوونی ئەو گرفتەو وازبوونی ئەو گرێیەشە.

کە بۆتە ناوەرۆکێکی تۆکمەی چیرۆك (بەنێو دڵ و کەلاوەو کۆلانی هەژارەکان دا گەرام .. سەدەها سەدان لاپەرەی زەردو رزیوم هەڵدایەوە.. نهێنی مەرگی گوڵە مۆرەکانم دۆزییەوە.. بۆیە لەگەڵ ئەو هەموو ترس و خەم و گریان و شەرم و کۆتایی و دەست لێك بەردانەش ناتوانێت بمروخێنێت.. دەشزانم بۆ گوڵ لەحەوشەی ئێمەدا ناروێ.. دەشزانم بۆچی ناوی ئەو گوڵەمۆرە نازانم.. بۆ ناتوانم وەك عاشقێکی دڵ تەڕ گوڵێکی مۆڕ لەیاخەی چاکەتەکەم بدەم ..؟!) کە جەمسەری هەموو رێیەکیان لێتەنیم و تۆش (پەنجەرەکەت نەکردەوەو.. نایکەیتەوە.. گوڵەمۆرەکانیش ئاو نادەی.. ها) کەوابوو دووا بڕیاری منیش (ماڵئاوا ئەی گوڵە دڵگیرو تینوەکە..ماڵئاوا ئەی گوڵەمۆرە مردووەکە.....).

دەبرۆ باهێرۆ تۆو ئەوانەی باوو دەستووری ژیانیان وەك نموونەی تۆن، دەبا زەوتتان بکەن و بتان کەنە سواڵەی نێو لەپی خۆیان و وەك تیکەچەورە قوتتان بدەن چونکە ژیانی دوور لەسۆزی خۆشەویستی کەتنێکە ژیانە راستەقینەکەی مرۆڤایەتی پێ لەبەین دەبرێ.. ئیدی (ماڵئاوا ئەی گوڵە مۆرە مردووەکە) کۆتایی تۆیەو سەرەتای گیان و ژیانێکی سەربەست و زیندووی منە.



# تۆماری ڕەش ...!

محمد امین پێنجوێنی
گوڵان - ۱۹۸۹

هەرکە (نیرۆن) سەرمای دەبوو
لەبەر تینی ئاگری (ڕۆما)
خۆی گەرم و گوڕ دەکردەوە!
(نیرۆن) لەژێر خاکا ڕزی
ئەوا ڕۆما
بووە بە بووکێکی ئەورووپا!

★ ★ ★

(کالیگۆلا) هێند چڵێسی زاوایی کرد
دەرگای هەموو کۆشکەکانی بۆ ئەخرایە
سەر گازی پشت !
کچە نە باڵقەکانی
بەخۆی لەخۆی مارە دەبڕی !!
ئەسپەکەشی ئەندامێ بوو لە پەرلەمان!
(کالی !) ئەمڕۆ داستانی نەفرەتی‌یە
لەسەر شانۆ!
بەبێ بنی گەورە بوون ژاکاوەکان !؟

★ ★ ★

(بەهرامی گۆڕ) بە ڕۆژوو بوو
گۆشتی (گۆڕ) بوو بەربانگەکەی!
(خەیام) هەموو تاج و تەختی
ئەو سوڵتانەی
بە دێرە شیعرێ سارێژ کرد !!

★ ★ ★

لەشکری ئەگریسی مەغۆل..
هەرجار تێنوو بێ ئازووقە دەمانەوە
خوێنی ئەسپەکانی خۆیان
بەقامیشان هەڵدەمژی!
(جەنگیز) نوقمی زۆنگی مێژوو!!
وا لە جفزی پەلەقاژە پەرەی ڕەشە!
ئەسپی ڕەسەن لە (ڕایسیس)دا
گرەوی خۆی دەباتەوە !!

★ ★ ★

(هیتلەر) ویستی بە گوریسی نازیزم
گۆی زەوی بە کۆڵی کۆمیا بدا
خاچی شوم و گوریس پواو
بە زنجیری دەبابەیەك سوور هەڵگەڕاو!
ونجر ونجر... هەپروون.. هەپروون!

★ ★ ★

شا عەباسی سەفەوی
هەردوو چاوە شینەکانی

کوڕی خان ئەحمەد خانی
.خستە قاڵبی کەلا شووشە!
هەتا کورمکەی
هەڵماتێنێکی پێ بکا!
(یەسو ئاسکە) لە ڕقی شا
سکی خاتو کلاوزەری لەجێ پڕکرد!!
★ ★ ★
(هۆلاکۆ) بەستێکی لە کتێب لەناو دیجلەدا
هەڵچنی وەك بناوان
لاقەی هەموو ئافرەتەکانی بەغدایشی کرد!
پیت و پەراو لەتەك ئاودا بوونە لیتە
لەگەڵ هەڵما چوونە ناو هەور
(هۆلاکۆ) لە تینویتی ویژدان دا خنکا!!
★ ★ ★
(ڕۆکفلر) سکێچی پیکاسۆی نەمری
بە ملیۆنان دۆلار کری
بۆ نەنگی لە پێشاوا هەڵیئەواسی!
ڕژێمی پول بۆگەنی بوو!
(پیکاسۆ) بوو بە بلیمەتی سەدەی بیست!!
★ ★ ★
کە هێرشی (شەومزمنگ) هات
پارسای چل حوشتر (ئەدەبیاتی)
لە پێستی ئاسك نووسراوی
لە ئەشکەوتی هەزار مێردو هەورامان
سووتاند!
کەلەبەرێکی گەورە لە مێژووی کوردەواریا
بەدی هات و مێژوو نووسانی خەساند!
★ ★ ★
(بۆکاسا) جەرگ و دڵی منداڵی ساوای
ئەخستە فرێزەر بۆ پارشێو!!

گڵۆپەکانی پاریس لە قێزیانا
لێی نووستن چاویان لێ نووقان!!
لە فرۆکەخانە پۆلیس بە تاریکی
سەگی لەخۆی و خێزانی بەردان!!
★ ★ ★
شای شاهان کە زەماوەندی سازئەدا
مێشکی دە هەزار تاوس ئەکرا بەمەزە
کە لافاوی غەزەبی قین هات
ئەو شاهنشا پەهلەوییە
کونە مشکی لێبوو بە کۆشك لەم سەر ئەرزە!
★ ★ ★
کەروێشکی سپی تاقیکە
بوونە ماددەی ئەزموونگەری تەکنۆلۆژیا
کە کات ژێر باڵی ئەفرێ بۆ بیست و پێنج!!
مرۆڤ ئاژەل ئاسا لێ دەخورێ بۆ کۆز!
یان بۆ قەسابخانە
شوان دەمرێو ئاژەل هەر زاوزێ دەکا!!
★ ★ ★
مێژوو گۆڕ وەچەی یەك یاسان
زۆرداری داماو لەخۆ دەگرن
گۆڕ گۆڕەو شاری هەیە!؟
مێژووش زەلکاو!!؟

---

تێبینی:
١ـ هەر پارچەیەك نیقاعی داخلو خارجی خۆی هەیە.
٢ـ گویم بە تەسەلسولی زەمەنی نەداوە لەبەر جەمالیاتی شیعرەکە.
٣ـ گەلێ سەرچاوە دەخوێنیتەوە ئەوسا باش لێی حالی دەبی
٤ـ ئەم شیعرە پێشکەشە بۆ دکتۆر کەمال مەزهەرو دکتۆر جەمال ڕەشید.



# جاری جاران

جاری جاران پرچو زولفی دولبەران
وەك حەشارگەو لانەیەك بو بۆ دڵان
گەر بتۆری دڵ پەنا بۆ كوێ ببات
ئێستە پرچی لول هەمو هەڵپاچران
گەر لە گولزاری ببێتە نشتەجێ
لانە یەك سازكا لەسەر پۆپی چلان
بولبول ئاسا با بكا شیوەن لە باخ
با بناڵێنێ لە دەست ڕومەت گوڵان
زۆر لەمێژە گوڵ كە خۆی فێركردووە
پێكەنینی دێ بە ناڵەی بولبولان
بەختیاری ڕۆژێ گەر بوت ڕێك كەوێ
دەم لەسەر دەم دەست بخەیتە سەر ملان
لاف دڵداری بە سانا لێ مەدە
چەند سوار چاكمان لە مەیدانا گلان
پیاوەتیو مەرج و بەڵێن جاران هەبو
ماوەیكە لەم هەرێمە دەركران
ڕۆژگارتاكەی بە هیوای یارمەتیت
بەسیە تاكەی بێ بەڵێنیو تەفرەدان
خۆبرینی كۆنی دڵ سارێژ نەبوو
خوێنی لێ دەتكێ هەمیسان كەوتەژان
بەرژەوەند وا چاكە عەونی تازووە
گەر پەنابەین بۆ پزیشكێ كارزان

ο

عوسمان عەونی

كۆیە

ο

# دیسا پرسیارێت هەرونە

هیڤی بەرواری
دهوك

ئەرێ گەلۆ،
دیسا پرسیارێت هەرونە
دوبارە دکەن
بەرهنگاری بەرسڤەکا
بێ دەنگ دکەن،
جار دێ بێژن ما کەنگی‌یە
شەهیانا تە؟
چی‌یە قەلەنێ گرانی
هەژی بۆ تە
کانێ هەسپێ زین کریێ
ل بن پێ تە
دێ کەنگی خوین
شریتیا، بەرهاڤێشکێ تە
شرینیا بەرهاڤێشکێ تە
لێ ئەڤ پرسیارەنە گەلۆ
دڤێت ل هەوە بخو بزڤرن
کارا بەرسڤا وانا پر
ل ناڤ کوچك
ئو دیوانێت
هزرا وەدا ڤەپژکن
نێ دڤێت هین خازگینی‌و
داوەتی بن
دیسا هەوە چانتەو خورچك
ژ دیاری‌یاو بەرهاڤێشکا
دتژی و دبرن.. دتژی‌و دبرن
کێ دیتیە؟
ئاف ل دەڤێ زوها گەریایی
درێژە ریکی
ل بەر ریڤنگی
خو بۆ شکاندی و پێنکاڤەك ژی
ل دویڤ بەردای
کێ دیتیە؟
کرێتە قرالێ شەڤێ
ژ هەسپێ خو
پەیا بوی بێ‌ی
وەشاندنا گورزا و
کراندنا بەرا
یاکێم لبەر خورتە میرێ
رۆژێ دەمینای
دڤێت گەلۆ
ژ بۆ کرنا ڤان پرسیارا
هەست و هزرێن
هەوە بێێشن
ژ بۆ زانا وان بەرسڤا
لیڤێن هەوە
تەحلاتیێ فرکەن.. بمێژن
کە داخو ل بەر سینگێ تەڤ
نەدان و گرانە مهانا
بهە لاڤێژن
وێ گاڤێ شنیکا دێ پشت راست
شرینی‌و بەرهاڤێشکا هوین
بسەر سەرێ خوڤە هاڤێژن
دێ هاڤێژن

★ بەرهـاڤێز خەلاتەکە لدەمێ بویك گوهاستنێ خەلکێ زاڤایی ددەنە زاروکا

# بەیتا صەد مالکا نونی

مەلا نورەدینی سندی

ئەی نونو واوو.رائو ئا ،　　وەی لامو د الو یائو نون
رابەژبو خۆ کاربکە　　بێ شول تو ئیدی بەس برون
رابە ژ خەو هشیاری‌بە　　هەردەم ب گرییو زاری بە
بەس تولبن ڤی باری بە　　هاوریو هاو کارل تەچون
یەك یەك ژ تە بونەجودا　　موحتاجی بۆرینا خودا =
کەسکێ چۆ فایدەل وان نەدا　　هەر وەك ئەوان دوستەك نەبون
هەروەك کەسێ ژارو فەقیر　　کەس وان چوجا نا ئێتە بیر
چۆنو دیبار نابن لدیر　　ژینا ئەوان بەی هودەبون
ژینا عەمەل دگەل نەبت　　ل مرنی خۆدان پەرگەندەبت
بی شەکە دێ بێ جارەبت　　پێش بەرخۆدایی سەرنخون
ڤێجا دڤێت هشیار ببێ　　بوطاعەتی تو ب کاربێ
ل نەفا خۆ تو نەیاربێ　　ڤاپێنجی ژ مەرکێ تە چون
پێنجی لتەبۆرین تەمام　　هەر غافلێ ئەی بێ موقام
ژ بۆدنێ تو بەردەوام　　ڤێ پیرە پیساحەی زەبون
دونیا گەلەگ پیرەوکەڤن　　لاوی بەعاقل ژی درەڤن
هیچ ئەو لدۆر وێ ناچەڤن　　دزانن چەپیسەوە کەڤنە قون
دزانن چ ئەو بێ تالییە　　ژ راستو دروستی خالییە
بێ شەکە هەر ئەو فانییە　　دزانن ڤەوی ل پێشامە چۆن
دزانن ڤەوی ژێ چون گەلەك　　جانو جەحێلو جاڤ بەلەك
پێکڤە دگوری بون گەلەك　　لی طاری بو دونیا فەرون

دونیا لوان طاری ڤەبو　　هاورێ ژ بۆ وان قەط نەبو
ب تەنها لگورێ سوختەبو　　پوربون ژ ئاخێ وان عویون
ئەوبێ هەڤالو مەهدەرن　　بەس واعەمەل بۆ هەڤسەرن
دیلن لدەستی دەفتەرن　　کاوان عەمەل تێدا هەبون
رابە تو زادی کار بکە　　بو ئاخرەتی تو ب جار بکە
مرن کو هات باش باربکە　　بێژە فلیحیا العاملون
مرن کوها تومەل کە موت　　وێ هەر دوبی ل مەکر نەجوت
روح نالییو تشتەك نەکوت　　هشیار ببن ئەی غافلون
هشیارببە بو خۆب تنێ　　تو گوە نەدەکەڤنە ژنێ
لێکدە جهازی مرنی　　لەزکە تو هاڤا لل تەچون
تو گوە نە دەڤێ ساحرێ　　خونەدە دەستێ ماکرێ
پاشی تودێ خو ژبن برێ　　چنجیلە ئەو هەرما تو چون
وێ مەکروفەنن پر گەلەك　　من هام بها قد هەلەك
این الذین قد مەلەك　　ماتواوهم لا یملکون
کا ادمو حەوائوشین　　کانوح و ئەحیا ئو جرجیس
کانی سولەیمانو بەلقیس　　داوود دگەل وان ژێکڤە بون
ئیدریسو عیسی ژێ برن　　هارونو موسی ژی مرن
فیرعەونو هامان بن برن　　ل پێش وان ئەوێ مەقدونی بون
کاصالحو لوقمان و لوط　　کاطا طە لیسو کاطە لوت
هاروتو ماروت هەر دو جوت　　چونو دگەل وان ئەفلەطون

...يو يوسڤ ژى نەمان   جم شيدو جم جم شاى زەمان
...رو كسراى عەجەمان   روسطه موكەى خسرەو ذنون
...ى هەمى ميرو ملوك   كانێ ئەوين صاحب سلوك
...ى خودان باجارو سوك   چونو د ئەرضێ بەر زەبون
...ى ئەوێن صاحب طەريق   كانى خودان روتبەو فەريق
...ێ كورێ بوون غەريق   چونو هەمى كاسيدە بون
...عنو ئەر جاهلا   ئەر عاقلو ئەر غافلا
...كه بمرنى موبتەلا   قەط مەهدرەك ئەوان نەبون
...ى گەلو ئاغاو مير   كابەگ لەرو كانێ وەزير
...ى هەمى بينه فەقير   ئێكى ژوان روتبه نەبون
...ى هەمى ئيسيرو ديل   بێ فايدەنه هەر قالو قيل
... بوته هەر عەمەل دەليل   كاچى ژ بوته كوم ڤەبون
...ى فه بوخۆ كوم ڤەكر   ژخێرا ئەوەته دگەل خۆ بر
...لو گورا فايده نەكر   هەرد دگەل ته ژێك ڤەبون
... ئەوان دێ بى جودا   چێ پێش بەرى زاتێ خودا
...ى جەوابا خۆ بدە   ئەى رۆ رەشو ئەى سەرنخون
...ێ ئيمامێ ئەنبيا   كانێ سەروكى ئەصفيا
...ك چراغێ ئەولييا   سەروك ژ بۆ وى بەندە بون
...ێ شڤانێ ئومەتى   كامە دەرێ شەفاعەتى
...ێ هەڤالێ هيجرەتى   جونو و نعم الماهدون
...ێ عومەر كانێ عەلى   كانێ خەتەن ئێ موبتەلى
...ين بڤان بو مونجەلى   ماتوا و نعم الذاهبون
...صحابو ئال ئێك ژێ نەمان   پێكڤە دگورێ ئەو جەمان
... كەس ژوان پاشڤه نەمان   چونو ونعم الراحلون
...ێ گەلو هەر جار ئيمام   كانێ ئەوێن صاحب مەقام
...ێ برن ئەو خاصو عام   پێكڤه لڤێ رێ رستە بون
...م دزانى ڤێ هەمێ   بوچى درازێ ڤێ دەمێ
...طرس تەنينه ژ جەهنەمێ   ئەڤ شيرەته به يهودە بون
...ڤو   شەڤا طاعەت بكه   هەردمم بده نه ڤێجكا
...زانێ قيامەت بێ شكه   بوچى هەمى باشى ل تەجون

دزانێ قيامەت وا هەيه   ژينا دنێ بێ فايدەيه
مرۆڤ دەستێ بەندەيه   تەوبه بكه بێ ليڤه بون
رابه بكه دائيم عەمەل   بور شەو قوبێ سستى و مەلەل
وەختە بگەهيتن تەئەجل   دگەل دوستو يارا ژ يكڤەبون
دونيا وەكى دولا بو دور   هندەك لژير هندەك لژور
هشيار به تازه تى ببور   نێ كوره مار وەك وى نەبون
دونيا وەكى وارى بهار   چەن رۆژكا مەتى بوار
پاشى ڤەرێبون سەرشووار   تالى كوگور وارێ مەبون
دونيا ژبومه وار گەهه   تێدا دژين صالو مەهه
پاشى ئەوێ تالى نەهه   باركر ئەوى ل پيشامه چون
دونيا شەرابا هنگڤين   چەن جورعه يادێ ژێ ڤەخۆين
پاشى دبن دمردو برين   پێكڤه هەمى ئەم مردە بون
دونيا شەريتا سينەمێ   هەر وەك ڤليمێن ڤى دەمێ
ل بەر وان تو جارا بێ غەمێ   يەك يەك ژ ته رابور دەبون
دونيا دبێژێ گەشتيه   ريبار دناڤێ نشتيه
هەردەم ژ خۆبێ هيڤى يه   تا ئەو لدەريا دەرڤه بون
دەستا تو بەردە ژ ڤێ دنێ   طەلاقدە ڤێ كەڤنەژنێ
دا بەرهەمى بوخوب جنێ   ل وێ جەننەتا تازەو بژون
يارەبى ئەز بەندى تەمە   رەحمێ نەكى بێ چارەمە
دزانم كو من عەمەل كەمە   ما پاشه بو من پاشڤه چون
يارەب بحەقێ ئەحمەدى   ڤى بەندەى ئازار نەدى
توب لوطفور رەحمێ بێ حەدى   بەخشينه بەندەى دل بخون
بەخشينه بەندە سندبيه   هەردمم ئەو ژ ته ب هى ڤيه
گەروى ببخشێ ماچى يه   چبكەك ژ بەحرى كێم نەبون
چەن كەس ژ بوته ناكرن   پاشى ته ئەو ئازا كرن
برنه بهەشتێ شاگرن   تشتەك ژ رەحمێ كێم نەبون
يا خوا ببوره   ل مەهەما   رەحماته بێ گاڤو دەمه
طرسا مەظن هەر جەهنەمە   تێدا هەرو هەر كافرون
ئەى گوه دەرێ ڤى قصەتى   ئامادەنێ نەصى حەتى
يارەب نەبينێ رەحمەتێ   گەر فاتيحه ژ بو من بخون



# هەڵوێست

ئازیزەکەم
گەر تۆ نەبی
کوا دەتوانم شۆرە سواری ئەم گەردونە
تەپیوە بم ؟ !
گەر تۆ نەبی
چۆن دەتوانم هیوابینی
ئەم هێلانە تەریووە بم ؟!
گەر تۆم هەبی
وەکو هەڵۆ بەرەو بەرزایی مل دەنێم
گیانە شیرینەکەم ..
هاورێم ،
من بەبێ تۆ
هەرگیز ناتوانم بە باڵای ئازارو ژانا هەڵگەڕێم

**کەژال عەلی**

**١٩٨٧/٦/٣١**

**کەرکوک**

# چەپکێک برووسکە شیعر

●

**جەمال اسماعیل گردەسۆری**

●

## ١ـ گڕی شاعیر

گڕی ئاگر
بە ئاو دەکوژێتەوەو دەمرێ
گڕی شاعیر
بە ئازارو چەوسانەوە
گەشتر دەبێ و گڵپە دەگرێ!!

---

## ٢ـ شیرینەکان

شیرینەکان کۆبوونەوە
شیرینترین
لە خاك و ئاو
لە گیان و دڵ

بدۆزنەوە لە ڕووی زەمین
لە ئەنجام دا
بۆیان دەرچوو خاك یەكەمین !!

---

## ٣ـ من شاعیرم

ئاگرم بۆ دامەگیرسێنە
خۆم ئاگرم
بۆ نازانی من شاعیرم
خاوەن هۆش وَ هەست و بیرم
لەدڵ و گیانمە
ورەو رەوشتی باپیرم

---

## ٤ـ خۆشەویستی خاك

لێم حەرام بێ شیری داكم
گەر تف نەكەم
لەو كەسانەی
هێرش دێنن بۆ سەر خاكم !!
★★
لێم حەرام بێ شیری داكم
ئەگەر لای من
شیرین تر بێ گیان لە خاكم !!
★★
لێم حەرام بێ شیری داكم
ئەگەر لای من جیاواز بێ
خۆشەویستی داك و خاكم !!

---

## ٥ـ شاعیر نامرێ

زۆردارەكان
شاعیرێكی شۆڕشگێریان
لە زیندان كوشت
وا تێ گەیین مردو نەما
نەیان زانی شاعیری مەرد
هەرگیز نامرێ
هەردەم دەژی
هەزاران پشت !!

---

## ٦ـ چوار چرا

هەر منداڵێ
لە كوردستان
چاوی كردەوەو هاتە گۆ
كەوتە زاری ووشەی دایە
بێگومانم دووەم ووشەی
چوار چرایە !!

---

## ٧ـ شاعیرو شیعرەكانی

هەر شاعیرێ
گەر بترسێ لە شەوەزەنگ
یا لە زنجیرو لەزیندان
بێگومانم شیعرەكانی
پوچەڵ دەبن ، ناچنە دڵان !!

---

# بە تەنیا ڕێم لەبەر ناچێ

کاوەلیدا ـ ڕانیە ـ

زستانی ١٩٨٧

دەستت لەنێو دەستم بنێ . . .
ساڵەهایە من شارەزای ئەم ڕێبازەم
گەلێك سواری هەڵداشتووە . .
چاوی بە خوێنی هەزاران
ڕێبواری دیکە ڕشتووە !

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێ . .
من دەزانم ئەم ڕێبازە
چەندە ئەستەمو هەڵدێرە . . .
هەر ڕنووە بەفرە دەخزێ .
هەر گڕمەی بەردو تاوێرە . . !

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێ . .
من دار بەڕووم . . هەڵناقەنێم
لاقم لە زەوی گیرکردوون . . .
زۆر ڕەشەباو تۆفو زریان
دەورەیان داومو ڕابردوون ! . . .

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێ . .
با پێکەوە ئەم ڕێبازە . .
پڕ هەڵەتە بگرینە بەر . . .
با پێکەوە پەنا بەردێك
بکەینە هێلانەو چەپەر !

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێو
پەنجەی سڕبووم
گەرم کەوە . .
دەست لەناو دەست
بەرەو ئاسۆ
هەنگاو هەڵێنین پێکەوە ! . .

• • • .

دەستت لەنێو دەستم بنێ .
شۆخی نەشمیل
دوورە پەرێز
لێم مەڕوانە . .
بە تەنیا ڕێم لەبەر ناچێ
ئەستەمە . . . پڕ دەردو ژانە !

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێ . .
دنیا تاریکەو شەوە زەنگ . .
وەك دڵی منی ئاوارە
ئەم وڵاتە
گرتوویە ژەنگ !

• • • .

دەستت لەنێو دەستم بنێ . .
باپێکەوە
دڕ بەم شەوە زەنگە بدەین . . .

لەسەر کێکی
تەمەنی ئامانجی پیرۆز
مۆمێکی تازە هەڵ بکەین ! !

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێ . .
با گۆڕەپانی ئەم عیشقەم
فراوانو بێ مەرز بێ . .
مێرگی حەزو خۆشەویستیم
زیاتر زەنوێرو سەوز بێ . . !

• • •

دەستت لەنێو دەستم بنێ..
با نەمامی هیواو ئاسەم
چرۆ دەرکا..
کۆرپەی ڕەنجی چەند ساڵەمان
پێ ڕەوکە بێ
زیندەگیمان بەختەوەرکا
ئەی پەروەردەی ژێر دەواری
چەرمەسەری و چارە ڕەشی
ئەم ژیانە . .
زۆر دەمێکە دەستی سڕبووم .
بۆ نێو دەستتو
جەستەی ماندووم
بۆ نێو ئامێزی پڕسۆزت
چاوەڕوانە ! !

• • •

# نان

**ئاسۆ ئەحمەد**

که بانگی بەیانی لە مزگەوتەکەی ئەوسەری گەڕەکەوە بڵند بووەوە، (مام سەعید) لە مێژ بوو لە ئەستێرەکانی دەڕوانی. هەردوو چاوی لە نێو تاریکییەکەدا وەك چرای سەر لەئێوارەی ماڵە چیاییەك دەبریسکانەوە. باسکی راستی نابووە ژێر سەری و پەنگری سەرنجەکانی بە نێو ڕەشاییەکەیدەوری وەرکردبوو. لە ئێوارەوە لەسەر ئەو حاڵە بوو، تەنیا ساتێکیش پێڵووی لێك نەنابوو. بەدرێژایی شەو نەیدەتوانی تاوێك لەسەر لایەك سەقام بگرێت، بەرمکەی ژێری ببوە خاکێکی درکاوی و جەستەی دەرزیئاژن دەکر. هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی خۆ لە نێو گۆمی بێبنی خەم و غایەلەو لێکدانەوە تاڵەکان دەرهاوێژێ و کەمێك پشوو بە مێشکە جەنجاڵەکەی بدات. بە درێژایی شەو خەم و ترس و دڵەڕاوکێ کەللەسەری پیرو ماندوویان لە نێو گەردەلوولێکی سامناك دا لوول دابوو پەپوولەی وەنەوزیان لە دیدەکانی هەڵفراندبوو. بۆیە هەر هێندەی بانگی بەیانی پەردەی گوێیەکانی لەرزاند هەتا بۆی کرا پەتۆکەی لەسەر خۆی فڕێداو بە چوار مشقی لەسەر بەرمکە دانیشت دەستی لەبن بالیفەکە گێڕا کیسە توتنەکەی دەرهێناو جگەرەیەکی تێکرد، هەر زوو گریداو خۆی لە نێو دووکەڵەکەیدا وون کرد. لەگەڵ هەر مژێکیش دا ریزێك کۆکە هەناسەی لێ دەبری و خوێن دەزایە روخساری بەڵام ئەم قووڵتر مژی لێدەداو زێتر دووکەڵە تاڵەکەی هەڵ دەمژی. چاوی بە دەوری خۆیدا گێڕا، بەکاوەخۆ لە جێی خۆی هەستاو یەکە یەکە کوڕەزاکانی بەسەر کردەوە؛ (هێرۆ) پەتۆکەی لەسەر خۆی لادابوو، لەسەرمادا خۆی وێك هێنابووەوەو گرموڵە ببوو، بە هێمنی پەتۆکەی لێئاڵاندەوەو دەستی لەرزۆکی بە سەریدا هێنا. بە ئاستەم لەتوێی تاریکییەکەوە تارمایی روخساریی دەبینی، بە تاسەوە لێی ڕاما، لەسیمای تاریکیدا فریشتەیەکی نوستووی دەبینی، تا زێتریش لێی وورد دەبووەوە، خەمەکەی دڵی ئەستوورتر دەبوو. چیدی لەبەر ئەو دیمەنەدا خۆی بۆ ڕانەگیرا، لەگەڵ ئاخێکی قووڵ دا خۆی بەسەردا چەمانەوەو ماچێکی هەنیەی کرد. هەرزووش هەستایەوەو بە نەرمی بە پەیژمکەدا هاتە خوارێ. شەرواڵ و مرادخانییەکی کۆنی لەبەر کردو کڵاوو جەمەدانییەکەی بەست. بە هێوری لە ماڵ وەدەرکەوت و بەهەنگاوی گەورە بەرەو مزگەوت ڕێگاکەی پێچایەوە. هەر کە گەیشتە مزگەوت بە پەلە دەسنوێژی گرت و خۆی بەزووردا کرد. لە ژووری مزگەوت دا جگە لە (مەلا حەسەن) و (فەقێ رەشید)ی زێوان و یەك دوو پیرەمێردی خۆی ئاسا کەسی دیکەی بەر چاو نەکەوت. هەر لە نزیك دەرکەی ژوورەکەوە نوێژەکەی دابەست و مل کەچ وەستا. کە دوو ڕکات نوێژەکەشی تەواو کرد، بە نەرمیی و بێ ئەوەی سەرنجی کەس ڕابکێشێ، بەرزەبێ هەستاو پشتی لە (جەماعەت) کرد، هێشتا لە دەرکەی ژوورەکە ئاودیو نەببو، دەنگی فەقێ رەشید ئێستێکی پێکرد...

- چی‌یە مام سەعید بۆوا بەپەلەیت؟ بەم بەیانی‌یە زووە بەرەو کوێ؟

- ئیشم هەیە حەمە ڕەشید، دەبێ بڕۆم

- دە کەمێك لامان دانیشە ماڵ ئاوەدان، خۆ ئیشەکە لە دەستت هەڵنایێ، هەر پێ رادەگەیت!

- نابێ .. نا، حەمە ڕەشید. دەرەنگە، دەنا دوا دەکەوم و لە کیسم دەچێت. دانیشتنەکە هەڵگرە بۆ کاتێکی‌تر.. خواحافیز.

لە دەرکەی مزگەوتەوە بەرەو خوار بە شەقامەکەدا داکشا.

بە نەرمی هەنگاوی دەنا، ترپەی پێی لە خامۆشی‌ی دەمەوبەیان دا دەهۆڵی دوور ئاسا دەنگی دەدایەوە. شەو خێوێکی ڕەنگ قەترانی بوو، سەراپای شاری لە ژێر باڵە قورسەکانی‌دا کڕ کردبوو. هەموو شتێك سڕو بێ دەنگ بوو؛ تەنانەت درەختەکانی هەردوو بەری شەقامەکەش، گەڵاکانیان مت و بێ جووڵە بوون. لە هیچ لاوە نە چرپەیەك، نە دەنگێك نەدەبیسترا، تەنیا خرمەی هەنگاوەکانی «مام سەعید» بوو پەردەی نەستووری بێ‌دەنگی‌یەکەی دەلەرزاند. کزەی خەمێکی سارد تەزووی بە دەمارەکانی‌دا دێناو تەمی نالی ترسێکی وون لە دڵیەوە دەناڵا. دە ساڵ پتربوو، دەمەو بەیانی وا زوو بەو ڕێگایەدا گوزەری نەکردبوو. پاش دە ساڵ ئەوە یەکەم جار بوو لە توێی لێڵ و خامۆشی‌ی کازیوەوە بەو ڕێگایەدا شەقاو هەڵنێ.

لەو ڕۆژەوەی لە حەوشی ماڵەکەدا کەچە دوکانێکی دانابوو، ئیدی دەمەوبەیان ئەو ڕێگەیەی بە کوڵەوە نەگرتبوو. دە ساڵ.. دە ساڵی تەمەن.. دە ساڵی پڕ حەخارو مەینەت، هەزاران شەوی پڕ ئاخ و حەسرەت دە ساڵی تەمەن چ بۆ پیاو دەهێڵێت؟ هەموو شت دەگۆڕێت، بازوو بێ‌هێز دەکات و چاو کەم بینا، ڕوخسار پڕ دەکات لە چرچ و لۆچ و دەست و پێ دەخاتە لەرزە! دە ساڵ لەوەبەر کە بەو ڕێگایەدا دادەکشا باڵای قیت و پتەوو هەنگاوەکانی قورس و بێباك بوون. ئەوسا تەزووی خەمێکی سارد دەمارەکانی سڕنەدەکردو تۆز و گەردی ترسێکی نادیار لەڕووی نەدەنیشت.

بەڵام پاش دە ساڵ، لەو کازیوەیەدا کە بە نێو گەڕەکە نوستووەکەدا لۆژە لۆژ ڕێی دەکرد، دەیان خەم و بیرۆکەی بەئازار مێشکیان جەنجاڵ کردبوو. بێ سرەوت مژی لە جگەرە دەداو دووکەڵە خەستەکەی هەڵدەمژی. لە توێی تاریکی‌یەکەوە سیمای کوردزاکانی دەبینی، پێنج مۆمی داگیرساو بوون بەگلێنەیەوە نووسابوون. بۆ هەر لایەك سەرنجی دەگواستەوە پێش چاویان بەرنەدەداو لە بینایی وون نەدەبوون. پێنج کۆتری لانەواز بوون بەسەر پێلووەکانی‌یەوە هەڵ نیشتبوون: (هێرۆ، تانیا، ڕەوەز، ڕێباز، سۆز) هەتا قووڵتریش لێیان رادەما، زیتر گیرۆدەیان دەبووو خەمەکەی دڵی زیتر بێ‌حەجمینی دەکرد. لە ڕوخساری مات و بێ‌ڕەنگیان دا سیمای خەمناکی باوکیانی دەبینی. هەرپێنجیان بەو دەچوون، بەڵام «تانیا» کت و مت وەك بابی بوو. سێوێك بوون و دوو کەرت کرابوون بۆیە کە لە توێی تاریکی‌یەوە بوی دەڕوانی یادە نوستووەکانی بێدار دەبوونەوەو قەتماغەی زامی کۆن و نوێی هەڵ دەدرانەوە. (شەماڵ)ی کوڕە گەورەی بە خۆو چاوە مات و بزە گەشەکەیەوە لە بەردەمی‌دا زیندوو دەبووەوە، لە نۆژەن خوێن بە دەمارەکانی‌دا دەسوورا.

هەستی بە ترپەی دڵ و بۆنی هەناسەی دەکرد. دەیبینی.. هەر لاوە هێمن و سەنگینەکەی جاران بوو. (مام سەعید) لە مێژ بوو دەیزانی (شەماڵ)ی کوڕی لە سەرجەم کوڕانی گەڕەك جودایەو لە گشت هاوزێیانی خۆی گەورەترە.. قسەو گفتاری، هێمن و کارامەیی، ڕەفتارو سەنگینی‌ی، خەون و خۆزگەی، هەموو شتێکی لە کوڕانی‌تر جودا بوو. (مام سەعید) هەر لە زووەوە سووسەی زۆر شتی کردبوو. دەیزانی (شەماڵ) لە نێو پێخەف گەرم دا ڕاناکشێت چاوەڕێی جنۆکەی مەرگ بێت بە کاوەخۆ لەسەر سنگی هەڵ نیشێت و هەناسەی لێ ببڕێت. ترس و دڵەخورپەی (پیرۆز)یش هێندەی تر مەترسی‌ی لە دڵی (ئەم)دا دەچاند . بۆیە جارجارە کە (پیرۆز) سۆزی دایکایەتی‌یەکەی تاوی دەسەندو لە

(شەماڵ) دەپاراوە ئاگای لە خۆی بێت و سەری خۆی بە فەتارەت نەدات، (ئەم) لای خۆیەوە سوکنایی بە دڵ دا دەهات و خۆزگەی دەخواست (شەماڵ) قسەکەی دایکی بەجێبێنێت!

(مام سەعید) لە مێژەوە ئاگامی کورەکەی لە پێش چاو بووە دەیزانی زووبێت یان درەنگ هەر پێنج تولفەکەی (شەماڵ) هەتیو دەکەون و پەروەردەکردنیان دەکەوێتە ئەستۆی «ئەم»ی پیرو لاوازو بێ دەرامەت.

«مام سەعید» لە مێژ بوو ئەمەی دەزانی، هەر ئەو خەمەش بوو لەو تاریک و روونی بەیانەدا ملی رێی مەیدانی کرێکارانی پێ گرتبوو.

بۆ هەر لا دەیڕوانی، دیمەنی کەساسی کورەزاکانی بە گلێنەیدا هەڵ دەواسرا، پێنج چۆلەکەی بێباڵ بوون بە مەلوولی لەسەر تەلی خەیاڵی هەڵکورمابوون. دەیویست ئەو دیمەنە لە پێش بیناییدا بسرێتەوەو تاوێك لە دەست دێوەزمەی ئازار خۆ قوتار بکات؛ پێڵووەکانی لێك دەنا، هەر دوو چاوی توند دەقووچاند، دیدەی تاریك دەبوو، هیچی نەدەبینی، بەرەکەت دا بۆ ساتێك سوکنایی بە دڵ دا دەهات ، کەچی لە هیکرا گوێیەکانی بە جریوەی خەمناکیان کاس دەبوون .. جریوەی پڕ هەنسکی بێدادی...

«خۆزگە چۆلەکە دەبوون.. سەد خۆزگە! ئەوسا خەم و ئازار دڵی بچکۆلەی کرمێ نەدەکردن. گەر هەتیوو بێکەسیش بوونایە چ گرفتیان نەدەهاتە رێ، لە هەموو جێیەك دەنکە گەنم و قەترە ئاوێك هەر دەبوو تێرو پاراویان بکات. ئەوسا کاتی ئەوەیان نەدەبوو تەنیاو مەلوول هەڵکورمێن و زامی بەسوێو بەختی نەیاریان بلاوێننەوە، خەم و ئازار لە ناخیان دا گەرابخەن و برستیان لێببڕن، کۆتیان بکەن و لە جووڵەیان بخەن. نا، ئەوسا خەم دەرۆستیان نەدەهات. هەردەم لە گەشتی پڕ لەزەتی نێو هەوران دا دەبوون. بێوچان بەرەو بەرزایی هەڵ دەفڕین و بە خۆشییەوە دەیانجریواند، بێ ئەوەی لە هیچ شتێك بسڵەمێنەوە. نا.. نا.. وانییە، ئەوساش ترس و سام هەر دڵیان دەخستنە لەرزە، ترسی گوللەی راوچیو بەردی منالی چەتوون. ئەوساش دەبووا شتێك، کەسێك هەبا لێی بترسن، هێــ.. تەنانەت چۆلەکەش بەترس ئاشنایە، چۆلەکەش دەبێت فێرە دڵەراوکێو تۆقین و لە حەژمەتا لە هۆش خۆ چوون ببێ. بەڵام چ قەیدییە! خۆ لە ترس و سامەکەی لای ئێمە چاکترە. لای ئێمە بەقەد ژمارەی هەمووومان راوچیو قۆچەقانێ بەدەست هەیە. ئەگەر «شەماڵ» چۆلەکە بایە، رەنگە هەرگیز بە گوللەی راوچییان نەپێکرایە. بەڵام چ بکەم چۆلەکە نەبوو!»

گمەی کۆتری سەر ئارێلی ماڵێك لەنێو دەریای خەیاڵ و بیرکردنەوەی دەرهێنا. سەری هەڵبڕی، ئاسمان تا دەهات روونتر دەبووەوە. ئەستێرە وەك چاوی کفت و ماندووی پیرە نۆبەتدارێك هێدی هێدی پرشنگ و چریسکەیان کز دەبوو و خەفە دەبوون.

گمەی بەسۆزی کۆترەکە لە هێمنی و بێدەنگیی شەقامەکەدا دەنگی دەدایەوە، تاوێك لێی راما، یادێکی ئاڵ بزەیەکی خەمناکی لەسەر لێوانی نەخشاند...

«جارانی زوو، کە هێشتا (شەماڵ) ساوایەکی شەش حەوت مانگان بوو، هەموو بەیانییەك کە لە خەو رادەبوو، بە نەرمی.. زۆر بە نەرمی لە نێو لانکەکەیدا بە دەنگێکی ناسك گروگاڵی دەکرد، ئەو دەنگەی هەر لە گمەی کۆتر دەچوو، زۆربەی بەیانیان بەو گمە بەسۆزەی من و (پیرۆز)ی بێدار دەکردەوە.»

پڕ بە سییەکانی ئاهێکی قووڵی هەڵ کێشا و بۆ دواجار نیگایەکی وێڵی ئاراستەی کۆترە سپییەکەی سەر ئارێلەکە کرد.

ورده ورده شەقامەکە جووڵەی تێ دەگەراو شار پەردەی ئەستووری بێدەنگیو خامۆشیی لەسەر خۆی لادەدا. (مام سەعید) لە دوورەوە ئاپۆرەو پێکداهاتنی نێو مەیدانی بەدی کرد. هەستێکی سەیر بە دەرمارەکانیدا کشا، دڵی خێراتر لێی دەداو شەونمی ئارەقەیەکی سارد لە هەنیەی نیشت، لەشی داهێزرا، کلاوەی ئەژنۆی هەر هێندەنەبوو بتەقن، هەنگاوەکانی سست بوون. تا دووریی نێوان (ئەم) و مەیدانیش

کورتــتــر دەبــروەوە، دڵی زیــتــر دەلەرزیو گەواڵەی ترسەکەی ناخی قەبەتر دەبوو...

چی‌یە؟ بۆ وا دڵم کەوتوتە لەرزە؟! تۆ بڵێیت لە ترسی پاچ و خاکەناس وەشاندن یان بەردو چیمەنتۆ کێشان بێت؟ تۆ بڵێیت هێنــدە پیرو لاواز بووبم دەرۆستی ئەو جۆرە کارانــە نەیــەم ! پیریو دانــیـشتنی بەردەوامی نێــو ـوکانۆچکەکە چوار پەلیان لە کار نەخستبم!

گوایــە من .. منــی قاڵ بووی رەنــج و شەکــەتــیو ـرەقــەرشتن لە کرێکــاری بتــرسم و نەوێــرم شانی وەبەردەم؟! نا.. نا.. هەرگیز، هەرگیز من لەوە ناترسم . ئێستاش گەرچی دەست و بازووم گورو تینی جارانیان ـەماوە، بەڵام لە خۆ رادەبینم کامە ئیش سەخت و گرانە شانی وەبــەر نێم و کامە تاشە بەرد سەنگینە لەجێی خۆی هەڵکەنم.

هەر بۆ ئەوەی پێنج خونچە ئاڵەکەی (شەماڵ) زەرد نەبن و نەوەرن، هەموو کارێك دەکەم . کامە خەرەند قووڵ و سامناکەو کامە دوند سەخت و رکەیە بە گژیدا دەچم. من لە کاری گران ناتــرسم ، لەوە دەتــرسم کارم چنگ نەکەوێت و بە دەستی بەتاڵ بگەرێمەوە ماڵ. هەتا لاوی پتەوو بازوو ئەستوور وەستابن ، کێ کار بە پیرەمێردێکی سەرو ردێن بەفر دەدات؟!»

شەقاوەکان هێدی هێدی لە مەیدانیان نزیك دەخستەوە . بە روونی جم و جوڵی حەشــامــاتــەکــەی دەبینیو ژاوەژاوی کزی دەبیستن.

بۆ هەر لای دەروانی، یادو بیرەوەری لە پێش چاویدا دادەگیرسان.

د، ساڵ کەم نی‌یە، تەمەنێکە هەردوو بەری شەقامەکە ببوونە پێشانگای یاداشتەکانیو کۆمەڵێك تابلۆی رەنگاو رەنــگ ئاســا ئاوێــزانی نیگاکانی دەبوون. روخساری گەلێــك هاوڕێو برادەری رۆژانی کرێکــاری گلێنەیان رۆشن دەکــردەوە: حەمــەی مام بایــز، رەشــەی ئامە، حەســەنی حەمە لاو، رەزای شەفە چکۆل . سەرداری کەریمە لاڵ... هەندێکیان خەزان بۆ نێو ئامێزی ساردی گۆڕی بردن و زۆری دیکــەشیان زەبری رۆژگار لانەی

تێکدان و پەراگەندەی دەشت و کێوو شارانی غەریبی‌ی کردن . مام سەعید کە بە کووچەو دیوارەکانی مەیدان دا هەڵ دەروانی، هەستی بەسوێی تەنیایی‌یەکی سەخت دڵی دەگوشی.

بە ورو کاسی بە دەوری خۆیدا دەیروانی، لە گشت لاوە سیمای نامۆو خەواڵوو، هێند لەملاولا رادەما چاوەکانی مانــدوو دەبــوون.. دەکزانەوە، کەچی بێهوودە.. تاقە سیمایەکی ئاشنا نەدەکەوتە نێو تۆری سەرنجەکانی‌یەوە بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ تێکەڵ ئاپۆرەی کرێکاران بوو. کەوتــە نێــو بازنــەی دەیــان روخساری وشك و مات و جەستــەی پتەوو تێکسمراوەوە. بە بێهێزی پەلی کوتا، هەنگاوە سستەکانی جەستەی دارماویان بەرەو نێوەندی حەشاماتەکە بەکێش کرد.

لەســەر شۆستــەکــە، لە تەنیشت چەند لاوێکی بازوو ئەستووردوە راوەستا. هەستی کرد چیدی ناتوانێ خۆ بە پێوە رابگرێت. لاقەکانی دوو کۆڵەکەی رزیو بوون لە ژێر باری جەستــەی داهێــزراویدا وەك نەونــەمــامی بەر رەشەبا دەلەرزین. چاوانی رێشکەو پێشکەیان دەکردو کەللەی ورو کاس. هێنــدە نەبــوو هەرەس بێنێتە سەر زەوی‌یــەکە. خۆی شل کرد. ویستی لەسەر شۆستەکە تروشکە بکات و کەمێك جەستەی شەکەتی بحەوێتەوە. بەڵام هەرزوو بیرۆکەیەك لە کەللەیدا چووزەرەی کردو تین و برستی گێڕاوە نێو جەستەی...

**«نا.. هەڵ ناتروشکێم، قونتەراتچیو وەستا حەز بە چارەی کرێکاری سست و لەش قورس ناکەن ! نا.. هەرچۆنێك بێت نارام دەکرم . زۆر لە ئەژنۆکانم دەکەم لەشی داروخــاوم رابگــرن. دەنــا گەر جومگەو دەماری هەردوو لاقیشم لەبەر یەك بترازێن ، هەڵ ناتروشکێم . بۆ تاوێك حەوانەوە خۆم و کورەزاکانم برسیو نان براو ناکەم...»**

**سەرنجی دەدایــە دەوروبــەری خۆی: سەدان چاوی مات و بێــدار وەك چاوی هەردەم بەئــاگــای راوچی‌یان زیت و وریا، جیوە ئاسا بێ سرەوت بە هەر**

چوار لادا دەگـەران. چاوەڕێ بوون ئوتـومـبیلێـك.. ئەفەنییەك .. کەسێکی پۆشتەو بەرگ خاوێن دەرکەوێت و کاریکیان پێبسپێرێت . (ئەم)یش وەك ئەوان پەپوولەی سەرنجەکانی بە نێو مەیدانەکە وەرکردو سەراپای گیانی بووە پارچەیەك چاوەڕوانیو حەسرەت. لە هیکرا گشت سەرنجەکان بەرەو لای راست وەرچەخان؛ ئەفەنییەك بە هێمنی بۆ نێو مەیدان دەهات، بەوردی لە بالآو دەست و بازووی کرێکاران رادەما. لە چاوتروکانێك دا.. لە گشت لاوە ئابلۆقـە درا. هەر شان پان و لەش تێکسمراو بوو خۆی رەپێش دەکردو دری بەوانی تر دەدا. (ئەم)یش هەر هێندەی لدەست دەهات لە دوورەوە تەماشا بکات. زۆری نەخایاند، ئەفەنییەکە لەنێو حەشاماتەکەدا دوو کەسی مەچەك پڕو بالآبەرزی هەلبژاردو مەیدانی جێهێشت.

«ئـای خوای گەورە.. گەرووی برسیی ئەو پێنج منالە ناسکە چۆن بە من تێر دەکرێت! حالّ وابروات ناتوانم رۆژی پارووەنانێکیشیان بۆ دابین بکەم. لە کوێی بێنم؟ ئەوەی ئەمرۆ پەیدای نەکەم نیمە بیخۆم. تا ئێستا ئەوەی لە دوکانۆچکەکە دەستم دەکەوت، خەرجم دەکردو خۆم و پیرەژنــەکــەم و (ئـازاد)ی پێ دەژیـاین، خۆ داهـاتی دوکانەکە هێندەش نەبوو، چەندم دەفرۆشت منالآنیش هێندەیان لێ دەماشیمەوە، چ بکەم؟ چاوم کەم بینا بووەو هەر ئەوەندەم بۆ دەکرێ، بەلآم لەگەلّ ئەوەش دا هەر باش بوو، خۆم و پیرۆز پێی دەژیاین. خوا هەلناگرێ (ئـازاد)یش خۆی هاوینـان کار دەکـا.. هێنـدە پەیدا دەکات مەسرەفی خوێندنی زانکۆکەی مسۆگەر بکات. خۆ ئەگــەر هیــچ کاریشی نەکــردبـا من هەر مەسرەفی خوێندنەکەیم دەکرد، ئەگەر لە سبەینێ هەتا نیوەشەو رەنجم کێشاوەو ئارەقەم رشتووە ناهێلّم ئەو دەست لە خوێندنەکەی هەلگرێ، هەر ئەو تاقە خەونەم لە دنیادا وەدی هاتــووە، ناهـێـلّم ئەویشم بوەرێت. خۆ لەوەتی (شــەماڵ)ی جوانەمەرگ چۆوەتە جێی هەقی خۆی ، هەموو رۆژێك (ئازاد) ئەوەم بە گوێدا دەدات...

- بابە گیان من ناتوانم هەروا بێخەم خەریکی خوێندن بم و برازاکانیشم برسی و رووت بن.

- کورم ئەم قسانە چییە؟ کێ دەلّێت ئەوان برسی دەبن؟ ئەی من چیم، خۆ من هێشتا نەمردووم!

- بەلآم بابـە تۆ لەوەتی هەیت رەنج دەدەیت و ماندوو دەبیت ، کاتی ئەوە هاتووە بحەوێیتەوە.

- کورم قەت وا مەلێ، بابت هێشتا نەکەوتۆتە ئاویلکە. تۆ گەر دەتەوێ یاریدەی من بدەیت، گەر حەوانەوەی منت دەوێت : ئەوا خوێندنەکەت تەواو بکە.

(شـەماڵ)م لە دەست چوو، هەر تۆ شك دەبەم، تۆش ناتوەمێنم مەکەو لەو خۆزگەیەم بێبەش مەکە کە چەند سالّە خەونی پێوە دەبینم.

- بابـە گیـان ئەمــەی تۆ دەیـلّێـیـت مەحـالّە، من خوێندنەکەمم لا مەبەستە، بەلآم ژیانی برازاکانمم زێتر لا مەبـەستــە، هەرگیـز لە خۆم رازی نابم وا بێفـەرو خۆپەرست بم.

- کورم هێندەی پێ ناوێ، ناوی خوای لێبێنەو جارێ ئارامت هەبێ. ئێستـا حالّـان باشەو لە هیچ ن کەم نییە، کەی پێویستم پێت بوو خۆم پێت دەلّێم.»

(ئەم) هێشتا لە نێو غایەلەو لێکدانەوەکانیدا بالّەتەپەی بوو کە هۆڕنی لە ناکـاوی ئوتـومبیلێـك نێـو مەیدانی خرۆشـانـدو (ئـەم)یشی لە نێو گۆمی بێبنی خەیالّ و لێکدانەوە دەرهێناو سەرنجە تا مەزروکانی بۆ لای خۆی کێش کرد. کە بەرەو لای ئوتومبیلەکە روانی، نێو مەیدان بەتەواوی روون ببووەوە؛ تیشکی زیوینی خۆر گری لە دوا پەردەی رەشی شەو بەردابـوو و تەمی لێـلّی سەر گلێنەکانی (ئەم)ی رەواندبووەوە. بێکارانی نێو مەیدان هەردوو بەری شەقــامــەکــەیــان ویـك هێنـابـووەوە، ئوتـومبیلەکـە بە ئاستـەم دری بە شووڕای جەستـە ئەسـتـوورەکـان دەداو رێی تێپـەڕیـنی بۆ خۆی دەکـردەوە. (ئـەم)یش بەخۆ کەوت، خۆی خزاندە نێو ریـزەکـەوە. هیچی لێدیـار نەبـوو، شوورا بلّنـدەکەی بەردەمی مەدای بینینی گرتبوو خۆی جیرکردەوە ویستی خۆی بکوتێتە نێوان دوو کەسەکەی.

بەردەمیو دەلاقەیەك بۆ خۆی بکاتەوە، تینی دایە خۆی،

خۆی بە شانی دووانەکەدا هەڵواسی، سوور هەڵ گەڕا، هەناسەی لێبڕا، هەر هێندەی بە خۆزانی بە سیخوڕمێك فڕێ درایە دواوەو جەمەدانیەکەی کەوتە سەر زەوی. بێ ئەوەی تەنیـا ساتێـك رامێنێت، جەمەدانیەکەی لە بن هەنگڵ ناو بەرەو لای ئوتومبیلەکە تەکانی دایەوە، چاوی گێڕا.. لە بۆشایی‌یەك دەگەڕا خۆی تێ‌پەستێ. بەرەکەت دا دەلاقـەیـەك کەوتـە شووراکـەی بەردەمـی، لە هەنـاسـەیـەك دا خۆی تێ‌خـزاند، هێندەی برست لە جەستەی‌دا هەبوو، وەگەڕی خست ، تەکانی‌داو خۆی رەهێش کرد. لە گشت لاوە کەوتە بەر پاڵەپەستۆ، هێندە نەبوو بپلیشێتەوە، چوارپەلی لە جووڵە کەوت، نەیتوانی چیدی ببزوێت. لە هیکرا پێ‌یەکانی لە زەوی دابران.. بڵندبوونەوە، خۆی بە هەڵواسراوی بینی. هەستی کرد پەراسوەکانی تێك دەشکێن.

هەنـاسـەی سوار بوو، خەریـك بوو بتـاسێ.. کەوتـە پەلەقاژە.. خۆی راپسکاند .. بە تاساوی لە مەنگەنەی جەستە زبرەکان قوتار بوو.

وەختێـك پێڵوەکانی والا کرد خۆی لە بەردەم ئوتومبیلە سپی‌یە بریسکەدارەکەدا بینیەوە. سەرنجەکانی بەسەر ڕوخساری کابرای نێو ئوتومبیلە گرانبەهاکەوە ڕووان؛ سیمایەکی ساف و لووس و ئافرەتانە بە وردی بە باڵاو بازووی کرێکـاران دا هەڵی دەڕوانی، نیگـای بەسـەر ردێنی سپی‌ی مام سەعیدەوە لەنگەری گرت.. بزەیەکی تاڵ لێوەکانی پێ والا کرد...

ـ ها پیرەمـێرد چیت دەوێت؟ تۆ ناتوانیت خۆ بە پێوە رابگریت.. چت داوە لە کرێکاری؟ سەرت لە گۆڕی قەبر دەلەرزێو دەتەوێ خۆتمان بەسەردا ساغ بکەیتەوە!

دوو قاقـا لە پشت مام سەعیدەوە.. دوو کوتەك بوون و لە کەللەی پڕ گێژمەنەی دران. بە شپرێوی ئاوڕی داوە، پێش بینـایی لێڵ بوو، جگە لە کەللەی سامناکی چەنـد درنـدەیەك هیچی دیکەی نەبینی. کە سەرنجی گواستەوە سەر ڕووی کابرای نێو ئوتومبیلەکە، بزیەکی پڕ جەفـەنگ سیمای گەشاندبووەوە، بە قامکی نەرمی ئاماژەی بۆ هەردوو دەم بە (قاقا) کە کردو ئەوانیش دوو توتکی بە ئەمەك ئاسا بەدووی کەوتن.

مام سەعید لەجێی خۆی چەقی‌و بە دوو چاوی ئەبڵەق لە دووی ئوتومبیلەکەی دەڕوانی. کەللەی بووە شارە زەردەواڵەیـەکی وروژاو، دەیـان خەم و بیرۆکەو تاسـەو خۆزگـە لە بیری‌دا پێـك دا دەهاتن. گەواڵەی ترسەکەی ناخیشی تا دەهات قەبەتر دەبوو و بەنێو گشت خانەو دەمارەکانی جەستەی‌دا دەتەنیەوە.

لەو ساتـەدا بێ‌ویستی خۆی وتـەکـانی (شـەماڵ) لە یادی‌دا دەژیـانـەوە.. ئەو وتـانـەی جاران (ئـەم) بە زێدەڕۆیی‌و ئەفسانەی دەزانین و نەیدەتوانی بە قووڵی لە مانای راستەقینەیان تێ‌بگات.

ئەو وتـانـەی (ئـەم) بە زادەی کەف و کوڵ و خوێن گەرمی‌ی لاوێتی‌ی لە قەڵەم دەدان و پێی وابـوو ئەو کەسـانـەی (شەماڵ) بە درندەو مشەخۆرو بێ‌ویژدان ناوی دەبردن، لە ڕاستی‌دا هێند خراپ نین. کەچی لەو ساتەدا هەموو ئەو وتانە زۆر بە ڕوونی و بێ‌گرێو گۆڵ لە مێشکی‌دا ژیانەوەو گشت ئەو درندەیی‌و بێ بەزەیی‌و زەبـرو زەنگەی (شەماڵ) باسی دەکرد، لە پێش دیدەی (ئـەم)دا لە سیـمـای نەرم و نیـانی کابـرای نێـو ئوتۆمبیلەکەدا بەرجەستە بوو...

«ئـاخ شەمـاڵ گیـان! خۆزگـە ئێستـا لەگـەڵم دەبوویت و وەك جاران قسەت بۆ دەکردم!»

هێشتا (ئەم) لە نێو گێژاوی پێکداهاتنی بیرۆکەو یادەکانی‌دا وون بوو، دەنگێك لای راستیەوە رایچڵەکاند...

ـ مامـە گیـان گوێ مەدەیە، زویر مەبە، ئەوانە هەروان.. هیچ حسابێك بۆ هەست و نەستی ئێمەمانان ناکەن، پیرێتی و ردێنی سپی ناخوێننەوە!

مام سەعید بە تاسەوە لە ڕوخساری ماتی لاوەکە راما، نەیزانی بۆ لەو ساتەدا شێوەی لاوەکە کت و مت بە (شەماڵ) دەچوو. دەستی خستە سەر شانی‌و بزەیەکی هاتێ...

- کەسی مامی خەمت نەبێ، من باشیان دەناسم. هەرگیز لە قسەی کابرای دەوڵەمەند زویر نابم بەڵام کەمێك لە رەفتاری دوو برادەرەکەی خۆمان دڵگرانم.
پیاوێکی کامڵ لەولاوە دەنگی بڵند کردو هەڵیدایە...
- لالۆ گیان ناهەقیشیان مەگرە، بێکارن.. بێکاری‌و برسێتیش زۆر شت بە پیاو دەکەن!
هێشتا کابراکە قسەکەی تەواو نەکردبوو.. کرێکارە لاوەکە لێی هاتە وەدرام...
- وانی‌یە کاکی برا.. خۆ ئێمەش هەر وەك ئەوانین، بگرە لەوانیش حاڵمان شڕترە، بەڵام مەراییش بۆ کەس ناکەین و کوتەك لە سەری برای خۆمان نادەین.
یەکێکی تر- کورە کاکە نێوە لەوە گەڕێن.. باسێکی ئەم حاڵە ناحاڵەی خۆمان بکەن. لەشمان وا کرمێ دەبێت هێند لەم مەیدانەدا بێهوودە راوەستاین و چاوەڕێمان کرد.. یەکێکی‌تر - بە خوا کورینە حاڵ وا بروات نەك هەر ئەمرۆ.. سبەینێ‌و دووسبەی‌و داهاتووش هەروا دەبین و ئەگەر ئەمرۆ دوو پوولمان لە بەرك دا بێت و پارووە نانەکەی پێ مسوگەر بکەین، ئەوا سبەینێ ئەویش فووی لێ دەکرێ‌و دەست لە گونان دەمێنینەوە!
- بەخوا برام حاڵ وا بروات بەر مزگەوت دەبێتە جێمان و دەکەوینە سواڵ!
مام سەعید کۆڵەکەیەکی رزیو ئاسا بەلادا هات و لەسەر شۆشتەکە تروشکەی کرد، دەستێ نایە ژێر چەنەی‌و سەرنجە وێڵەکانی بە تەناف هیوایەکی دوورو تەماوی‌دا هەڵواسران...
«سواڵ! سەیرە.. چۆن تا ئێستا بیرم لێنەکردووەتەوە؟ خۆ هیچ خازۆکێکی ئەم شارە رۆژی لە دە دینار کەمتری دەست ناکەوێت.. بگرە هەندێکیان لەوەش زێتر پەیدا دەکەن. کارێکی بێ سەرمایەو بێ رەنج و ماندووبوون.. تەنیا دەستەسرێکی شڕو ئابروویەکی تکاو ویژدانێکی مردوو! ئای چەند کارێکی سانایە! بەڵام کەسی خۆی دەوێت.. ئەوە بە من ناکرێت.. بەم ئاخری تەمەنەوە من و دەرۆزە کوچا مەرحەبا، ئەو ساتەی دەست لە کەسێك پان بکەمەوە.. ئەوە دواساتی ژیانمەو ئیدی دەمرم. من ئەگەر لە نانی سواڵ بگەرامایە ئێستا رۆژم بەم رۆژە نەدەگەیشت. نا.. ئەگەر هەر پێنج کورەزاکەم بە پێش چاوی خۆمەوە وەك گەڵای پایز وشك بن و هەڵوەرن .. سواڵی پارووە نانێك لە کەس ناکەم»
خۆر تا دەهات زێتر پەنگری خۆی بە نێو مەیدان وەردەکرد، دڵۆپی ئارەقە لە تەوێڵی مام سەعیدەوە بەرەو دامێن.. بە لاجانگی‌دا رێچکەی گرتبوو. هێشتا پەپوولەی سەرنجەکانی بەسەر حەشاماتی نێو مەیدانەوە باڵەفرەیان بوو. سەری قورس و پێڵووەکانی کفت بوون، ئاسۆی روانینی لێڵ بووو روخسارەکان تەڵخ و تەماوی دەکەوتنە سەر ئاوێتەی گلێنەکانی، هەمووان پێك دەچوون.. هەمووان وەك «ئەم» شەکەت و بێزارو برسی.. نوقمی نێو تەم و دووکەڵی. جگەرە بوون. لە تۆی تەم و دووکەڵەوە کورەزاکانی دەبینی.. چاویان بەسەر مەیدانەوە روابوو، لێویان دەلەرزی‌و رەنگیان پەڕیبوو، سست و بێهێز.. لەسیما زەردو ماتەکانی نێو مەیدانی رادەمان، عەودالی پەلکە نانێك بوون ئازاری بێئامانی گەدەیان داسەکێنێ. هەموو لایەك دەگەران، سەرنجیان لە گشت کووچەو قوژبنێك دەدا، تەنیا سورمەی چاویان دەسووا و هیچی‌تر. تا دەهات زێتر کوور دەبوون، سکیان دەگوشی‌و دەتلانەوە. بینایان لێڵ دەبوو، ئۆقرەیان لێدەبراو شێتگیر دەبوون، ناخیان دەبووە دۆزەخێکی جۆش دراوو خوێنیان کەف دەکرد. هەر کە لە دوورەوە قۆنتەراتچی‌یەکیان بەدی دەکرد بە شەقاوی نەرم بەرەو مەیدان دێت : شاگەشکە دەبوون، سوور هەڵ دەگەران و دڵیان دەکەوتە سەما، لە روخساری‌دا نانیان دەبینی، نانی گەورە.. زۆر گەورە.. هێندەی ئاسمان، لە کەیفان دا پێیان وە عەردی نەدەکەوت و باڵیان لێ دەروا.
بروسکە ئاسا لە چاوترووکانێکدا دەگەیشتنە سەری‌و وەك پۆلە هەڵۆیەکی برسی شالاویان دەبرد.

**کانونی یەکەمی ١٩٨٧**

# ڕەشكێ شەڤێ

محمد حسن بنافى

دبێژن گوندەكی مرۆڤەكێ بو سلمان و سوڤ لێ بوو، هەرو دچوون مزگەفتێو نڤێژێت خوە ب جماعەت (كومەل) دكرن، چەند دماتڤە عەیشادا ژنا وی بێژیتێ: مجا مێرۆ تو بۆ خوە چ هیڤی (دعا) ژ خودێ دكەی ؟».
مێكی گوتێ: «ئـەز دبێـژم یا خودێ تو م ب چ هیلاكا نەبەی ، یا خودێ تو من ببەیە ب حەشتێ، توم ژ ئاگرێ جەهنەمێ (دوزەخێ) ب پارێزی». ژنكا وی گوتێ:ـ
ـ باشــە تو نابێـژی یا خودێ تو من ژ گەندێت ژنا ب پارێزی، ستار بكەی، گەندێت ژنكا گەلەك دمەزنن.
ـ نەوەللا چ جار ئەز وەنابێژم.
ـ ژ ئەڤرو ویڤە بۆ خوە وێ دعایێ ژی بكە.

دبێـژن دوو سێ ڕۆژ دی پێڤـە چوون ، مێرك ژ مزگەفتێ زڤڕی، ژنكا وی گوتێ:ـ
ـ جا مێرۆ تە گوت یارابی تو من ژ گەندێت ژنا ب پارێزی؟.
ـ نەوەللا ، ما دێ ژنك چ ل من كەن؟.
ـ هەی مالاتــە چ تشتێ ژڤێ مەستر نینە، بۆ خوە ڤێ دعایێ ژی بكە.
ـ وەللا پا من چ جار ئەو دعا نەكرە.
دووسێ ڕۆژ دی پێڤە چوون، ژنكێ گو تەڤە مێرێ خوە:ـ
ـ جامێرۆ تە بۆ خوە دعا نەكرن؟.
ـ نەوەللا من چ نەكرن.

ژنك ما، هزرێت خوەكرن و ددلێ خوەدا گوت: «پا ڕاوەستــە دێ حەقێ تە دمم تە». چلێ زڤستــانێیــە، شەڤەكا گەلەك سارە، بەفرو باران و هوڕەبا پێت تێكەلك بووین و گلیـزێ ب سیڤـاندالە چێبووین، ئاڤا قەرسی (جــەمــدی). ژنكێ ژی ئاگـركێ خوە هلكـر، ئاگـركێ قشكانە، قازانكا خوە دانا سەر كوچكیو هندە ئاڤ گەرم كر، مێرێ خوە هشیار كرو گوتێ:ـ
ـ هلو ڕابە جلكێت خوە بێخە ، ئاڤا گەرم كریە دابشوم، شەڤە طاریە كەس ناهێت نك مە ب گوندڤە.
ـ فلان كەس دێ مینم ڕویس.
ـ ئەڤە گلدا حازرە (ئامادەیە)، وەرە هەرە دبنڤەو دێ تە نخێمم و جلكێت تە بڤارا دادمم هەتا سپێدێ دێ ز هابن.

مێركــێ گوهــێ خوە داییێ ، ڕابــوو جلكێت خوە ئێخستن ، ژنكێ جلك ئاڤێتن د طەشتێداو شەپ شەپ ژ ئاڤێ ئینــا ، مێرك چوو دبن لحێفكێڤە، شەڤەو دینا سارە و یێ ڕویـســە خەوێ خوە ل دلی داو نڤـست. نابەینەكێ ژنك دەركەت یا بووی درەنگی شەڤ، گوندی پێت نڤستین، ب لەزو بەز ب ژوور كەت و چوو هنداڤ سەرێمێرێ خوەو گوتێ:ـ
ـ فلان كەس ، فلان كەس، ڕابە تالانی ل گوندی دا.
ـ مالێ خراپ تالانی چ ؟!
ـ ڕابە، ب خودێ نەپەز هێلا، نە حەیوان هێلا، هەوارا ژ گوندی ڤ دویركەتی، توژی ڕابە هەرە هەوارێ.
ـ ئێ مالێ خراپ نێ ئەزێ ڕویسم .... دێ كیڤە چم ؟!!!
ـ ها مالا تە چ لێ نەهـاتیێ ، شەڤە طاریە ، ماكی كێ دبینیت ؟!

تو بچی دمڤ هەڤــالێ خوەژی نزانیت كا تو یێ ڕویسی ئان یێ ب لباسی، هەما توژی دەركەڤە ڤان دركاو وەرەڤە كا چ ل دنیایێ هات؟!

- وهللا ، خەبەری تەیە.
- بەلێ بێ دار نەچی، دارەکێ باش ل گەل خوە ببە.

مێرکی شەقلەك ددەستێ خوە گرت بەژنـەکێ ب سەر سەری دکەت ئو ژ خانی دەرکەت، چاوا دەرکەت ژنکێ رەپ و دەرگەـ دائێخست و دەرگەهێ خوە باش پەچنت.

نهالێ بوو ل بەر گوندی، سەر نشیڤ چوو بۆ دەر نهالێ، گوهێت خوە ڤەچنتن چ دەنگ نە دهاتن، ل دور گوندی زڤری، نە صەیەك درەویت، نە دەنگێ مروڤەکی تێت، نە ژنکەك دئاخفیت ، چ گری ناهێت. مێرکی بۆ خوە گوت: «بـا بۆ ئەڤـە ئەزێ دینم، مالا من خراپ بوو ژ سەرمادا ئەز قەرمیم، ئەزێ رویسم کا دا بچم مالکا خوە ، چ ل گوندی نینە ، ئەڤە ژنکێ خەونەکا دیتی‌و یا ژ خەو رابووی». چوو بەردەرگەهی‌و دنگ دنگ ل دەرگەهی داو گوت:ــ

- فلان کەس ، فلان کەس.
- بەلێ .... تەخێرە؟ تو چ کەسی؟
- بابۆ دەری ل من ڤەکە مالا من خراپ بوو ، ئەزمانێ ل من شکەستی، وەسا بەفرو بارانا خودێ بێ ددەتن کەس ل بەر ناحەوهیت ، چلێ زڤستانێ‌یە، باروڤەیە، دەری ل من ڤەکە دا بێمە ژوور ، ئەز مرم.
- وەهـ .... مالێ خراپ ئەڤە بابێ بچویکا بێ دخەوە، ب خودێ هەکـە تو بابێ بچـویکـا، تویێ هاتی لێهبەکێ (حیلەکێ) ل من کەی ، ئەز دەری ل تە ڤەناکەم.
- بابـۆ ئەز فلان کەسم ، ئەز نهێ دەرکـەتیم ، ئەزێ رویسم، سەرێ ئەزبرم.
- نەخێر، تو دەروا دکەی، ئەڤە بابێ بچویکا بێ دخەوەو خرێنا وییە.

هندی هاتێ ژنك دەرگەهی لێ ڤەکەت ، چ چارە پێ نەبرن و ژنکێ گوتێ: «قەت چێ نابیت ئەڤە بابێ بچویکا بێ دخەوە تونینی».

مێرك ما هزرێت خوە کرن و گوت : «بخودێ ژنکەو یا ژخەو رابـووی، ئاقلێ وێ دسەری نینە، دابچم بێژم مەلایێ گوندی مروڤەکێ مەزنە، بلا بێت بەر دەری گازی کەتێ بەلکی دەرگەهی ل من ڤەکەت».

چوو بەر دەرگەهێ مەلای، دەرگەـ قوتا مەلای گوتێ:ــ

- تو چ کەسی؟
- بابۆ ئەز فلان کەسم ، ئەز جیرانێ تەمە.
- تەخێرە؟
- بابۆ ئەزێ دەرکەتیم دەست ئاڤەکێ، ژنکا من دەرگەهێ گرتی هندی ئەز دهێمێ ڤەناکەت، سەرێ ئەزبرم، مالا من خراپ بوو، هنـدی ئەز دبێژمێ سەکو نەخێر تویێ هاتی بۆ خوە لێهبـەکێ ل من کەی ، ئەڤە مێرکێ منێ دخەوە، نزا دین بوویە نزا وێ چیە ؟!!
- دێ راوەستە دا کارێ خوە بکەم.

مەلای کارێ خوەکـر ، گوپـالکێ خوە ددەستێ خوەگرت، ئەوی ژی خوە دابەر ئیشکێ، دا مەلا نەبینیت ، بێ رویسە، پانێ چ ل بەر نینە مەلا کەتە پێشبێ‌و گوتێ:ــ

- تو هاتی؟
- هەما هەرە ئەز دێ ددویڤ تەراهێم.

پانێ خوە نیشا نادەت، ل دویڤ پێ مەلای چوو بەر دەرگەهی گوتێ: «دێ سەیدا گازی بکە». مەلای ژی ل دەرگەهی داو گوت:ــ

- فلان کەس ، فلان کەس.

تە چ بوو؟

- هلو دەرگەهی ڤەکـە ، مێرکێ تە سەرێ بر، زڤستـانە گلیزێ ب سیڤاندافە چێ بووین.
- تو چ کەسی؟
- ئەز مەلایێ گوندیمە، مالێ خراپ ما تو من ژی نایناسی؟

هەتا ئێڤاری ئەز دەمـ جار دڤێرێرا دهێم ودچم.

- سەیدا ئەڤە مێرکێ منێ دخەوە، بابی بچویکا ئاگەـ ژ چ نینە، هشیاری خوەبی ئەو ئێکێ هاتی بۆ خوە حیلەکێ ل تەکەت.

- وەی بابۆ مێرکێ تەیە دێ چ حیلە ل من کەت ؟!!
- ئها ، ئەڤە من گوت تە، هشیاری خوە بە ..... ئان ئەو شەیطانە ئان رەشکێ شەڤێ.
- چاوا چاوا .....؟!!
- هشیاری خوەبە ئان شەیطانە ئان رەشکێ شەڤێ دێ تە دین کەت.
- بابۆ شەیطان من  یێت گولێ بووین و من یێت دیتین، بەلێ رەشکێ شەڤێ یێ چاوایە.... چ تشتە؟!!
- تو نزانی سەیدا؟
- نەخێر.
- رەشکێت شەڤێ درویسن دچملاق ، تشتەك دبەر نینە . دارەکێ ددەستا بەژنەکێ ڤ سەر سەرێ وان دکەڤێت، گوهێت وان هندە ددرێژن، چاڤێت وان دسەر ئەڤرازن ، دفنا وان هندە هندە یا مەزنە، هشیاری خوەبە دێ تە دین کەت ، ئەو رەشکێ شەڤێیە.
- یا ب خودێ ئەز چووم.

ئێدی هندی مەلا هاتێ ئەوێرا نەهو ب زڤریت نەهو، بەرێ خوە بدەتێ، یاهەکە رەشکێ شەڤێ بیت دێ کیڤە رەڤیت؟

مەلا حێبری... ژنکێ گوتێ: «کورۆ دێ گازی کێ، مالێ خراپ تو بستای» مەلا هو زڤری بەرێ خوە داینێ وەسایە هەچکو ژنکێ ژێ گوتی، ل پێش چاڤێت وی هێشتا خراپتر لێ هات. مەلا دەڤ و دەڤ کەت دگەرا ئاڤێدا، دا خەندقیت مێرکی خوە تێوەر کر ژگەرا ئاڤێ ئینا دەرێو گوت ژنکێ:-
- دەری ڤەکە مالێ خراپ مر.
- هەکە دێ ئەهدکەی ل سەر نڤێژی تو بێژی یاخودێ تو من ژگەندێت ژنا ب پارێزی دێ دەری ل تە ڤەکەم.
- ئەهد بیت ژنهە وێڤە ئەز وەبێژم، مالێ خراپ ئەز فهێت بووم دێ چ بێژم ڤی گوندی ؟! ئەز بووم خویندار.
- هەکە دێ ئەهدکەی تو چ نەبێژی من ژێ دێ ڤەکەم.
- بابۆ ئەهدبیت ئەز چ نەبێژم تەژی.

دەرگەهـ ڤەکرو گوتێ: «دێ وەرە». ژنکێ هاری کر، گاڤەکێ مەلایێ خوە بر ژوور، ژنکێ جلکێت وی دان ڤێ و مێرکی کرن بەرخـــوەو چوو هنــداف سەرێ مەلای، نابەینەکێ مەلای چاڤێت خوە زل کرن ، شەهرە دا بەرێ خوە ددەتێ یێ دخانیڤە، گوت:-
- ئەڤە ئەزێ ل کیرێ مە؟
- سەیدا تو یێ دخانیڤە، تە خێر بوو؟
- وەللا نزا؟
- سەیدا م دگوت تە بابێ بچویکا یێ دخەوە، هێ ئەڤە بابێ بچـویکا ل هنداف سەرێ تە، ئەو کارێ وی یێ کریەو جلکێت وی دشویشتینە، ب خوەهـ چیکەکا ئاڤێ ژێ نەهاتێو تەر نەبوویە، یانێ هەکە ئەو با دا دگەل تە تەربیت.... دا باران لێهێت، من دگوت تە ئەو رەشکێ شەڤێیە، هێژ تەنە دیتنە.
- ئەوەللا من رەشکێت شەڤێ نەدیتنە، ژنوی من دیتن ، ئەز خوە ل بەر ناگرم. هەچیێ ببینیت دێ وەکێ من لێ هێت.
- ئێ.... سەیدا دێ چ کەی؟ دێ ل ڤێرێ نڤی ئان دێ چی مالێ؟.
- هەکە مێرکێ تە ل گەل من بیت دێ چم مالێ. یا ئێدی ئەز نەوێرم بچم ژبەر رەشکێ شەڤێ.

مێرك ل گەل مەلای چوو، هەتا بری مالێ و زڤریڤە نك ژنکا خوە، ژنکا وی گوتێ:-
- ها فلان کەس تە خوە دیت؟
- من باش خوە دیت.
- دێ دعاکەی؟
- ئەهد بیت ل سەر هەر نڤێژەکێ ئەز وێ دعایێ بکەم.

**ئاڤر:-**

ئەڤ چیرۆکـە یا هاتـیـە تومـار کرن ژزارێ (مەجیدێ) مامێ من ل رۆژا ٥/١١/١٩٨٣ ل هیزاڤا ، لێ ئەو ب خوە، خومجهێ گونـدێ مسـیریکێیە ل قەزا سێمێلێ ژیێ وی یێ کهەشتییە (٥٨) سالێ.





# تا کوێر ببینێ

o

**نووسینی عبدالله کاخار**
**وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە**
**فاضل شەورۆ**

o

کاتی ( لە سەردانی )ئەحمەد پاڵەوان هات . جەلادەکە ، کە کورتـەبنەیەکی ورگن بوو ، سەروسەکوتی سیمای مەرگی لێدەباری ، بە هەموو هێزێکیەوە چەنگی لە شانی بەندەکەوە گیرکردو بۆ دواوەی ڕاکێشا ئازاری لێدان و ئەشکەنجەی سێ شەوو سێ ڕۆژە هێنـدە بێهێـزو کەنەفتی کرد بوو ، یەکسەر بەسەر دەستە بەستراوەکانی دا کەوتە سەر زەوی . سێ شەوو سێ ڕۆژ بوو ئەم باڵانەی سەمەندکرا بوون سڕ ببوون ، بۆیە زۆر هەستی بە ژان و ئازار نەدەکردو هەر چۆنێ بوو تینێکی دایە بەر خۆیی‌و هەستایەوە سەرپێ ، کەمێکیش باڵەکانی جولاندەوە بە هیـوای ئەوەی کە هەست بکات ئێسقانەکانی نەشکاون . کە لەمـەیش دڵنیا بوو هەستی خۆشی‌یەکی نەزانراو ڕژایە دڵیەوە هەرچـەندە چاك دەیزانی هێندەی نەماوە شمشێرەکان لەسەر مل بەرز بکرێنەوە تا بە یەکجاری سەری لە لەشا جیا بکەنەوە .

فەرمـاندەی کۆمەڵەی دژە شۆرش ، کە ئێسك گرانێکی یەکچاو بوو ، لەسەر دۆشەکێکی گوڵدار لە هەیوانی خانوێك دا پاڵی لێدا بۆوەو یەکێ لە پیاوەکانی خەریکی شێلانی قاچەکانی بوو . لەلای ڕاستیشەوە ، حەکیمێکی (هیندی) دانیشتبوو ، خاوەن حەوشەکەیش لە پشت سەریەوە دەستەوەستان ڕاوەستا بوو لە ناکاو ، فەرماندەکە شیراندی :

«ئـەی کلۆڵی خەمبـار ، ئەوە کاتی تۆیش هات ، دەی ناوی هاورێکانت بڵێ .»

خاوەن حەوشەکە ، کە وەك ئەم سەگە ترسنۆکانە بوو ، کە هەر دەوێـرن لە پشت خاوەنـەکـانیـانەوە بوەڕن ، کەوتە هەرەشـەو پەنچە ڕاوەشاندن . حەکیمی زاناش ، بە هێمنی‌و ویقارەوە کەوتە دووان بۆ فریوودانی بەندەی هەژارو داماوەوە .

هەمـوو شتێ تەیـار کرابـوو . ئەحمـەد نکـوڵیی لە تاوانەکەیەوە نەکرد بوو . فەرمانی لەسەردانی دەرچوو بوو ، چونکە کوشتنی ئیسحاقەفەندی ، دەستی ڕاستی فەرماندەی بریـەوە . دوور نەبوو ئیسحاقەفەندی هەر بە دەردەی خۆی بمردایە ، بەلام ئەحمەد پاڵەوان چاوەڕوانی ئیزراعیلی نەکرد ، هەر خۆی زوو بە تەورێك لاری کردەوە .

لە (ئـەکار) دا لە بەیەکچونێکا لەگەڵ شۆڕشگێرەکانا ، ئیسحاقەفەندی گوللەیەکی بەردەکەوێ ، فەرماندە دەی خاتە سەر زینی ئەسپەکەی خۆیەوە ، بەلام غاری ئەسپ و هەورازو نشێوی ڕێگا زۆر شپرزەی دەکەن و خوێنکی‌زۆری لەبەر دەڕوا ، شەو بەو گونـدەدا تێـدەپـەڕن کە ئەحمـەدی تیـا دەبێ ، ئیسحـاقـەفـەنـدیش زۆر دەپارێتەوە کە لە ماڵی خانەخوێکا بەجێی بهێڵن . بەلام کێ ئەم نەیارانە دەحەوێنێتەوە ؟ بریـاریـان دا کە لە ماڵی هەژارێکـا بیشـارنەوە ، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە ئەرمـەنـە سوورەکـان ـ کە بە خوێنی ئەم چەتانە تینوو بوون ـ هەرگیز گومان لەم جۆرە ماڵانە ناکەن . ماڵەکەی ئەحمەد ژوورێکی ساردو سڕ بوو و ئەحمەدیش بە هیچ کلۆجێ بەربەرەکانێی نەکرد ، بەلام هەر ئەو شەوە بە تەورێکی تیژ تیژ کۆتایی بە ژیانی ئەم چەتەیە هێنا .

- . ئەوە بوو تاوانی ئەحمەد پاڵەوان . دوای سێو پێنج شەو ئەحمەد دەسگیرکراو بۆ ئەم حەوشەیە رایان پێچا .

فەرماندەو پیاوەکانی چاوەڕوانی بیستنی دوا قسەی ئەم حەزرەت لێکراوە بوون . ئەحمەدیش کە وەکو هەڵۆ چاوەکانی بڕیبوونە ناو چاوی فەرماندەوەو قسەکانی خۆی دەکیشان ، وتی :

«گەورەم ... لەبەر هەمان هۆوە کە هانی دام ئیسحاقەفەندی بکوژم ، ئێستێکە ، جەنابتان وا من دەکوژن ، تەنیا یەك جیاوازیی هەیە : من زۆر حەز دەکەم پێش مردنم کارێکی چاکە بکەم . نەك بۆ رازی کردنی دڵی ئێوەوە ، بەڵکو بۆ خاتری خودا . هەر دوو چاوی من ساغن ، ئەگەر بیان بەخشم ، دەتوانم بە رێگایەك ، چاوە کوێرەکەی جەنابتان چاك بکەمەوە . هیچ کارێکشم لەمە باشترو مەزنتر بە خەیاڵدا نایەت .»

فەرماندە وای بۆ چوو کە ئەحمەد گاڵتەی پێ دەکات ، کەوتە جنێودان و تف و نەعلەت کردنیوە ، هەر چەندە چاك دەشیزانی کە هیچ سزایەك نیە قورستر بێ لەو سزایەی کە بڕیاری لەسەر داوە . بەڵام ئەحمەد جنێودانەکەی پێبری . ڕووی کردە حەکیم و بەهێمنیەوە وتی :

«من دەتوانم چاوە کوێرەکەی گەورەکەت چاك بکەمەوە . سا گەر بەراستی تۆ حەکیم بێت ، ئەوا لێم تێدەگەی ، خۆ گەر مرۆڤێکی مشەخۆرو چاوچنۆکیش بیت و هەر بۆ سك تێر کردن بەدوای فەرماندەت کەوتبیت ، ئەوە بە شتێم تێدەگەی .»

حەکیم بە شلەژاوییەوە تەماشایەکی فەرماندەی کردو سەری نایە بن گوێیەوەو هێندێ شتی پێوت . هەموویان ڕوویان بۆ لای ئەحمەد وەرچەرخاندو گوێگری قسەکانی بوون . ئەحمەد وتی : «حەکیمی زانا ، دەبا فەرماندە چاوە ساغەکەی دابخاو تۆیش پەنجەی گەورەتی بخەرە سەرو بیگوشە .»

دیسانەوە فەرماندە کەوتە شیراندن و جنێودان . بەڵام حەکیم لە دڵەوە ئەم کارەی پێناخۆش بوو ، چونکە ئەو ئامادە بوو گەر فەرماندە ئەم کارە قبول نەکات هەر دوو چاوی خۆی ببەخشێ تەنیا بۆ ئەوەی لەم نهێنیە سەرسوڕهێنەرە تێبگات و ئەم هونەرە فێر بێت . بۆیە ئەمجارەیش شتێکی لەبن گوێی فەرماندیدا چرپاندو فەرماندەیش داوای کرد بە قسەی ئەحمەد بکات .

حەکیم پەنجەی خستە سەر چاوی فەرماندەو ئەحمەد وتی «گەورەم ! چی دەبینی ؟» «هیچ .»

«حەکیمی زانا ، تۆ هێندێ زۆرتر پەنجەت داگرە . تۆیش ، گەورەم ، وا توند چاوت دامەخەو گلێنەکەت بێنە خوارەوە ..... باشە ، ئێستا ، تۆپی ئاگر نابینیت !؟

«با دەیبینم !»

حەکیم هەمان تاقیکردنەوەی لەسەر چاوی خۆیەوە کرد ، دوایی پیاوەکانی تریش کەوتنە چاو داخستن و گوشین . بوو بە غەڵبە غەڵب ... بەڵێ دەیبینم ... منیش دەیبینم ... کورینە ، راست دەکات ...!»

ئەحمەد وتی : «ئەوە مانای ئەوەیە کە چاوت چارەسەر دەکرێ ! فەرماندە داوای کرد لەسەر کارەکەیدا بەردەوام بێت .

ئەحمەد داوای دوو هێلکەو دوو دەنکە خورماو نیو ربە رەشکەی نان و پێنج خونچە گوڵی وشك و کەوچکێك هەنگوینی کرد . خاوەن حەوشەکە هەر بە پەلە ئەو شتانەی ئامادە کرد . ئەحمەد داوای کرد کە هەموویان بخەنە ناو مەنجەڵێکی ئاسنجاوەوەو لەگەنە ئاوێکی تێبکەن و بیکوڵێنن .

ئەمەشیان کرد .

ئەحمەد داوای کرد مۆمێك لەسەر دیواری لای چاوە کوێرەکەی فەرماندەوە دابنێن .

حەکیم بە تاسەوە پرسی :

«تۆ قەت کوێرت چاك کردۆتەوە ؟»

«خۆم نا ، بەڵام مامۆستاکەم کە پیرەمێردێکی هەشتاو سێ ساڵە بوو ، جارێ چاوی کوێرێکی چاککردەوە ، بەڵام هەر دوو چاوی خۆی کوێر بوون و دوای پانزە ساڵیش کۆچی دوایی کرد . لەکاتی خۆشیا ناوی ئەم مامۆستایەت پێدەڵێم .»

یەکێك بە کەوچکێکی دار خەریکی تێکدانی مەنجەڵەکە بوو . ئەحمەدیش چاوێکی بریبووە مەنجەڵەکەوە . دوایی داوای کرد کە بەردێکی بۆ بهێنن کە قەت ئاوی پێنەکەوتبێ .

لە جیاتی بەردێ بارێکیان بۆ هێنا ، هەر پیاوەی لچکێکی چۆغەکەی لە گاشە بەرد پڕ کردبوو . بەڵام ئەحمەد رای لە هیچیانا نەبوو . کۆمەڵێکی تریشیان بۆ هێنا ، یەکێکیان کە پێنج شەش ربە دەبوو بە چاو هەڵی بژاردو داوای کرد لایەکی بەردەکە بتاشن تاوەکو نووکی گاسنی لێ دێ ، سا داوای کرد لە

حەکیم کە. بە گیراوەی ناو مەنجەڵەکەوە هێدی هێدی تەری بکات . هەموو داواکانی ئەحمەد بێ سێو دوو جێبەجێ دەکران

بەڵام لە بەر ئەوەی کارەکەی هێندە تەمو مژاوی و سەرسوورهێنەر بوو ، فەرماندە ئارامی لێ هەڵگیراو ووتی : «دەستەکانی بکەنەوە .»

لە هەموو لایەك شمشێری هەڵکێشراو بەرزکرایەوە ، دەستی ئەحمەدیان کردەوەو سا خۆی کەوتە جێبەجێ کردنی کارەکەوە .

دوای ماوەیەك بەردەکەی بە پارچە پەڕۆیەك ووشك کردەوە . سا ووتی :

«ئێستا ، نیو دەفر خوێنی مرۆڤم گەرەکە .»

دوای ئەختی بیرکردنەوە ووتی :

«بەڵام مرۆڤێ ئامادەبێ هەر دوو چاوی خۆی لەدەست بدا ، بۆ دەبێ بەخیلی بە خوێنی خۆی بکات ؟ گەورەم ، فەرمان بدە ، با پەنجەیەکی من قووت بکەن .»

حەکیم دیسان سەری خستە بن گوێی فەرماندەوە ، خاوەن حەوشەکە بە حەپەساوییەوە تەماشای ئەحمەدی دەکرد ، جەلادەکە دەستی بە دەمی شمشێرەکەی دادەهێنا، تا بزانێ موو دەکات یان نا .

ئەحمەد پەنجەی بچووکی خستە سەر کۆلکە دارێکەوەو چاوی نووقاند . شمشێرێك وەك قەمچی ووژەی هات و کە چاوی کردەوە پەنجەکەی وەك کلکی مار لەسەر زەوی هەڵدەبەزیەوە . دەفرەکەی ناو دەستی تا نیوەی پڕ بوو لە خوێن ، ئەوسا دژاندیە سەر گیراوەی ناو مەنجەڵەکەوە . حەکیمیش تۆزێکی وەك خۆڵەمێشی بەپەنجەبڕاوەکەدا کرد تا خوێنەکەی وێستایەوە .

ئەحمەد داوای کرد لەلای فەرماندەوە باوەشە دارێك دابنێن و ئاگری تێبەردەن . مۆمەکەی سەر دیوارەکەش دابگیرسێنن . چرە دوکەڵ لە ئاگرەکەوە بەرز دەبوەوە شەماڵیش یاریی بە گڕی مۆمەکەوە دەکرد . هەر کە ئەحمەدیش دەجولایەوە ، هەرچی شمشێرو لوولەی تفەنگ هەبوون لە گەڵیدا دەجولانەوە .

ئەحمەد ووتی :

«گەورەم ! بینیت چۆن پەنجەیەکی خۆمم بەخشییەوە ، ئێستایش دەی بینی چۆن هەر دوو چاوەکانم لە دەست دەدەم. بەڵام داوایەکم هەیە ..... .»

- «ئا ... دەتەوێ لە سەرت نەدەم ؟»

- «گەورەم ! بەندەیەك ئامادەبێ چاوەکانی خۆی کوێر بکات ، ژیان و مانی بۆچییە ؟ بەڵام من زۆر دەترسم . هەر کە چاوەکەت چاك بۆوە ، پەشیمان ببیتەوەو لێم خۆش بیت !»

- «من قسەی خۆم کردووە .»

- «بەڵام ترسم لە سۆزو مرۆڤایەتیت هەیە ، گەورەم .»

- «هیچ ترست نەبێ .»

- «بەخوا هەر دەترسم ! دەترسم ئەم چاکەیە ، کارە خراپەکەم بسڕێتەوە ، بۆیە ..... .»

- «باشە ، داواکەت چییە ؟»

- «داواکەم ، توورەیی تۆیە . دەمەوێ وات توورەبکەم کەر دوای چاککردنەوەی چاوت ، سەد ساڵیش تەمەنت پێ ببەخشم . قەت لە قسەی خۆتا پەشیمان نەبێتەوەو لێم خۆش نەبێت

فەرماندە خەندەیەکی دزێوی هاتە سەر لێوو ووتی

«دەبڵێ قسەکەت چییە .»

ئەحمەد رووی لە فەرماندە وەرچەرخاندو چاوی بڕیە ئەو پیاوە پووتانەی لوولەی تفەنگەکانیان لەسەر ملی راگرتبوو ووتی

«ئەی چاو نەترسینە ! هیچ بەلاتانەوە سەیر نەبێ کە چۆن پەنجەیەکی خۆمم بۆ خاتری چاوی دوژمنێکم بەخشییەوە.

بەڵکو سەیرتان بە خۆتان بێت ، چۆن ژن و منداڵ و خوشك و برای خۆتان خستۆتە بەردەستی دوژمن و ماڵ وێرانی و کوێرەوەریتان بۆ سەر گوندەکانی خۆتانا هێناوە. کە بەنچە دەخەنە سەر پەلاپیتکەی تفەنگەکانتانەوە . ئاخر کێ دەکوژن ؟ گەر بەشێتم دەزانن . ئەوا هەمووومان هەر شێتین . بەڵام شێتی ی من لەکەڵ هی ئێوەدا جیاوازە ، من دەزانم چی دەکەم، بەڵام ئێوە نازانن ، قەیدی ناکات ، با گۆشتەکەم پارە پارە بکەن. با ئێسقانەکانیشم ووردو خاش بکەن . من دەمەوێ چاوتان بکەمەوە ، دەمەوێ پێش ئەوەی بمرم ، لە راستی ی تێبگەن . با من لە ئێوە بپرسم : کێ لە ئێوە قازانج دەکات کە بەم چەکانەی ناو دەستتانەوە ئەم کێوو دۆڵانە دەپشکنن ؟ کێ سوودی پێدەگات کە براکانی خۆتان دەخەنە ئازارو ئەشکەنجەوە ؟ کێ

ـ ـج دەكـات كە ئێـوەی جوتیـاری كارزان و نیشكـەر
كـەكانتان جێدێڵن و دەچنە ڕیزی چەتەكانەوە ؟»
فەرماندە بە هەموو هێزیەوە كەوتە جنێودان و هەڕەشە
ـ بەڵام دەنگی زوڵاڵی ئەحمەد هەموو دەنگەكانی خنكاند :
«من چاك دەزانم ئەم ورگ زل و سەر گەورانـە هەموو
ـر ـە دەست دەدەن بە لەناوچوونی ئەم چەتانە ، بەڵام پێم
ـ ئێوە چیتان هەیە لێی بترسێن و ئاخی بۆ هەڵ كێشن ؟»
ـڤ و شمشێرەكان زۆرتر لە ئەحمەد نزیك بوونەوە فەرماندە
ـرە هەستایە سەر پێ ، تا جنێوەكانی كاریگەرتر بن .
ئەحمەدیش زۆر بە هێمنیەوە ووتی :
ـ . گەورەم ، ئەمانە تەنیا قسەن ، تۆ بۆ وا پێیان پەست و
ـ بوویت ؟»

فەرماندە شیراندی :
«نا ... من داوەرمانی ئەم سەگەم ناوێ ، هەر ئێستا
ـە دەرموە .» بەڵام خێرا حەكیم سەری خستە بن گوێیەوەو
ـێكی تریش دڵی فەرماندەی نەرم كردەوەو داوای لێ كرد كە
ـمەد تاقیكردنەوەكەی جێبەجێ بكات .
ـمەد ووتی :
«دەبێ ئێستـا فەرمـانـدە سەر بەسـەر ئاگـری ئەم
ـەراوە دابگرێ و حەكیمیش بەردەكە بە دەستیەوە بگرێ .»
فەرمـانـدە سەری خۆی شۆڕكردەوە ، بەڵام دوكەڵەكە
ـر و سەغڵەتی كرد . خاوەن حەوشەكە ووتی :
گەورەم ، ئاخر ئەمە چاوت ئازار دەدا .»
ـەرماندە ووتی «چی چاوی كوێر ئازار دەدا ؟»
ـمەد ووتی : «گەر دوكەڵەكە ئازارت دەدا ، با چاوە ساغەكەت
ـستنەوە یان توند بینوقێنە .»
حەكیم ووتی : «نا ، هەر ئێستا بۆتی دەبەستمەوە .»
چاوی فەرمـانـدەیان بەستەوەو دیسان سەری بەسەر
ـكەڵی ئاگرەكەدا شۆڕكردەوە . بەڵام حەكیم نەی دەزانی چۆن
ـردەكـەی ناو دەستی رابگـرێ . ئەحمـەد داوای لێكرد كە
ـردەكـە بە ژێـر چاوە ساغـەكەیەوە رابگرێ و هێدی هێدی
ـهێنێ و بیبات . بەڵام فەرماندە ئارامی لێ براو هاواری كرد :
«بەسە ! خێراكە ... بەردەكە بدە دەست خۆیەوە با زوو
ئەجاتم بدات .»
حەكیم بەردەكەی دایە دەست ئەحمەدو ئەویش لە ژێر
چاوی فەرماندەیدا راگرت و ووتی : «هەركە مۆمەكە كوژایەوە
ئاگادارم بكەن .»
لەپێشـا وایـان زانی كە ئەو مۆمـە هیـچ ڕۆڵێكی لەم
چارەسـەریـەدا نیە . ئەحمەد كەوتە جموجوڵێكی سەیرەوە
بەبای دەستەكانی ئاگری مۆمەكە كز دەبووو دەجوڵایەوە .
لە ناكاودا مۆمەكە كوژایەوەو هاواریان كرد : كوژایەوە ...!
ئەحمەدیش بەهەموو هێزی خۆیەوە نوكی تیژی بەردەكەی ناو
دەستی چەقاندە ناو چاوە ساغەكەی فەرماندەوەو زیرەی لێ بڵند
كرد . یەك دەستـەرێـژیان لە ئەحمەد كردو چەند گوللەیەكی
بەركەوت ! خوێن بە سینگیا هاتە خوارەوە . لە هەموو لایەكا بوو
بە تەقەو فەرتەنە . چەند چەتەیەكیش بەگوللەی یەكتری كوژران
و ئاگر لە خانوەكە بەرز بووە .

لەم كتێبە وەرگیراوە :
Soviet Literature
Moscow 11 - 1961
P.P 88 - 94 .

عبدالله كاخار :

خۆشترین و جوانترین لایەنی ئەدەب و هونەر لەلای
عبدالله كاخار ـ نووسەری بەناوبانگ و بەهرەداری (یزبیك)
ـ كورتە چیرۆك بووە ، هەرچەندە جار جارە دەستیشی بۆ لای
ڕۆمان درێژ كردوە . بەڵام لە ڕۆمانەكانیشیدا خوێنەر هەست
دەكا ئەم نووسەرە لە نووسینی كورتە چیرۆكدا زۆر بە تواناو
كارزانـە . هۆیـە كەشی ئەمـیـە كە عبدالله دەستی كرد بە
نووسینی كورتـە چیرۆك لە ناوەنـدی بیستـەكـاندا ، ئەدەبی
(ئـزبیـك) تازە دەهـات چاوهـەڵێنێو پێبگـرێ . وەك كوری
ئاسنگەرێكی گەرۆك لە ناوچەی (فیرگانا) هەستی كرد كە دەبێ
یەكـێ ڕووداوەكـانـی سەردەمـی خۆی تۆمـار بكـات . لە
چیرۆكەكانی دا ـ كە زۆر كورتن ـ نەك بە ووردی لایەنی ژیان
و كەسەكانی نیشان داوە بەڵكو باسی هەموو ئەو خەڵكە دەكات
كە لە گەڵیاندا ژیاوە بەگشتی لە یەكەم ڕۆمانی (سەراب) كە لە
ساڵی (١٩٣٧) دا نووسی دەڵێ : «هیچ شتێك بەقەد ئەوە مرۆڤ
بێهێز ناكات كە هیچ هیوای بە دوا ڕۆژ نەبێت .»



# رۆڤی نكارن ببن شێر

سكڤان یوسفی
ژتیپێن لاتینی گوهاستی‌یه
وفه‌رهه‌نگوك ژێرا دانایه

هه‌بوو تونه‌بوو جاره‌ك ژ جاران، ره‌حمه ل دێ و باڤێن گوهداران، خه‌ین ژ جه‌ندرمه‌و ته‌حسیلداران.
رۆڤییه‌ك هه‌بوو رۆژه‌ك ژ رۆژان، رۆڤی چوو ناڤا دارستانه‌ك و ل نێچیرێ گه‌ریا. ڤردا چوو. وردا زڤری. ته‌وش بوو راستێ نێچیره‌ك نه‌هات. هنگی گه‌ریا به‌تلی‌و ژهێز كه‌ت.
چوو ل سیبیا داره‌ك مه‌خه‌ل كه‌ت داكو ڤاسه‌ك هێسا ببه.
پێله‌ك وسا مه‌خه‌لكه‌تی ما، هه‌و دیت كو شێر ژ هه‌مبه‌رڤه دهكه‌رت، كو چاڤێ رۆڤی ب شێر كه‌ت، هه‌ما رابوو چوو، ل پێشبه‌رێ وی راوه‌ستا، پاته ژێ راناڤێت و ب شالووزی وه‌ها گۆت:
ـ رۆژ باش میرێ من، خودێ ئومرێ ته درێژ بكه.
شێر لێ ڤه‌گه‌راند و گۆت:
ـ رۆژ باش رۆڤی، تو چ دكی ل ڤر؟
رۆڤی وه‌ها به‌رسیڤدا:
ـ ب سه‌رێ ته میرێ من. ئه‌ز برچی بوو بووم و ل تشته‌كی خوارنێ دگه‌ریيام. تشته‌ك ب ده‌ستێ من نه‌كه‌ت، ب سه‌ردا ژی ئه‌ز به‌تلیم
و ل سیبیا ڤێ دارێ مه‌خه‌ل كه‌تم.
شێر بالا خوه دایێ كو رۆڤی وسا ژارو بێقام بویا كو مرۆڤ ب پۆزێ وی بگره دێ دجی‌دا گان بده.
ژێ پرسی:
ـ ئێرا تو چما وسا ژار بوویی؟ چ ل ته قه‌ومییه؟
رۆڤی سه‌رێ خوه به‌رژێر كرو وه‌ها لێ ڤه‌گه‌راند:
ـ ئه‌ز خولام، بیئه‌دبی تێ ئه‌ز ل پێشبه‌ری ته قالا خوارنێ بكم، لێ به‌لێ ژبه‌ر كو ته پرسی ئه‌زێ بێژم.
ئه‌ڤ بوو سێ شه‌ڤ و سێ رۆژ كو ئه‌ز برچی‌مه.
ژ برچیتیێ وه‌ها هاتییه سه‌رێ من.
دلێ شێر پێ شه‌وتی. ژێ راوه‌ها گۆت:
ـ ما دهم تو برچی دمینی، وه‌ره بال من خولامییا من بكه. ئه‌ز تم و تم هه‌یوانان نێچیر دكم و گۆشتێ وان دخوم. به‌رمایی‌یا خوه ژی ددم ره‌به‌ن و به‌له‌نگازێن وه‌ك ته. تو ل جه‌م من برچی نامینی.
رۆڤی سه‌رێ خوه دانی به‌ر لنگێن شێر، ب شالووزی دووڤێ خوه هه‌ژاند:
ـ خولامییا ته ژ من را شه‌ره‌ڤه میرێ من. خوه دێ كێمیایی‌یا ته نه‌ده، ژوێ رۆژێ پێڤه، ئێدی رۆڤی بوو خولامێ شێرو ل بال وی ژییا. شێر هه‌ر رۆژ لا[illegible]ر نێچیر دكرن و گۆشتێ وان دخوار. به‌رمایی‌یا خوه ژی دداوی.
ب خێرا شێر رۆڤی تم و تم زكێ خوه تێر دكر.
كێف كێفا وی بوو. تێرا خوه گۆشت دخوار. زكێ خوه دشداند، گۆشت دگرت و قه‌له‌و دبوو دوو- سێ هه‌فته پاشێ وسا قه‌له‌و بوو وه‌ك مه‌شكه‌كا پفكری. مرۆڤ دگۆت قه‌ی ئه‌و رۆڤی یێ ژارێ چلمسی چوویه و رۆڤی‌یه‌كی دی هاتییه شوونا وی.
رۆژه‌ك ژ رۆژان شێر دیسا دهركه‌ت نێچیرێ رۆڤی ژی دا دوو وی.
لێ به‌لێ چ ڤاس گه‌ریيان ژی راستێ تشته‌ك نه‌هاتن مرۆڤی دگۆت قه‌ی ئه‌رد قه‌لشییه‌و لاور هه‌می تی‌دا چوونه خوارێ.
هه‌ردو ژی وسا برچی بوو بوون كو «قوره ـ قور» ژ زكی وان دهات.
پاشێ شێر راوه‌ستا و هاور دۆر مێزه‌كر. دیت كو دژێرێ وان را رییه‌ك دهرباس دبه.
ژ رۆڤی وه‌ها گۆت:
ـ بده په‌ی من، ئه‌م بچن سه‌ر وێ رێ هه من دێ هن

ریوی بینْ دریْرا دمرباس ببن. ئەژی لیْخم یەك ـ دو
ھەیوانیْن وان بکوژم.
ئەم بکوشتیْ وان زکیْ خوە تیْر بکن.
شیْر ب ریْ کەت روڤی ژیدا دوو وی. چوون چوون، ل
قەراخیْ ریْ کەتن ناڤا دەڤییەك وخوە ڤەشارتن. قاسەك
پاشیْ، بالا خوە دانیْ کو کاروانەك ژ هەمبەرڤە دەرکەت.
شیْر رابوو و خوە ژشیْرا. ئامادەکر.
هنگیْ بالا روڤی کەت چاڤیْن شیْر. دیت کو هەردو چاڤیْن
وی ژی سوْر بوون، بوونە مینا دو سوْتکیْن ئاگر، بژیین
وی ژی گژ بوون و مینا شوژنان تیك بوونە. روڤی ژویْ
دیمەنا شیْر رجفی و چوکیْن وی لەرزین
شیْر ژیْ پرسی کو چما کو وسا درجفە روڤی وەها
بەرسیڤ دا:
ـ ئەز ژهەیبەتاتە دترسم میْری من. هەردو چاڤیْن سوْر
بوونە، مینا دو سوْتکیْن ئاگر ...یێن تە ژی مینا شووژنان
تیك بوونە ب سەریْ تە، ژ ترسان زراڤیْ من دکە بقەتە.
شیْر لیْ ڤەگەراندو گوت
ـ دەما ئەز خوە ژ شیرەکی گران را هازردکم وەها دبە.
مە ترسە، ئەز تشتەك ب تە ناکم.
ویْ دەما کاروان گیها هنداوان. شیْر هەما مینا بایێ ژناڤا
دەڤییْ دەرکەت و ئیْرشیْ کاروان کر. قیرینەکا وسا ژیْ
دهات کو مروڤ دگوت ڤەی هەور دگور ل سەر ئیْرشا
شیْر، تەرق ب هەسپ و هیْستریْن کاروان کەت و هەریەك
ب ئالییەك ڤە رەڤییان.
ریوی ژیْ کەتن دەردیْ گانیْن خوە، دەڤ ژ هەسپ و
هیْستریْن خوە بەردان، ئەو ژی رەڤییان و خوە ئاڤیْتن
ناڤا دەڤییْن دورا ریْ. شیْر هەما گیها هەسپەك و
هیْسترەك، ددانیْن خوە ییْن تووژ دزکیْ وان دا چکاندن و
زکیْ وان ڤەلاشت، رویڤیْن وان بەرا ئەردیْ دان، ئەو ل
ئەردیْ دریْژ کرن.
پاشیْ ژی ل سەر تەرمیْن وان دانشت و دەست ب خوارنا
گوشتیْ وان کر.
دەما کو ریوییان دیت کو شیْر بلیێ خوارنا گوْشت بوو،
هەما هەسپ و هیْستر خوە ییْن مایی بەرڤ کرن، دان
پیْشییا خوە ئاژوتن و یاللاهـ، چوون هەی چوون.
شیْر قاسەك گوْشت خوار روڤی هات بیرا وی.

دەنگ ل روڤی کر:
ـ روڤی، دە وەرە لاوۆ وەرە، هەتا ژتەرا لازمە بخوە. ئەڤ
گوْشت تیْرا تەو هەفت روڤییْن مینا تەژی دکە.
روڤی ژناڤا دەڤییْ دەرکەت، چوو ل پیْشبەریْ شیْر
راوەستا، دیسا ب شالووزی سەریْ خوە بەرژیْرکرو
وەها گوت:
ـ خودیْ هیْزو قەوەت تە زیْدە بکە میریْ من ئەز
منەتکاریْ تەمە.
پاشیْ ئەوژی ل سەر تەرمیْن هەسپیْو هیْستریْ دانشت
و دەست ب خوارنا گوْشت کز روڤی، پشتیْ کو تیْدا خوە
خوارو زکیْ خوە شدانـد چوو ل ناڤا دەڤییەك مەخەل
کەت و ب بیر ئانی کو شیْر چاوا ئیْرشیْ کاروان کر، چاوا
رویڤیْن هەسپیْو هیْستریْ بەرا ئەردیْ دان و ئەو
کوشتنی، ریوی چاوا ترسا وی وەك چیْلەکەوان رەڤییان.
روڤی ئەو بوویەر ئانین بەر چاڤیْن خوەو ئەو خویانەك
ئانی بیرا خوە پیْرا ژی ل سینگا خوەو ل پیْن خوە نهیْری.
ژبەر کو تیْر گوْشت گرتبوو و قەلەو بوو بوو، کەتبوو چاڤیْ
خوە. ددلیْ خوەدا وەها گوت:
«ما نە شەرم و فەدییە ژمن را کو ئەز ب ڤیْ هیْز و قەوەتا
خوە، مینا پارسەکان ل دەستیْ شیْر دنیْرم و ب ئالیکارییا

وی دژیم. ئەز ژی وەك وی دکارم لاوران نیْچیربکم،
دکارم بچم ریا کاروانان ببرم، هەسپ و هیْستریْنوان
بکوژم و بخوم.»
روڤی ب ویْ بریاریْ رابوو، بیْ کو شیْر وی ببینە ب ریْ
کەت و چوو.
چوو چوو، ل بنیْ دەڤییەك راستیْ روڤییەك دی هات.
ئەو روڤییْ دی برچی بوو بوو. ژبرچیتیێ وسا ژار کەتبوو
کو پارسوویێن ویەکا یەك دهاتن ژماراتن. چاوا برچی
بوو بوو وسا ژی بیهیْز کەتبوو، نەدکاری ژشوونا خوە
رابە روڤییْ قەلەو کو ئەو دیت، دەنگ لیْکر:
ـ روْژ باش دوْستوْ، ئیْرا تو چما وسا ژار بوویی ؟ چ ل تە
قەومییە؟
روڤییْ ژار بەرسیڤ دا:
ـ روْژ باش براکوْ، ب خودیْ ژبرچیتیێ وەها هاتییە
سەریْ من. ئەڤ سەریْ سیْ روْژانە کو چینییەك گوْشت

ب دهڤێ من نەبوویە رۆڤیێ قەلەو وەها لێ ڤەگەراند:
- واخ واخ، رەبەنێ خودێ، نەخو تو برچیتیێ کەتی ڤی حالێ هە!
مادەم وسایە، دە رابە بدە دوو من. ئەز رۆژێ چەند لاوڕ دکوژم، گۆشتێ وان دخوم، بەرمابیا خو ژی ددم خزانا بەلەنگازێن میناتە.
تو ژی ل بال من بە، خولامیا من بکەو بەرمابیا من بخوە.
رۆڤێ ژار شاش بوو:
- مالا ڤرمکان بشەوتە ئەرێ وەللاهـ ! مالمیراتۆ، تو ژی رۆڤیەکی وەک منی! تو چاوا دکاری رۆژێ چەند لاوڕ نێچیربکی، بەرمابیا خوە ژی بدی رەبەنێن وەک من !
رۆڤیێ قەلەو خوە نەپخاند:
- ما تو بالا خوە نادی پەنج و زەندێن من ئێن قەلەو! ئەز ب خودەایێ شەف و رۆژان دکەم، ئەڤ پەنجێن من ئێن مینا گورزان ل سەرێ کیژان لاوڕکەڤن، ئەو ئێدی ل ڤێ دنێ ساخ نامینە و راست دچە چەنا کەران! رۆڤیێ ژار زێدەتر شاش بوو:
- کورۆ لاوۆ تشتێن ژسەرێ خوە زێدە مەبێژە، پاشێ تویێ ببی پێتنازکێ خەلکێ. تو ژی وەک من رۆڤیەک . ئەرێ تو قەلەو بوویی، لێ دیسا ژی تو رۆڤیی. کارێ مە رۆڤیان ژی دزیا مریشکانە.
ئەم ژبل دزیا مریشکان نکارن تشتەک بکن.
رۆڤیێ قەلەو ئێجار ژدل هێرس بووو قیریا:
- تو ژ من دەخسیو چاڤنەباری دکی لۆما تو وسا دبێژی دزیا مریشکان کارێ نەویرەک و بزدوورێن وەک تەیە.
ئەز خوە بەریایێ کارێن وسا بێرووماەت و چەپەل ناکرم. ئەز نێچیرا لاوران دکم. ئەگەر تو باوەر ناکی. ب من را وەرە، تویێ هونەرێ من و مێرانیا من ب چاڤێ سەرێ خوە ببینی.
رۆڤیێ ژار دزانە کو ئەو پەیڤێن رۆڤیێ قەلەو هەمی ڤۆرت و پەسەنێن پۆچن . لێ ژبەر کو ئەو پر برچی بوو بوو، دا پەی رۆڤیێ قەلەو و چوو.
هەردو چوون چوون راستێ ریەک هاتن.
بالا خوە دانێ کو پیرەمێرەک وایە ل کەرێ خوە سوارەو درێرادچە.
رۆڤیێ قەلەو چوو ل پێشیا کالۆ سەکنی، خوەدا ناڤ دەڤیەکا ڤەراخێ رێ و ل کالۆ پا.
رۆڤیێ ژار ژی ل تەنشتا وی راوەستا.
رۆڤیێ قەلەو ستوویێ خوە پاشتا بر، سینگا خوە پێشتا ئانی و خوە نەپخاند، قاشۆ شێلەکا شێرکیدا خوەو خوە ژسەررا هازرکر.
پاشێ ژ رۆڤیێ ژار پرسی:
- کا ل چاڤێن من بنێرە، رەنگێ چاڤێن من چاوایە؟
رۆڤیێ ژار ل چاڤێن وی نهێری. دیت کو چاڤێن وی وەک بەرێ زەرن. ژێ را گۆت کو:
- چاڤێن تە وەک چاڤێن هەمی رۆڤیان زەرن.
رۆڤیێ قەلەو دیسا هێرس بوو:
- تو دەرەو دکی . هەردو چاڤێن من ژی سۆر بوونە. بوونە مینا دو کورزێن ئاگر . دەما کو ئەز خوە ژشێرەکی گران را ئامادە دکم چاڤێن من وەها سۆر دبن . لێ تو ژ من دەخەسی دکی، تو راستیێ نابێژی.
تام دوێ دەمێ دا ژی ئەو رێویێ ئەختیار گیها هنداوان.
رۆڤیێ قەلەو هەما ژناڤا دەڤیێ هلفریباو ئێریشێ کەرێ کالۆ کر.
کو چاڤێ کالۆ پێ کەت، هەمنا دارێ خوە یێ کاشۆ بلندکرو گۆت «رەق و ل ناڤا سەرێ رۆڤی خست . رۆڤی چاوا ئەو دەرب خوار، گێژ بوو، دنیا ل دۆرا وی گەرییا، چاڤێن وی تاری بوون، چوکێن وی لەرزین ، پاشێ ژی گۆت «تەرپ، و کەت ئەردێ، ل سەر رێ مەودا دەبوو.
کالۆ کەرێ خوە ئاژۆت و چوو. پاشێ رۆڤیێ ژار هات ب لنگێن رۆڤیێ قەلەو گرت ، ئەو کشاند ناڤا دەڤیەک و ل ور ژێ را وەها گۆت:
- دەمەکێ تەدا هەبوو کو ئەڤ تشت هات سەرێ تە.
من بەرێ ژ تەرا گۆت کو «ئەم رۆڤی ئانجاخ دکارن تێکەڤن کۆخان و مریشکان بدزن، ژبل دزیا مریشکان ئەم نکارن تشتەک بکن»
بەلام تە بەپەیڤا من نەکر. تە ب چاڤێن شێران ل خوە نهێرێ لێ رۆڤی تو جار نکارن ببن شێر.
تو ژ هەدێ خوە دەرکەتی. کەسێن کو ب هالێ خوە رازی نەبن ، ژ هەدێ خوە دەرکەڤن و شوولێن زێدێ هێزا خوە بدن بەر خوە، دێ وەها بێ سەرێ وان.

«سەلاح عەبدوڵا خۆشناو»

# دەنگ لە بواری شانۆدا

لەو رۆژگـارەی کە شانۆ سەری هەڵداوە لە وڵاتی گریك دەنگ رۆڵێکی بنەرەتی گێڕاوە، تا کو ئێستاش بەجۆرەها پێوانە گرنگی پێدراوە، شانۆی کوردیش کەبەشێکە لەبزوتنەوەی شانۆی جیهانی وەکو پێویست دەنگ و هونەری دەنگ بایەخێکی ئەوتـۆی لەگـۆڤارو رۆژنامە کوردیەکاندا بەخۆوە نەدیوە. بۆیە منیش ئەم بابەتەم وەك دەست پێش خەریکە بۆ بەدوا داهاتنی بابەتی باشتر، بێگومان ئەمــەش بەهــەوڵ و کۆششی خامــەی بەبـرشتی نووسەرانی کورد دەکرێ.

**«جۆرو چینەکانی دەنگ»**

لێرەدا بەکورتی سەرەتایەك باسی جۆرو چینەکانی دەنگ دەکەین تا ئەکتەر بتوانێ دەنگی خۆی لەو جۆرو چینـانـەی دەنـگ بدۆزێتەوە، جا چ پیاو یا ئافرەت یا منداڵ. بۆئەوەی بتوانن زاڵ ببنە سەر گیرو گرفتەکانیو چۆنیـەتی دەربـڕینی دەنـگ و مەرجـەکـانی، دەبێ شارەزایـەکی سەرەتـاییـان هەبێ لەبـارەی پەیژەکانی موسیقـاو چۆنیـەتی بەرزو نزمبوونەوەی دەنگ لەکاتی نمایش کردندا.

دەنگـەکانیش بەگشتی چەند جۆرێکن، گڕێکی قوڵ یان نایەندی وەیان دەنگی تیژ یانی باریك گۆڕانی ئەو دەنگانەش دەگۆڕێ بەگوێرەی ژێیەکانی قوڕگ.

ئەمـانــەش جۆرو چینـەکـانی دەنگن لەپیاو ئافرەت و منداڵدا، لەگەڵ نموونەکانیدا:ـ

**دەنگی پیاو**:ـ بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ بەدوو بەش.

١ ـ دەنگی گڕ ـ باص ـ دەنگێکی زۆر گڕی پیاوانەیە ئەویش دوو جۆرە.

أـ گڕی قوڵ:ـ دەنـگـێـکی زۆر گڕی قوڵی پیـاوانــە کەگڕیەکەی زۆرە بۆ نموونە دەنگی (مەحمود عەلی قادر) لەدەوری (سیزەر) لەشانۆگەری. یۆلیۆس سیزەر[1].

ب ـ باریتـۆن:ـ ئەو جۆرەیان دەنگی گڕی پیاوە بەڵام گڕیەکەی کەمترە لەگڕی قوڵ. بۆ نموونە دەنگی (غازی غەفـوور) لەدەوری (بـیر لیـدەری دانا) لەشانۆگەری شاری ئەوین[2].

٢ـ دەنگی تینـۆر:ـ دەنگێکی تیـژی پیاوانە کەدەکرێ بەدوو جۆر.

أ ـ تینۆری یەکەم:ـ دەنگی زۆر تیژی ـ باریك ـ پیاوانە بۆ نموونە دەنگی (محسن محەمەد) لەدەوری (سالیری) لەشانۆگەری مۆزارت و سالیری[3].

ب ـ تینـۆری دووەم:ـ دەنگی تیـژی پیـاوانـە، بەڵام تیژیەکەی کەمترە لەتینۆری یەکەم. بۆ نموونە دەنگی (بکر مەعروف) لەدەوری (کەسی یەکەم) لە شانۆگەری، ئەخۆشی دەدان[4].




**دەنگی ئافـرەت و منـداڵ**:ـ دەنگی ئافـرەت و منـاڵ لەجـۆرو دەنـگ وەکی یەکدی دابەش دەکرێ ئەمەش بەگشتی دەکرێ بەدوو بەش.

١ـ دەنگی کۆنتـر ئاڵتـۆ:ـ واتە دەنگی گڕی ئافرەت و منداڵ، بۆ نموونە دەنگی (ئەرمین قادر) لەدەوری (زەینو



ـ کە دەچێتە لای قایمقام) لەشانۆگەری (تەنەکە)[٥].

٢ـ دەنگی سۆپرانۆ:ـ دەنگی تیژی ئافرەت و منداڵ دەگرێتەوە ئەمەشیان دوو جۆرە.

أ ـ سۆپرانۆی یەکەم:ـ دەنگی زۆر تیژی ئافرەت و منداڵە. بۆ نموونە دەنگی (شادان فوئاد) لەدەوری (ئایش) لەکاتی هاوارکردنەکەی، لەشانۆگەری گەلە گورگ[٦].

ب ـ سۆپرانۆی دووەم:ـ ئەمەیان تیژییەکەی لەسۆپرانۆی یەکەم کەمترە. بۆ نموونە دەنگی (سەمیرە عەبدوڵ) لەدەوری (دایکی حاجی) لەشانۆگەری (هاوارێك لەحاجی قادری کۆیی)[٧].




ئەمانەی کەدەرمان خست کورتەیەك بوو لەدابەش کردنی دەنگی پیاو و ئافرەت و منداڵ. لە جۆرو چینەکانی دەنگ دا ئێستاش گرنگی ئەم لایەنە لەشانۆدا دەخەینە روو.

### گرنگی هونەری دەنگ لە شانۆدا

شانۆ گەلێ لایەنی هونەری بەرفرەوانی بەخۆوە گرتوە، کاتێك بەرهەمێکی شانۆیی دەبینین ئەم لایەنانەی دەکەوێتە بەرچاو (ئەکتەر، دەقی شانۆیی، دەرهێنان، روناکی، موسیقا، دیکۆر... هتد). هەر لایەنەش لەمانە شوێنێ دیارو تەکانێکی داوەتە پاڵ سەرکەوتنی کارە هونەرییەکە کە بەرهەمە شانۆگەرییەکەیە.

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە باسی لێوە دەکەین دەنگ و هونەری دەنگە، دەنگ بە بڕبڕەی پشتی سەرکەوتنی شانۆگەری دەژمێررێ، هەندەی بۆشمان بکرێ بەقەدەر ماوە باسی گرنگی هونەری دەنگ دەکەین کە بێشك ئەمەش کەلێنێکی گەورە لەکون و کەلەبەرەکانی شانۆی کوردی پڕدەکاتەوە.

هونەری دەنگ ـ القاء ـ یان دەربڕینە دەنگییە کە ئەکتەر بتوانێ هەست و سۆزی جەماوەرو بینەر بۆخۆی رابکێشێ. گەر بمانەوێ لەو هونەرەش بگەین پەنادەبەینە بەر ئەو پێناسانەی کە بۆ هونەری دەنگ کراوە، هەموویان لەسەرچاوە یەکدی دەگرنەوە ئەویش کارکردنە لەگوێگر. کە رێنمایەکی چڕکە بۆ ئەکتەر سودیان لێ وەربگرێو شارەزاییەکی سەرەتایی هەبێ لەبارەی بەکارهێنانی دەنگەوە کە یەکێك لەبناغە هەرە بەهێزەکانی شانۆ دەژمێردرێ.

پێناسەکانیش ئەمانەن کە بۆ هونەری دەنگ کراوە:ـ

١ـ هونەری دەنگ (بریتییە لە دەربڕینی ناخ بەزمان و جولە و هێما کەلەیەك کاتدا کۆبونەتەوە و گەیاندنی ماناکەی بۆ کارکردنە لەسەر گوێگر).

٢ـ هونەری دەنگ (بریتییە لەدەربڕین و دانانی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لە رووی فۆنەتیك و ماناوە).

٣ـ هونەری دەنگ (بریتییە لە دۆزینەوەی ئەو رێگەیە کە ئەتوانرێ دەنگ و فۆنێتیك بە شێوەیەکی باش رێك

بخات و توانای گۆرانی هەبێت بە شێوەیەك بوێژ گوێگر دلخۆش بکات).
ئەو پێناسانەی کە لەسەرەوە باس کران، پێناسەی چڕۆ پڕی هونەری دەنگ بوو. لەسەرجەمی هەڵێنجانی ئەم پێناسانەش دەتوانین بڵێین هونەری دەنگ بریتییە لەو توانستە تەکنیکیە کە ئەکتەر کۆنترۆل دەکاتە سەر وشەکان، پردێکی هەست و سۆز دروست دەکات بۆ ئەوەی داواکارییەکانی ناوەوەی بۆ گوێگران بخاتە ڕوو کاری راستەو خۆیان تێ بکات.
زۆر جار دەربڕینی وشە وەیا فۆنەتیکی وشە دەتوانێ گوزارشت لەماناکەی بکات هەر وشەکیش مانایەك زێتر دەگرێتەوە خۆی بۆ نموونە دەستە واژەی (باشە باش) وە بەکارهێنانی لەچەند ڕوویکی جیاوازدا:-

١- بۆ پەسەندکردن:-
دەرهێنەر:- با بەیانی دەست بەپرۆڤە بکرێ... سەعات چوار باشە؟
ئەکتەر:- باشە باش....

٢- بۆ وەرام دانەوە:-
دەرهێنەر:- لەبیرت بێ.. سەعات چوار.. پرۆڤەیە.
ئەکتەر:- لەکوێ؟
دەرهێنەر:- لەبارەگای کۆمەڵ
ئەکتەر:- باشە باش.. لەبیرم ناچێ.

٣- بۆ هەرەشە کردن:-
دەرهێنەر:- ئەمجارە.. دەورێکی کۆمبارس وەرگرتوە.. باشە.
ئەکتەر:- کۆمبارس؟! باشە باش... قەیناکە.. بزانە جارێکی دی دەمبینیەوە؟

٤- بۆ تێگەیشتن:-
دەرهێنەر:- کاکی خۆم وریای بەرزو نزمی دەنگەکان بە... بەهەمان چین وەربگرە لە ئەکتەری بەرانبەرت، بەپێی خواستی پێشەوەچوونی ڕوو داوەکان بیگۆڕە.
ئەکتەر:- باشە باش.

٥- بۆ بەرێ کردن:-
ئەکتەر:- باشە مامۆستا ئەدی قەول نەبوو ئەمجارە دەورێکی باشترم بدەیێ؟
دەرهێنەر:- باشە باش.. کاکی خۆم.. جارێ.. بزانین لەبەرهەمی ئایندە بەڵکو..

بەکارهێنانی دەگەڵ یارو خۆشەویست گوزاریشت لەپەیمان و بەڵێن دەکات... تەنیا دەستەواژەی (باشە باش) دەتوانێ گوزارشت لەچەند لایەنێکی جیاواز بکات. سەربارى ئەمانەش ئەکتەر دەبێ پەیوەندی بەکارەکتەرانی ناو شانۆگەرییەکە بدۆزێتەوە. هەر کاتێکیش پەیوەندییەکانی بەچاکی دۆزیەوە ئەو کاتە دەتوانێ ماناکەی وەکو پێویست بگەیەنێ.
هەر ئەکتەرێك نەتوانێ پەیوەندیەکان بدۆزێتەوە ناتوانێ راستییەکان بگەیەنێ، لەم ڕووە دەبێ ئاگاداری مەبەستی راستەقینەی ڕستەبێ.

لەو چەند پێناسانەی سەرەوە کە بۆ هونەری دەنگ کران بۆمان دەرکەوت پەیوەندییەکی دیالیکتیکی هەیە لە نێوان دەنگی مرۆڤ و هونەری دەنگ ئەویش دوو لایەن دەگرێتەوە ڕێگاو مادەکە - مەبەست دەنگی سادەی مرۆڤە - هیچ جیاوازیەکیش لە نێوان ڕێگاو مادەکەدا نییە. دەنگی سادەی مرۆڤ و دەربڕین بە هەردووکیان - ڕێگاو مادەکە - پێکەوە پێی دەوترێ هونەری دەنگ، بۆ زێتر ڕوونکردنەوە دەبێ دەنگێکی باش هەبێ کە توانای گۆڕین و مەدای زۆرو خۆشیەکی تێدابێ، ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەوە دەبێ ئەکتەر هێزێکی لەبن نەهاتوی هەبێ، لە بارەی تەکنیك و ڕێگای دروست و توانای بێ پایان، ئەو توانایەی کەوادەکا ئەکتەر باری دەروونیو باری گشتی بگونجێنێ و کار لە گوێگر بکات و هەڵوێستەکان ڕوون و ئاشکرا بکات و هەست و سۆزو بیری گوێگران بۆ خۆی ڕابکێشێ و موچرکەیان پیادا

بێنێت.
ئەمەش پێویستی بەبەرزو نزم بوونەوەو گۆران و پاژدانی ,
دەنگ هەیە لە جێگای گونجاو بەشێوەی مانای رستەکان.
گەلێ نوسەرو رابەری گەورەی شانۆ باسی گرنگی
دەنگیان کردووە بۆ نموونە (ستانسلافسکی) دەڵێ
(بینەران بۆ ئەوە هاتون بۆ شانۆ تا گوێیان لەمانای
دواوەی وشەکان بێ، ئەگەر نا دەتوانن وشەکان
لەماڵەوە بخوێننەوە) دەبێ ئەکتەر زێتر گرنگی بدات بۆ
دۆزینەوەی دواوەی وشەکان، رۆڵی ئەکتەریش ئەوەیە
کە بتوانێ وشە مردوەکان زیندوو بکاتەوە. ئەوەش
دەکەوێتە سەر رادەی بۆچون و تێگەیشتنی لە وشەکان
و ئەو رێگایەی بەکاری دێنێ لەکاتی دەر برینا. ئەکتەر
کاتێك دەورێك نمایش دەکات بەزۆر هەڵوێست و باری
جیاجیا تێدەپەرێ، لەکاتی قسە کردندا گۆران روو
دەدات لەگەڵ هەست و سۆزی لە هەمان کاتدا هونەری
دەنگ دەگۆرێ ئەو گۆرانە لە خۆیەوە دێت یانی (تلقائي)
لەبەر ئەوەی دەنگ و وشەکان کار دەکەنە سەر هەست
و سۆزو دەرونی ئەکتەرەکە. ئەگەر سەرنجێك لە ژیانی
رۆژانەماندا بدەین کاتێك یەکێکی شارەزاو لێزان
نوکتەیەك دەگێرێتەوە هێندە چێژوو لەزەت بە گێرانەوەکە
دەدات وا لە گوێگر دەکات بکەوێتە سەر گازی پشت .
بەڵام با هەر هەمان نوکتە یەکێکی تر بیگێرێتەوە کە لەم
جۆرە لایەنە شێوازێکی جوان شارەزاییەکی وای نەبێ
دەبینی کەس زەردە خەنەش نایگرێ. لێرەدا بۆمان
دەردەکەوێ کە یەکەمیان ئەوەی پێی دەڵێن شارەزاو
لێهاتوو. ئەوە هونەری دەنگ رۆڵی خۆی دەبینێ لە
گێرانەوەکەی بەڵام هی دووەمیان نەیتوانێ هونەری
دەنگ بەکار بێنێ لە گێرانەوەکەی. هونەری دەنگیش هەر
تەنیا بۆ کاری هونەری بەکار نایەت. بەڵکو بۆ ژیانی
رۆژانە لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵ وە بۆ گەلێ لایەن و
بوارەکانی دی ژیان سودی هەیە. هونەری دەنگ دێت
ئەو قسە وشك و لابەلایانە رێك دەخات و بەرگێکی تازە
دەکاتە بەر وشەکان و دەربرینێکی پر بە مانا بە خۆوە
دەگرن لە کاتی وت و وێژدا کە بتوانێ گوزارشت لە
هەموو لایەنەکان بکات.

### دەنگ و ئەکتەر
### (وشە بۆ چاو نەك بۆ ئیستگە)

«شبیکن»

تا ئەکتەر لە کارەکەی سەرکەوتوبێ، دەبێ
لێکۆڵینەوەیەکی چاکی دەقەکە بکات، رستەو وشەکان
یەکە یەکە هەڵگێرو وەرگێر بکات تا بتوانێ باری
دەروونیو گشتی لەگەڵ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان
کاراکتەرەکانی ناو شانۆنامەکە بدۆزێتەوە. سەرباری
ئەبعادەکانی کۆمەڵایەتیو دەرونیو شانۆنامەکە
بدۆزێتەوە. سەربازی ئەبعادەکانی کۆمەڵایەتیو
دەرونیو سروشتی لەش و بوعدی ئابوریش لای برێخت
هەیە، وە بەکارهێنانی هونەری دەنگ لە دەربرینی لە
میانە جیاجیاکاندا، وەگۆران کاری روو بدات لەگەڵ
پێشەوە چوونی رووداوەکانی ناو شانۆگەریەکە ئەکتەر
بەندە لەسەر چاك بەکارهێنانی هونەری دەنگ لەشوێن
و جێگای گونجاودا، بەرزو نزم کردنەوەو پچران و
وەستانی بەجێ، ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە ئەکتەر بتوانێ
مانای وشەکان بگەیە نێتە گوێگر. چونکە (دەنگ و
لەشە) ئەکتەر بەجەماوەری شانۆ دەبەستێتەوە.
ئەکتەرێك بیەوێ لە کارەکەی سەرکەوتوبێ، دەبێ خۆی
ماندوو بکات بە پرۆڤەوەو وەرزشی بەردەوامی رۆژانە،
دەنگ بە پرۆڤە باش و بەهێز دەبێت و بەشێوەیەکی رێك
و پێکیش لە دەم و گۆ دەکرێ و دێتە دەرەوە. هەروەها
دەبێ ئەکتەر ئاگاداری بەرزو نزمی چینەکانی دەنگ
بێو بە ئارەزووی خۆی گۆرانی تیا نەکا. ئەگەر لە
شوێنێك پێویستی کرد ئەو کاتە سەرپشکە لە گۆرانی.
پێویستە هەست بە وشەکان بکات بروایەکی تەواویشی
لەناوەوە پێیانەوە هەبێ ئەگەر ئەکتەرێك هەستی بە
وشەکان نەکردو راست و گۆ نەبوو لەگەڵیانا، چۆن

دەتـوانێ گوێگر رازی بکات لەو قسانەی کە دەیکات. بێشلێ ناتوانێ، دەبێ هەنگاوی یەکەم خۆی بروای بە وشەکان و ماناکانی بێنێ ئینجا گوێگر بروای پێ دێنێ. نابێ کاری خۆکردی (تصنع) لە دەنگی ئەکتەردا هەبێ و کار بکـاتــە سەر وشــەکـان. پێویستە زۆر بایەخ بە فۆنەتیك و خێرایی و هێواشی قسە بدات. وەهەست کردنی بە وشە بۆ دروست کردنی پەیوەندی لە نێوان خۆی و گوێگر بە ڕێگای تێگەیشتن لەسەر چاوەی وشەکان.

بۆ گەیاندنی هەست و مەبەستی ناوەوەی بەجەماوەرو گونجـانـدنی شێـوە لەگەڵ ئەو سات و شوێنانەی کە ئەکتەر پێدا دەڕوات لەکاتی نمایش کردندا. ئەو کاتەی دەنـگ دەبێتـە هونـەرو پیشە گرنگی فرەوان دەبێت، ڕێگـایـە بۆ تێگـەیشتن و قسەکردن لە نێوان خەڵك و لەمیانە جیاوازەکاندا راگەیاندن و رۆشنبیری.... هتد. لەهـەر ڕێبازێکی شانۆیی دابێ ئەو گرنگیەی ناگۆرێ لەگـەڵ گۆرانی بوارەکـە چ لەلای ئەکتـەر بێ وە یان بوێژێکی تر دابێت ئەگەر لەهەندێ لەلایەندا جیاوازیشی هەبێ.

ئەو ڕێگـایانەی کە دەشێ بۆ بەکارهێنانی گواستنەوەی مانـا، دەبەسترێتەوە بە وشەو چۆنیەتی گۆکردنەوەی، چونکی ئەو وشــەیــە بەنێوان گوێگرو قسەکەردا ڕەت دەبێ، لێرەدا هەنگـاوی یەکـەم دەست پێـدەکـات بۆ تێگەیشتنی مانای وشەو نەژادەکەی لەمیانی رستەوە هەنگاوی دووەم چۆنیەتی گەیاندنی ئەو وشەیە کە مانا راستیـەکی بزرنـەکـات کە نوسـەر دای رشتـووەو مەبـەستیـەتی، ئەو دوو هەنگـاوەش لەسەر چۆنیەتی دۆزینـەوەی وەیـان بەکار هێنانی هونەری دەنگ بوو. ئەکتەر دەتوانێ بەو ڕێگایە بگاتە ئەو گۆکردنە کە مەبەستیەتی.

زۆر جار تەماشا دەکەی هۆڵی شانۆ جەماوەرێکی زۆر هاتوون بۆ سەیری شانۆگەری ئەو خەڵکەش بۆ ئەوە هاتوون تا هەڵس و کەوتی ناو شانۆگەرییەکە بزانن و گوێیـان لە وشــەکـان و مانـاکـانی بێ جابـۆیـە (ستـانسـلافسکی) دەڵێ (وابزانە پیاوێکی پیری فەقیر هاتووە لە دواوەش دانیشتوە، وەکی خەڵکی دی دەیەوێ گوێی لە قسـەکـان بێ) ئەکتەر بۆ ئەوەی دەنگی بە چاکی بگاتە دوا کەسی ناو هۆڵەکە لە تەختەی شانۆ. جا بۆ ئەو کارە ئەکتەر دەبێ دەنگێکی بەهێزو توانایەکی بێ پایـانی هەبێ لە داننـان بەووشـەو فۆنـەتیـك لەکاتی دەربریندا. چونکی بینەر دێ سەیری شانۆگەری دەکات دانـانیشێ تەنیـا تەماشای کارو جولەکان بکات. بەڵکو دەیـەوێ لەو قسـانـە بگرێ لە دەمی ئەکتەرەکە دێتە دەرەوە... لەپاشان تاوێنەکە تەواو لەمێشکی دروست بێت گەر بەشێك لە پێك هێنەرە گرنگەکان بزربوو، ئەو کاتـەش ئەکتـەر ناتـوانێ بەتـەواوی ماناکە بگەیەنێتە بینەری گوێگر.

ئەکتەر دەبێ ئاگاداری دەنگ و لەشی بێت چونکی هۆی سەرەکی پیشـەکـەیـەتی، دەبێ گرنگی تەواوی پێبدا، ئاگـاداری ئەکتـەری بەرانبەری بێ لە کاتی دەوربینێنـدا لە بەکـارهێنـانی چینـەکـانی دەنـگ و وەرگرتنەوەی بە هەمان چین، ئەگەر وەرگرتن و دانەوەی چینـەکانی دەنگ رەچاو نەکرێ لەکاتی نمایش کردنا، ئەوە وەکی (بانێکەو دوو هەوایە)ی لێ دێت، ئەکتەر دەبێ دەنـگ بەهـەمـان چین وەربگـرێ لە ئەکتـەرەکـەی بەرانبەری، دوای وەرگرتنی ئەوکاتە سەر پشکە لە بەرزو نزم کردنـەوە بەپـێی خواسـتی پێشـەوە چوونـی رووداوەکانی ناو شانۆگەرییەکە.

ئەو هۆیانەی کە کار دەکەنە سەر قورگی ئەکتەر بەتـایـبـەتـی سەرمـا، زۆر خواردنـەوەی مەیـی، جگـەرەکێشـان، خواردنی گوڵەبەرۆژە، حالەتی گرژی قورگ، زۆری لە خۆکردن لە کاتی نمایش کردنا ئەوانەی کە لەســەرەوە باس کران، هۆی سەرەکی پەك کەوتنی قورگی ئەکتـەرە جا بۆ پاراستنی گرنگـە خۆمان لێیان دوور بکـەیـنـەوەو پەرە بە وەرزشی دەنـگ بدات و تاتوانایەکی باشی هەبێ لەگەیاندن و داننان بە وشەکان و تیپـەکـان، بۆ گوزارشت کردن لە هەموو بوارێك کە

ئەکتەر پێدا دەروات.

ئەوەی پێویستە لەسەر ئەکتەر ئەوەیە دەقی شانۆنامەکە بە ووردی‌و لەسەرخۆ شی‌بکاتەوە، بۆ بە دەست خستنی بیرو هونەری نووسەر وەتێگەیشتنی ماناکەی دەرەوەو ناوەوە و پشت ووشەکانی ووشە.

ئەو رێگایە سەرەتایانەی گرنگیشە بۆ ئەکتەری کوردمان ئەمانەن:ـ

- پچران Pausing
- وەستان Stopen
- سەرنج راکێشان Empbsisy

## پچران Pausing

مەبەست چی‌یە لە پچران؟

أ – کۆکردنەوەی ئەو ووشانەی یەك مانایان هەیە لە پارچەیەك بۆ جیاکردنەوەی بیرە تێکەلاوەکان.

ب – جیاکردنەوەی ئەو ووشانەی یەك واتا هەڵدەگرن.

جـ – جیاکردنەوەی ئەو رستانەی مانای جیاوازیان هەیە.

مەبەستمان لە پچران و گرنگی گواستنەوەی مانا لە پارچەیەك وەیان لە هۆنراوەیەك ئەوەیە گەیاندنی کۆمەڵێك لە وێنەو بیرو کارە.

وەدروست کردنی لە یەك بەستراوەیەکی دیاری‌کراو لە نێوانیان دا. بۆ نموونە (کیژێ گوندێ مە دەچنە مازو چنینێ) ئەم رستەیە بەم شێوەیە وێنەو بیرو کار دەگەیەنی. ئەگەر هات و هەر پچرانێك لەم رستەی سەرەوە رووی‌دا، ئەوا مانای رستەکە دەشێوێ ئەگەر بەستنەوەش لەنێوان ووشەکان نەما لەکاتی گوتنا ئەوا پەیوەندی نێوانیان نامێنێ واتە پەیوەندی نێوان وێنەو بیرو کار، بەلام ئەگەر گوتمان (کیژێ گوندێ مە دەچنە مازو چنینێ کانیەکەی بەر مالان ناوی سارده) ئەو کاتە پچران روودەدات چونکە دوو مانای جیاواز لە رستەکەدا هەیە دەبێ دوای ووشەی (چنینێ) بوەستین لەپاشا رستەکە تەواوبکەین. بەستنەوەی رستەی یەکەم بە دووەم پێویست ناکات کەواتە کاتێك پێویستمان بە پچران هەیە وەیان دەبێ تا ئەو شوێنەی کە رستەکان یەك مانای تەواو دەگەیەنێ ئەوەی دی کەمانای جیاوازی هەیە پێویستە بپچرێت. ئەگەر رەچاوی ئەو خالانە نەکەین کە لەسەرەوە دەرمان خست ئەو کاتە مانای رستەکان لەنگ دەبن و مەبەست ناپێکن، بۆیە دەبێ ئەکتەر لێکۆڵینەوەیەکی چاکی دەقەکە بکات. تا لە جێگاو شوێنی خۆی پچرانەکان رووبدات. خالێکی کەی گرنگ بۆ ئەکتەر ئەوەیە. کە بتوانێ چاکتر مانای ووشەکان بگەیەنێ.

## وەستان Stopen

وەستان کارێکی راستەوخۆی هەیە بۆ گەیشتنی مانای ووشەکان بەگوێگر. ئەمەش ئەو بێدەنگیە کاتیە دەگرێتەوە کە لەنێوان دوو ووشە یان پارچە روودەدات. ئەکتەر شتێکی گرنگ تریشی هەیە دەبێ رەچاوی بکات ئەویش ئەوەیە کە لە کوێ‌و چەند هەناسە دەگۆرێ بۆ ئەوەی بەشی رستە بکات و ماناکەی تێك نەشێوێنێ. بۆ ئەم کارەش پێویستە ئەکتەر پەرە بەئامێری هەناسەدان بدات و هەر چۆنێ بوێت وای بەکاربهێنێ بە پرۆڤەو وەرزش کردن بۆ پەرەپێدانی مەدای هەناسەیەکی رێك وپێك گەلێ رێگای جۆراوجۆری جیاواز هەیە بۆ نموونە (هەناسە هەڵکێشانێکی زۆر بەلووت. لەکاتی دانەوەشا لەسەرخۆو هێمن بێ. یان ددانەکانی بخاتە سەریەکتری کە دەنگی (س)ی لێدەردەچێ). ئەو نموونەی کە باسمان کرد ئەکتەر دەبێ پرۆڤەی لەسەر بکات، بتوانی بە شێوەیەکی رێك وپێك لەکاتی نمایش کردنا هەناسە دابەش بکاتە سەر ووشەو رستەکان بەبێ هەناسە برکێ.

زۆر جار لای خۆمان ئەکتەرێك تووشی وەستان دەبێ کە رستەکە. وەیان ئەو دواندنە پێویست بەوە ناکات

وەستێ. ئەوەش چ کاتێـك ڕوودەدات؟ کاتێـك ئەکتەر خۆشی دێت کە خۆی مەبەستی نییە وەکو چۆن؟

ئەکتــەر هەنــاســەی تەواودەبێ کەچی مانــای ڕستەوەیان کۆپلە تەواو نەبووە. ئەمەش پێی دەگوترێ هەنــاســە برکێ کە دەگــەڕێتــەوە سەر کەمتــەرخەمی ئەکتەرو پەرەنەدانی بە دەنگ. ئەکتەر دەبێ بەتەواوی وشــەکان بدرکێنێ لەکاتی دەرچوندا وشەو پیتەکان بەڕوونی دەرببڕێو بزانێ کام وەستان لە بەرژەوەندی هونــەری دەنگ دایە وەکامیان لە بەرژەوەندیدا نییە. وەستانی باش ئەو وەستانەیە کە مانای تەواوی ڕستە بەدەستەوە بدات.

ئەمەش جۆرەکانی وەستانە؟

١ – وەستانی کورت:ـ وەستانێکی ئێجگار زۆر کورتە لە نێوان پیتەکانی وشەو ڕوودەدات. بۆ نموونە وشەی وەرە) لە نێوان (وە... رە) وەستانێکی کورت هەیە.

٢ – وەستــانی ناوەنجی: وەستــانێکی درێژترە لەوەی یەکەم. بۆ جیاکردنەوەی نێوان دوو وشە بەکاردێت بێ وەرگــرتنەوەی هەناسە. بۆ نموونە (هۆلی گەل) لەنێوان هۆلی، گەل، وەستانێك هەیە.

٣ – وەستــانی درێــژ: ئەوەیە کە دەنگ کۆتایی دێت و هەنــاسە نامێنێت و دووبارە وەردەگیرێتەوە. ئەم جۆرە وەستانەش زۆرجار بەکاردێت بۆ لێك جیاکردنەوەی ماناو بیر. کەواتــە وەستــان بەپێی ماناو بیرو وێنە بەقەدەر پێــویست دەبێت. ئەکتــەر دوای لێکــۆڵینەوەی دەقەکە دەبێ بزانێ ئایا ئەم پارچە دواندنە وەیاخود ئەو ڕستەیە چەند وەستانی کورت و ناوەنجیو درێژی تێدایە، کەر هاتوو هەر وەستانە لەشوێن و جێگای شیاو بەکار نەهات ئەوا گوێگر لەمانای ڕستەکە ناگات.

٤– سەرنج ڕاکێشان Empbsisy

مەبــەست لە دەرخستن و دیــاریکردنی ئەو وشەیە. ئەوەیــە کە پێــویستە زێتر سەرنجی بخرێتە سەر. کە سەرنــج ڕاکێش تر بێ لەوانی تر. بۆ دەرخستنی مانــا ڕاستــەقینــەکــەی کە مانــا شاراوەکەیەتیو جیاوازترە لەوانی تر. واتــە ڕووکەشیەکە. زۆرجار هەڵگری بیری نوسەرە، هەندێ جار نوسەر نایەوێت ڕاستەوخۆ وشەکە بنــووسێت ئەویش بۆ ئەوەیــە گوێگر قوڵ بێتەوە لەلێك دانــەوەی ڕستــەو وشــەکــان، وەیا ڕێگای پێنەدراوە بەنوسینی ئەو کاتە چۆن دەتوانین بەو مانا شاراوانە بکەین؟

کاتێـك دەتوانین کە زاڵ بین بەسەر ئەو وشانە وەیــان ئەو ڕستــانــە، کە لێکۆڵینەوەیەکی قوڵی دەقەکە بکــەین و شارەزاییەکی چاکمان لە ژیان و بەسەرهاتی نوسەرەوە هەبێت. لە ڕووی باری کۆمەڵایەتیو ئابوریو ڕۆشنبیری دەگەڵ شوێنی لەدایك بوونی. دووای ئەمانە هەمووی ئەکتەر دەتوانێ بگاتە ئەو مانا شاراوانەی کە لەدەقی شانــۆنــامــەکــە هاتــوون ئەکتــەر لەزۆر دەقە شانــۆنــامــەکــان سەیــرێکی ڕستەکان بکەین دەبینین بەزۆری وشــە گرنگــەکــان لە کۆتایی ڕستەوە دێن بۆ نموونە شانۆنامەی خەج و سیامەند دەهێنینەوە.

سیــامــەند:ـ (ئەگەر ئەو سەرو ئەو سەری سیپانی بە خینا پسمامێ تو سۆر ببی واز لە بەژنا توو ناینم). لێرەدا ئەوەی پێــویستــە کە سەرنجی بخــرێتە سەر وشەی (نایەنم) کە لەکۆتایی ڕستەوە هاتووەو دووپاتی دەکاتەوە کە هەر خەجی دەوێت و بەئــاســانی وازی لێناهێنێ نموونەیەکی دی لەهەمان شانۆنامە:ـ

کالۆ:ـ (سیــامەند تەکبیرا من هەر ئەوە ئەتو خەجوکی هەڵگــری) لێرەدا ئەوەی گرنگــەو دەبێ سەرنجی بۆ ڕابــکێشرێ وشــەی (هــەڵگــری) چونکــە بەنــدە بەچــارەنــووسی خەج دەگەڵ سیامەند. وەگەڵێ ڕێگاش هەیــە بۆ سەرنــج ڕاکێشــان کە ئەکتەر بەکاریبهێنێ گرنگەکانیش ئەمانەن:ـ

١ - توندی دەنگ:- توندی دەخرێتە سەر هەر وشەیەك كە مەبەستە. بۆ نموونە دوا ندنێكی گلگامش دەهێنینەوە كە توندی دەخرێتە سەر (چ خێرێكم تووش دێت ئەگەر تۆمارەكەم ئەوەی توندی دەوێ كە بخرێتە سەری وشەی (چ) یان (تۆ).

ئەو كاتە بەپێی مانای ڕستەو بەپێی حاڵەتەكان توندی دەنگ دەبێت لەسەر وشەكان.

٢ - بێ دەنگی پێش وشە:- بێ دەنگیە كە لەپێش ئەو وشانەی كە مەبەستە بەكاردێت ئینجا هەناسە وەرگیرێ نا، بەڵام دەبێ گۆڕان كاری بەرزو نزمی دەنگ هەبێ، كەواتە ئەگەر وشەیەك گرنگ و مەبەست بێت لەهەر پارچەیەك یان ڕستەیەك. ئەو كاتە توندی دەنگ دەخرێتە سەر وشەكە. یاخود پێش وشەی مەبەست ئەكتەر دەوەستێ، ئینجا بە گۆڕانی چینەكانی دەنگ دەگۆڕێ بەپێی ویستی مەبەستی ڕستەكان. گرنگی ئەو توندی دەنگ و وەستانە ئەوەیە كە ئەكتەر بتوانێماناو مەبەست بگەیەنێتە گوێگر كە لە هۆڵی شانۆ دانیشتون بۆ بینینی شانۆگەریەكە وەشتێكی گرنگ هەیە لە هەموو ئەو خاڵانەی كە لە سەرەوە باسمان كرد چ لە بارەی هونەری دەنگ وەیان ڕێگای هونەری دەنگ بۆ گەیشتن بە مەبەستی تێگەیشتن و گەیاندنی وشەو مانا شارەوەكان:

خاوبونی لەشی ئەكتەر لە بواری شانۆدا پێویستی‌یەكی گرنگە بۆ گەیشتن بەهونەری دەنگ ئەوەی نەتوانێ زاڵ بێت بەسەر خاوكردنەوەی لەشی ناتوانێ سەركەوتو بێ لە بەكارهێنانی هونەری دەنگ لە هەموو بوارەكانی شانۆ وەیان ژیان دا، چونكە گرژبونی لەش ڕاستەوخۆ كاردەكاتە سەر ژێیەكانی قوڕگی ئەكتەر.

جا بۆیە دەبێ پێش هەموو هەوڵدانێك وەیان پرۆڤەیەك خۆمان ڕزگار بكەین لە گرژی لەشمان بۆ حاڵەتی خاوبونەوە، هەروەها دەبێ ئەكتەر توانایەكی لەباری هەبێ بۆ ئەوەی بتوانێ لە هەر كاتێك كە پێویستی بەگرژی ئەندامێكی لەش هەبێ بەئاسانی بەسەریدا زاڵ بێت.
بۆیە دەڵێین ئەوەی نەتوانێ خۆی دەرباز بكات لە گرژبوونی لەشی بێگومان ناتوانێ پەرە بەدەنگ و هونەری دەنگ بدات....

لە كۆتاییدا دەڵێین ئەم بابەتەی ئێمە نموونەی مشتێكە لە خەروارێك. بۆ پڕكردنەوەی كەلێنێك لە كەلەنەكانی شانۆی كوردی. بۆیەش هەوڵ و تەقەلا دەدەین دوا ڕۆژێكی ڕوناك و گەشەدار لەسەر ڕەگێكی توند بۆ ئەم جۆرە لایە برسكێنین بێگومان ئەمەش پێویستی بەخۆ چەكدار كردنی ڕۆشنبیری شانۆیی ولایەنەكانی دی ڕۆشنبیری گشتی هەیە. هەموو هونەرمەندو ئەدەب دۆست بەدڵ و كوڵ ئاواتە خوازە تازەترین داهێنانی هونەری‌و تەنكێكی شانۆیی ڕەچاو بكرێ لە شانۆگەری كوردی، بەمەرجێ خزمەتی واقعی ئەمرۆی تافەتاف ئاستی خواستەكانی گەلی كورد بێت، وەرێزو ستایش بۆ ئەو هونەرمەندانە ئەكرێ كە داهێنانی تازە بەشانۆی ڕەسەنی كوردی ئەبەخشن و لەپێناویدا شەونخونی دەچێژن. بۆ دامەزراندنی بناغەیەی هونەرێكی پێشكەوتوخوازانە كە ڕەنگدانەوەی باری ژیانی خۆمان و كۆمەڵگای خۆمان بێ. نەك هەر (شكل) لە پێناو (شكل) و لاساییكردنەوەی بێ گیان بێت. با بەرهەمەكانیشمان هەڵقوڵاوی ناو جەرگەی خەڵكە ڕەش و ڕووتەكە بێت.....و ئاگاداری پێشەوەچوون و تازە داهێنانی شانۆی جیهانی بین و سودیان لێ وەربگرین.
هونەرمەند دەبێ خۆی بەخاوەن مەبەستێكی گەورەتر بزانێ لە خەڵكی گشتی. گەرچیش بۆ مەبەستی خزمەتی كۆمەڵ هاتۆتە ئاراوە. دیارە ئەگەر كارێكیش وابێ دەبێ

ـێگەکەشی بێکەندو کۆسپ نەبێو چقل و درو داڵ خۆی
ـو مەلاس دابێ.

ـە ـ ویزو سەرچاوەکان

ـەیمـانگـای هونەرە جوانەکان/ سلێمانی بەبۆنەی
ـسـتـفـانی سالانــەی ـ ١٩٨٣ شانــۆگــەری (یـولیوس
ـیـزەر)ی لە نووسینی ولیم شکسپیر ـ وەرگێڕانی حەمە
ـشـیـد هەرەس، دەرهێنانی مامۆستا بەدیعە دارتاش،
ـەسـەر شانۆی ئامادەیی سلێمانی کوڕان، پش کەش
ـرد.

ـ کۆمــەڵەی هونــەرە جوانــەکــانــی کورد ـ هەولێر،
ـانـۆگەری (شاری ئەوین)ی لەنووسین و دەرهێنانی
هونــەرمــەنـد تەلعەت سامان، پێش کەش کرد لەسەر
ـانۆی هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەر لەساڵی ١٩٨٥.

ـ تیپی هونــەری هەولێر، شانــۆگــەری (مــۆزارت و
سالیری)، نووسینی (پـۆشکـین) وەرگـێڕانی (مەحمود
ـمـدار)، دەرهێنــانی هونەرمەند فوئاد جەلال لە هۆڵی
ـنەی کرێکارانی هەولێر ١٩٨٨ پێش کەش کرد.

ـ) کۆمــەڵەی هونــەرە جوانــەکــانــی کورد ـ هەولێر،
ـانــۆگــەری (نــەخــۆشی دڵان)ی پێش کەش کرد لە
ـوسینی (ئــۆژل دراگــۆن) وەرگــێڕانی دانـا ڕۆوف،
ـەرهێنانی هونەرمەند، دلشاد مامە کەریم، لەسەر هۆڵی
ڕۆشنبیری جەماوەری هەولێر ١٩٨٤.

ـ) کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد ـ مەڵبەندی گشتی
ـ سلێمانی، شانۆگەری (تەنەکە)ی پێش کەش کرد لە
نوسـیـنی ڕۆمــان نووسینی کورد (یـەشــار کەمــال)
وەرگێڕانی شوکر مستەفا، ئامادەکردنی بۆ شانۆ فوئاد
مەجید، دەرهێنــانی مامــۆستا ئەحمەد سالار، لەسەر
شانۆی چالاکی قوتابخانەکان ـ سلێمانی ـ ١٩٨٢.

٦) کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد ـ مەڵبەندی گشتی
ـ سلێمانی، شانۆگەری (گەلە گورگ)ی پێش کەش کرد،
لەنووسینی چیرۆك نووس حسێن عارف، ئامادەکردن و
دەرهێنانی هونەرمەند شەفیق محەمەد، لەسەر شانۆی
هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەری هەولێر ـ ١٩٨٩.

٧) تیپی هونەری هەولێر شانۆگەری (هاوارێك لە حاجی
قادری کۆیی) پێش کەش کرد، لەنووسینی هونەرمەند
زایەر عەبدوڵاو دەرهێنانی هونەرمەند سەعدون یونس،
لەســەر شانــۆی هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەری هەولێر لە
ساڵی ١٩٨٨.


٨) عبـدالحمـیـد حسین سلیم، فن الالقاء اسکندریة، ١٩٧٧، ص[٣٦].
٩) سامي عبـدالحمید، فن الالقاء جزء الاول، جامعة الموصل، ١٩٨٠، ص[١٧].
١٠) عبدالوارث عسر، فن الالقاء، قاهرة، ١٩٧٦، ص[١٠٢].
١١) ستـانسلافسکی، اعداد الممثل، ترجمة د. محمد زهکی محمود مرسي، القاهرة، ١٩٧٣، ص[٢٠٧].
١٢) سامي عبـدالحمیـد، تربیة الصوت وفن الالقاء، جامعة الموصل، ١٩٨٠.
١٣) بدری حســون فریـدو سامي عبـدالحمید، طرق تدریس الالقاء، بغداد، ١٩٧٩.
١٤) جارلیس ماکـو، ایمـانـك بالتمثیـل، ترجمة بهنام میخائیل، محاضرات القیت علی طلبة اکادیمیة الفنون الجمیلة، قسم المسرح، لسنة ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥.
١٥) دوو وانەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی لە لایەن مامۆستایان، بەدیعە دارتاش و ئەنور قەرەداغی ساڵی ١٩٨٤.




# یەکگرتنی ناووکی و سارده یەکگرتنی ناووکی

د. پەریخان محمەد ئەورەحمان




مەبەست لەیەکگرتنی ناووکی، یەکگرتنی دوو ناووکی سووکە بۆ پێکهێنانی ناووکێکی قورستر، بۆ نموونە، پێکهێنانی هیلیۆم لە هایدرۆجین:



$$1)\ {}^{2}_{1}H + {}^{3}_{1}H \longrightarrow {}^{4}_{2}He + {}^{1}_{0}n + \text{ووزە}$$

دیوتیریۆم تریتیۆم هیلیۆم نیوترۆن

لە ئەنجامی ئەم یەکگرتنەدا بڕێکی زۆر ووزە پەیدا دەبێت بەهۆی گۆڕانی بارستەوە بۆ ووزە بەپێی هاوکێشە بەناوبانگەکەی ئانیشتاین:

$$2)\ E = mc^2 \ldots 2$$

لێرەدا: E : ووزەی پەیدابووە، m : ئەو بارستەیە کە گۆڕاوە بۆ ووزە، C : خێرایی رووناکییە لە بۆشاییدا. بۆ راپەڕاندنی کارلێکی -١- پێویستیمان بە پەستان و پلەی گەرمیی زۆر بەرز دەبێت، چونکە لە پلەی گەرمیی زۆر بەرزدا ئەلیکترۆنی گەردیلەی هایدرۆجین جیادەبێتەوە و پلازما پێك دێنێت [پلازما چوارەم دۆخی ماددەیەو بریتییە لە گەردیلەی گازێکی دیاری کراوو تێکەڵێکی یەکسانی ئەلیکترۆن و ئەیۆنی مووجەبی ئەو گازە].

هەوڵێکی زۆر دراوە بۆ رەخساندنی بارێکی وەك هی خۆر بۆ ئامادەکردنی پلازمای هایدرۆجین بەبەکارهێنانی پلەی گەرمیی بەرز، بۆ نموونە ساڵی ١٩٧٠. لەیزەر - زان و ئەندازیارو کارمەندانی فیزیای ناووکی بەهەردوو هەوڵیان دا پلەی گەرمیی زۆر بەرزیان دەستە بکەوێت و پەستانی پێویستیشیان بەهۆی کەڵە لەیزەرەکانەوە دەستە بەر کرد، بەپێی ئەم بۆ چوونە:

لە هەموو لایەکەوە ترپەی کەڵە لەیزەر Powerfull Laser دەگیرێتە دەنکە تەرزەی قورساو $D_2O$ (دیوتیریۆم

ئۆکساید) و ئاوی زۆر قورس $T_2O$ (تریتیۆم ئۆکساید)، کوتــوپــڕ گەرم کردنی ڕووی تەرزەکــان دەبێتــە هۆی هەڵــیــنــی AbLation بەشی دەرەوەی ئەو ماددەیـــەی تەرزەکــەی لێ پێــك هاتــووە و یەکسەر هەڵینی ڕووی دەرەوەی تەرزەکــە پەستێنە شەپۆلێکی لێ پەیدادەکات بەرەو ناخی تەرزەکە بڵاودەبێتەوە و [شێوە(١)] پەستانە پەیـدابووەکە دەبێتە هۆی پەستاوتن و گیرخواردنی لە ناوکیلەیەکی چڕدا. کاتێك پەستان ئەوەندەی پێویست بەرز دەبێت، پلەیەکی گەرمیی نێجگار زۆر بەرز پەیدا دەبێت (نــزیکــەی $10^8$ کەلڤن)، ئەوســا گەردیلەکــانی دیوتێریۆم و تریتیۆم زۆر خێرا دەبن، بەجۆرێك دەتوانن بەســەرلێــك دوورکــەوتنەوەی ئەلەکترۆستاتیکی نێوان ناوکیلە بارگــە موجەبەکان دا زاڵ‌بین، ئەمەش دەبێتە هۆی یەککرتنیان، بەپێی ئەم هاوکێشەیە:



$$3)\ {}^{2}_{1}H + {}^{3}_{1}H \longrightarrow {}^{4}_{2}He + {}^{1}_{0}n + 14\ mev$$

لەم کارلێکــەدا گەردیلەی هیلیۆمی ئاسایی و نیوترۆنی وزە زۆری ١٤ میگا ئەلەکترۆن فۆڵتی پەیدادەبێت . تاکــو ئەم جۆرە کارلێکــانە لەناو گۆیەکی پەستێوراودا ڕووبــدات پێـــویستە پلەی گەرمی بەرز پیکۆ چرکەیەك بهێڵینــەوە و چڕی ماددەکە دە هەزار ئەوەندەی چڕی ماددە نەپەستێوراوەکە بێت.

بەڵام لە ٢٣ ی ئاداری ١٩٨٩ دا هەریــەکــە لەستانلی پۆنسی عەمیدی کۆلێجی کیمیای زانکۆی یوتای ئەمریکایی‌و (مارتن فلایشمان)ی زانکۆی (ساوثامپتن) ی بەریتــانیایی سەرکەوتنی تاقی کردنەوەی تایبەتیی خۆی ئاشکرا کرد دەربارەی (ساردە یەککرتنی‌ناووکی) لە پلەی گەرمی و پەستانی ئاساییدا بە بەکار هێنانی لەمــەر (٥٠٠٠) گەرد ئاوی ئاســایی[1] گەرد قورساو

[1] (واتە ئۆکسیدی دیۆیتریۆم $D_2O$)ی تێدایە.
ئاوی دەریاو ئۆقیانوسەکان).

ئەو ئامێرەی ئەو دوو زانایە بەکاریان هێناوە زۆر سادەن و لەدوو جەمسەر پێکدێن، یەکێکیان لە پلاتین و ئەوی تریــان لە پالادیــۆم دروست کرابوون و لە گیراوەیەکی لیثیۆم و قورساودا نقوم کرابوون، کە تەزوویەکی کارەبا

بیــرێت بەو گیراوەیــەدا ئاوەکــە لێــك هەڵدەوەشێ بۆ دیــوتــێریــۆم و ئۆکسجــین، دیــوتــێریۆم ڕوودەکاتە ئەو جەمــســەرەی لە پالادیــۆم دروســت کراوە و لەوێ دەمژرێت، ئۆکسجنیش ڕوودەکاتە جەمسەرە پلاتینەکە،

پالادیۆمەکە بڕێکی زۆر دیوتێریۆم دەمژێت، ئەم زۆرییە کەشێکی لەبار پەیدا دەکات بۆ لەگەڵ یەکدا یەککرتنی (پێکەوە یەککرتنی) ناوکەکان لە پلەی گەرمیی ژووردا. لەلایــەکی تریشــەوە چەنــد مامــۆستــایــەکی کۆلیجی کشتیــاری کانــزاگــەری زانکــۆی تەکســاس کە تاقی

کردنــەوەکــەی (پــۆنس فلایشمان)یان دووبارە کردەوە ئاشکــرایــان کرد کە هەمان ئەنجامیان دەستگیر بووە بەڵام لەوباوەڕەدان کە ناتوانن بەدڵنیایی بڵێن دیاردەی (ســاردە یەککــرتنی ناووکی) هەیە. جگە لەوەش چەند

مامۆستایەکی تری پەیمانگەی کالیفۆرینا زۆر بە توندی ڕەخنەیان لە شیانی ڕوودانی ئەم جۆرە یەککرتنە گرت و ڕاستی ئەو هەواڵە لە گومــانــدایە، بەڵام ئەگەر توانرا (ســاردە یەککــرتنی ناووکی) وەك ڕاستی و ڕوودوایێك بسەلێنرێت ئەوا کێشەی وزەی جیهان کۆتایی دێت و ئەوکاتە دەتوانین ئاوی دەریاو ئۆقیانووسەکان بکەینە

سەرچــاوەیەکی نەبڕاوەی وزەو، ئەگەر هەموو وزەی یەککــرتنــەکــە دەستــەبــەر بکــرێت، وزەی هەر پێ شەشپاڵوویەك ئاو ئەوەندەی وزەی دە تۆن خەڵووز دەبێت.



# مەرگی تاڵ و زار! ناوناوە شیرینیت ..

مسعود محمد

بەغدا ١٩٨٩/٦/٨

بەدەم ڕۆژگارەوە، لە ژێر ئاسمانی شینا .بەتەك گوڵ و بولبولی گێل و وێلدا، هەنگاوی شەكەت بووی هەزاران هەزار ساڵەی ئادەمی نەخشی كەنەفتی و پەژارەی خۆی لە ڕێبازی سەخت و دڕووكاوی ئەم «ئەرزە كۆنە هەوارە»

وەك مۆركی بابای گومان لێكراوی دەفتەری پۆلیسخانە چەسپ كردووە: هەموو نیگایەكی سەرنجدەری بەرەو رابووردوو لیستەی بێ برانەوەی ئاڵقە لە دوا ئاڵقەی شێوە زنجیرەی هەڵكەوتی درندەو ڕووداوی بڕندەو دیمەنی تاریك و مۆنی تابلۆی نەیارو نەساز دەخوێنێتەوە...چەندێكی خەیاڵم گێرابێت لە دۆزینەوەی موعادەلەیەكی ساختە كە تێیدا (س ـ نوێنەری خۆشی) زاڵ بێت بەسەر (د ـ نوێنەری ناخۆشی)دا هەمیشە كشاوەتەوە بەرەو ئەنجامی ناقۆڵای ناحەزی نەویستراوی خەفە بوونی (ئا) لەژێر سەنگی (نا) دا هەر لەو وەختەوە كە بەر لە هەزاران ساڵ دیمەنێكی لێ

بەدی دەكەین تا ئەم ڕۆژانەی بەدوا جەنگ لەسەر جەنگی بێ ناوەرۆكدا خەریكین بەرامبەر پلووسكەی خوێنی دەیان هەزار مرۆی بێتاوان بە پانایی ڕووی ئەم زەویەی پەمەییدا چاو بزڕكاوو حەپەساو دەبین .من باباێكم لەوانەی بە ئاسانی و زوو بە زوو برژە برژی برینیان داناكەوێت .. لەوانەم بەتەنیشت و ڕۆخی ماڵی خەفەتبارەوە مەحەلەبیو لوقمە قازییان بۆ ئاوا ناكرێت .. نەك چونكە ڕەش بینی لەمندا بەزیادەوە هەستی نایەتی (سلبی) خولقاندووە بە پێچەوانە، ئەوەندە بۆ ئایەتی (ایجابیة) هەستیارم و وەها شەیدای كامەرانیو خۆشیو بێ ئازاریو تەباییو ڕەباییم هەموو هۆیەكی ناپەسەندی ئاژاوەو دەم تێك نان و یەكتر ئازاردان وەها دەبوغزێنم سەر ئەوەندەی خۆی پێ نائارام دەبم. بۆ جووجەڵەیەكی لە خۆڕایی بەساوایی بمرێت خەفەتی خۆیو ئەو هێلكەو مریشك و كەڵەشێرانەش دەخۆم كە ئەگەر جووجەڵەكە بووبایە مریشك لێی دەكەوتنەوە..

هەر ئەم تینوەتیەم بۆ ترووسکەی خۆشی وەهایکرد ریکەوتی تێ هەڵئەنگووتنم لە یادنامەی دوو دۆستی کۆچ کردووم شیرنایی لەو مەرگە تاڵە بگیرێت کە دێت ئازیزێك لە کفنی نەبوون و بەسەرچووندا دەپێچێتەوە سۆزێك لە دەروونـدا دەگـرێنێت گەلێك زامدارترە لەو سۆزەی بۆ ئازیزێکی ئاوارەو سەفەر کردوو دەگیرسێتەوە .. ناگەهان و بێ مەبـەست ، چەند کاغەزێکی لێ نووسراوی بەرەو ژوورەوە قەد کراو ، لەپڕ ، کەوتە بەرچاوو ناودەستمەوە .. دیمەنی زەرد هەڵگەڕاوو تۆزێکی لێی نیشتبوو پتر لە دەسالی گۆشەگیری و سەرنانەوەی رادەگەیاند..

هەڵم گێڕایەوە بەرەو ڕوو ! لە سەرووی هەوەڵ لاپەڕەی دەستنووسم خوێندەوە:

### دەسکەوتی خەبات

لە تەنیشتی دەستـە چەپەوەی (هێمن)ی بێ نوختەی (ی)ەکەی نووسراوە و خەتێکی بەژێردا کێشراوە..

گورج هێمن و ڕۆژەکەی ئاهەنگی پەردە لادان لە ڕووی پەیکەری حاجی قادرم هاتەوە بیر کە هێمنیش شاکارێکی خۆی تێـدا خوێـنـدەوە. ئەو ڕۆژە ڕێـکـەوتـی ۱۹۷۳/۱۱/۲۹ بوو . لە پەراوێزی لای دەستە چەپی پەری هەرە دواییندا هێمن ۱۹۷۳/۱۱/۲٦ ی داناوە بە ڕۆژی لێ بوونەوە لە نووسینی شاکارەکە. چاکم لەبیرە، چەنـد ڕۆژێکی بەر لە ئاهـەنگەکە بەشێکی بەرچاو لە بەشدارەکانی ئاهەنگ گەییشتنە کۆیێ.. گرووپی هێمن و مەلا ڕەسووڵ و هەڤاڵە کوردە ئێرانیەکان لەوانە بوون. لەو چەند ڕۆژانەدا، فرەکات یەکترمان دەدیت و زۆر جار لەماڵی کاك مەجیدی ئامۆزام کە ئەوسا لەناو شار بوو منیشی لێ دابـەزی بووم، بەیـەکەوە کۆدەبووینەوە. لەو ۱۹۷۳/۱۱/۲٦ وە دیـاره هێمن برە شیعـرەکـەی لەوڕۆژەدا هۆنیتـەوە .. ئەگەر بیر کوڵی فێڵم لێ نەکات لەهـەوەڵەوە وەهـام دەزانی کەوا لەشەوی پێش ڕۆژی ئاهەنگەکە هێمن هەڵڕژاو دەروونی خۆی لەو ئاگرە شلە بورکانییە بەتاڵ کرد. ئەوەی ڕاستی بێت من خۆم بۆم نەلوا تا شەوی پێش ئاهەنگەکە هیچ بنووسم.

خواو ڕاستان لەشەوە درێژەکانی کۆتایی ساڵ بوو، بە بەریـەوە هەبـوو خۆی لێـك بکێشێتـەوە.. وابێ‌دەچێ بەخەیاڵی ئەوەی کە خۆم لەو شەوەدا دەروونم گوورا بە نووسینـەکەم وەها لە مجێزم خۆش هاتیێ کەهێمنیش وەکوو من تائەو شەوە هەر پەنگاوی دابێتەوە، سەرەرای ئەوەی کە نایەتە بیرم هێمن لەو ڕۆژانەدا گوتبێتی جارێ هیچی نووسیـوە. بە هەمەحاڵ وەك لە لاپەڕە ۲۱۷ ی دیـوانی (تـاریك و ڕوون)دا دەردەکەوێت هێمن هەتا بەرەبەیانی ۱۹۷۳/۱۱/۲٦ خەریك بووە. ڕەنگە ڕۆژی پێش ئەو بەرە بەیانەش گەیشتبێتە کۆیێ..

نوسخـەی لای من کە بەخـەتی هێمن نووسراوەتـەوە لەوانـەیـە ئەوە بێ کە لە ئاهـەنگدا بەدەستیەوە بوو دەیخـوێنـدەوە: ئەگـەر ڕاستی بۆ چووبێتم، ج هۆی گومـانیش لەوەدا هەڵ ناستێت، پێـوەنـدیی زێـدە دۆستایەتیو برایەتی وەهای لێ خۆش هێناوە نوسخەکە بەمن ببـەخشێت کە ئادگاری نووسینی هەوەڵ جارێ دیـارە وەیـا هەرنەبێ نووسینەوەی هەوەڵ جار، چونکە لەچـەنـدین جێگە ڕاست کردنەوەو گۆڕینی دارشتن و وشە تێترنجاندن بەرچاو دەکەوێت. لە نیوەی دووەمی دێڕە شیعری یەکەمی قصیدەکە وشەیەك پەڕیوە. کە گەرامـەوە بۆ ئەو دەقەی لەدیوانی (تاریك و ڕوون)دا بڵاوبۆتەوە مصرەعەکە بێکەم و کەسر ئەمە بوو:

### نە شۆرە ژن ورینگەی دێ لەبەر بێر

لە دەستنووسی لایەندا وشەی (بەر) پەڕیوە. لەمەدا بیر بۆ ئەوە دەچێت کە نوسخەکەی لایەن لەسەر یەکێکی دیـکـە نووسرابێـتـەوە بەڵام شوێـنـی دیکـە هەن بەپێچەوانەوە ڕادەگەیەنێ: لە دێڕی دووەمی شیعرەکە وشـەی (کیـژ)ی لەبـیرچـووە، هاتـووە خەتێکی بۆ هەڵکێشـاوە و لەسەرووی دێڕەکەی نووسیوە. لەدێڕی چواردەمیندا هەوەڵ جار نووسیوەتی: پەڕیوە سونبول و پێخوستە سوور گوڵ، ئنجا هاتوە وشەکانی بەقەڵەم سڕیـوەتـەو لەسەرووی سونبول سوور گوڵی نووسیوە خەتێکیشی لە سوور گوڵەوە بۆ پەراوێـزی کاغـەزەکـە ڕاکێشـاوە و سونبـوڵی نووسیوە. ئەمەشیان دەشێ هی نووسینـەوەی دوواتـر بێت بەڵام لەدێـری ۲۹دا [کـە لەدیوانەکەدا کەوتۆتە لاپەڕە ۲۱۳] هەوەڵ جار نووسیوەتی:

**قریوەو چۆبی‌و کوومندەو سەملیە**

ئنجا هاتوە خەتی بەسەر هیندیکی داهیناوە و نیوە دێرەکەی وەها گۆڕیوە:

**قریوەو داوەت و چۆبی‌و سەملیە**

خەتی دووەم جارێ بە قەڵەمێکی جودا نووسیوە هەر ئەم دەقەیشە لە دیوانەکەدا چاپ کراوە لەچەند جێگەی دیکەش ووشەی ڕەش کردوونەوەو گۆڕینێکی تێدا کردوون و لەسەرەوەی نووسیونەتەوە.

لەدەستنووسەکەدا نووسیوەتی:

**بوتی صاحبدلانی دڵ بەسۆیە**

کەچی لەدیوانەکە (صاحبدلانی) بۆتە (ساحەبولانی).

دیارە دواتر ئەم گۆڕانە کراوە کە نەویستراوە پیتی (ص) بێتە ناو ڕێنووسی تازەوە.

لەدەستنووسەکەدا نووسراوە:

**بەکۆ خۆمانەو بێگانەدا چووی**

لە دیوانەکەدا بۆتە :

**بەکۆ بێگانەو خۆمانەدا چووی**

لەمانە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە دێرە شیعرێکی سەرلەبەری ناو دەستنووسەکە لە دیوانەکەدا دەرنەکەوتووە. دەقی دێرە شیعرەکە ئەمەیە:

**کە شیعری تۆ نەبایە هاندەری کورد**
**ئەوێستا چۆڵ و هۆڵ بوو سەنگەری کورد**

ئەم دێرە دەکەوێتە دوای دەێری پێنجەمی لاپەڕە ٢١٥ی دیوانەکە. هەر چۆنێك بووبێت بڕایەتی‌و دۆستایەتی‌ی هێمن و من بەوەندە زیادو کەم ناکات ئایا کام نوسخە لەکامیان گیراوەتەوە.

ئەم دە لاپەڕەیەی تەمەن ١٢ـ١٣ ساڵی کە ڕۆژی کۆتایی‌ی مانگی مایسی ١٩٨٩ بەناکاو ئەمانەتەکەی هێمنی خستە دەستمەوە زۆر یادی لەبیرنەکراوی هێمن و برا پەنابەرەکانی کوردی کوردستانی ئێرانی لەپەردەی بیرکردنەوەمدا تێر ڕەنگتر کردەوە، نەختێکیش بە کراندنی زەنگی فەرامۆشی، هەستی نیوە خەواڵووم داڕووشایەوە بەتایبەت بۆ ئەوانەی بەر زەبری قەدەر کەوتن و بوونە قوربانی سەربڕاوی دوای ساڵەهای ساڵی ئاوارەیی‌و بێئۆقرەیی‌و ناکامی‌و تەنگەتاوی. لە نموونەدا دەڵێم چ هێزێکی عادەتی لەبیربەرەوە زەبیحی‌و قزڵجیم لێ دەشارێتەوە؟ لەتێکی دڵم لایانە! هەندێجار خەیاڵی بڵاو شەرم پێدەفرۆشێت و لێم دەبزرکێنێت و دەڵێت: ئەوشێت و شەیدایانەی وەتەن پەرست و باوەڕ قایم لەکوێوە زیاد لە ملیۆنەهای خەڵقی تەسەڵ و نیوە تەسەڵ نیدای غەیبیان بیست کە هەر دەبێ «کۆتە لە دەس و دەس لەمل وەل لە تەنافا» بن؟ چ وەکالەتیان لەو حەشاماتە وەرگرتبوو؟ کەس هاتبوو دەست و پێیان ماچ بکات هەتا خۆ بهاوێنە باوەشی بەندیخانەو شکەنجەو مەرگەوە؟ چ عەیب و شوورەیی یەخەی دەگرتن ئەگەر وەکوو ملیۆنەهای مەردمی گۆشەگیری بەرژەوەند بین ژیانێکی بێ بەندی‌و ئازارو خنکاندیان ڕابواردایە؟ چ دەبوو هەر هێندەی «جەماهیر» بۆ مافە نیوە خوراوەکان گیانبازی‌یان کردبایە؟ مەتەڵەو هەڵ نەهاتووە یان من هۆشم تێبڕ ناکات لەوەدا کە دەبینین لەخۆبووردووەکان و گیانبازەکان سەریان دەسووڕێت و بادەدەنەوە بۆلای یەکتر لەناوبردن هەردەڵێی بەسازی د... هەڵ دەپەڕن؟ بەو ئاگرو نوورەی فرشتان هیچیان مەتەڵ نین: مەتەڵ هەبێ مرۆڤەکە خۆیەتی کە خوتخوتە چووە دڵیەوە ئۆقرەی لێهەڵدەگیرێت، هەتا کرمی دڵی دانەمرێنێ ناسرەوێت.. سەیری مەراقی پۆکەرچی‌و دامەچی‌و ڕاوکەری‌و کۆترەبازو تاوڵەبازو ڕێسزبازو مێبازو هەمە بازێك بکەیت، هەریەکە لەمەیدانی خۆیدا وەکوو نیشتمان پەروەرو چینپەروەرو شێخ پەروەر خەوو خۆراکی لێ حەرام دەبێت هەتا مەراقەکەی دادەمرکێنێ، ئەویش بۆ ماوەیەك. هێندە هەیە مەراقی تاوڵەو دۆمینەو جگێنە حکومەتی لێ بەخەبەر نایەت وەك کە لەبابای سیاسی بەدەنگ دێت وەهاش دەبێ لزوم بەحکومەت نەمێنێ کە دۆمینە بازەکان خۆیان لەسەر هەبی‌بەیازێك یەکدی دادەپەلۆسن. ئنجا هەر وەك پێویستە پێتۆڵێکی کەیفچی بیری لەتاوڵەو دۆمینەو دامە کردبێت و دای‌هێنابن و خەڵق پێیانەوە مەراق گرتبوو بین هەروەهاش دەبێ بزووتنەوەی چینپەروەری‌و دین پەروەری‌و نیشتمانپەروەری لە پەزدانی مێژوو گووڕابێت ئنجا خەڵقی بۆ شەیدابێت ئەوساش لەپێشەوە نازاندرێت کێ لەڕاست وکێ لەچەپ وکێ لەناوەندا دەڕوات و چەندی

لێ بەردەوام دەبێت و چەندی بۆ شەیدا دەبێت.

سەرێکی تێوەرامان لەهێمن خواربکەینەوە دەبینین بە چارەنووسێکەوە گیرسایەوە دوور لەهەموو حیسابان بوو: لەجیاتی ئەوەی لادانی مێردە زەمەی ئیستعمار، حەمە رەزا پەهلەوی، دەرگەی بەهەشتی بۆ بکاتەوە کەچی بەخۆیەو چارەنووس و رابووردوویەوە بوو بە پەنوکێکی شەوەزەنگی بێ تالعتریەو بەدبەختتریەو قور بەسەرتری لەچاو رۆژانی غەریبیو ئاوارەیی... هەزار رەحمەت لە کفندزی پێشوو، بەڵام چ فایدە: دوای مردنی حەمە رەزا ئومێد بەو کفندزەش نەما! ناچارین چاوەنۆڕی مێردە زەمەیەکی دیکەی کۆنە جەهەندەمەکە بکەین هەتا فرشتەیەکی عەرشی بەرین لە پەردەی غەیبەوە سەر وەدەردەنێت.. پیرو قەدەمی بەخێر، چەند فێنکە بای باڵە رەنگارەکانت!!

لەو ساڵانەدا کە هێمن پەنابەری عیراق بوو منیش وەکوو هەزاران هەزار کوردی گەنج و پیر، کوروکچ، چەپ و راست، دۆستێکی قەدرزانی رێزلێنەری دڵ لەدەست داوی بووم. پاش ئەوەی نشیمەنم بووە بەغدا هێمنیش هەر بووە بەغدایی یەکتر دیتن و پێکەوە ژیانمان وەها بوو دەروون بۆ یەکتر بکەینەوە. لەو حەفت ساڵ و نیوەی سەرەتاکانی ١٩٧١و حزێرانی ١٩٧٨ کە لەکۆڕی زانیاری کورد ئەندام بووم و سێ ساڵی دووایینیشم بەجێگری سەرۆکی کۆڕ بردەسەر حەفتەی چەند جارێك یەکترمان دەدیت هەرنەبێ کەمن دەم راستی ٣ سێ لیژنەی زمان و ئەدەب و فەرهەنگ بووم هێمنیش تێیاندا ئەندام بوو: هەفتەی دووجاران بۆ رێزمان کۆدەبووینەوە بۆ ئەدەبیش بەلای کەمەوە جارێك، ناوناوەیش بۆ فەرهەنگ جگە لەوەی کە خۆیەو هاورێکانیشی بێحیساب و بێ ژووان سەردانی کۆڕیان دەکردو هەرنەبا بەشێکی ئەو سەردانەیان لایەمن رادەبواردو کۆڕی نوکتەو قسەی شیرن و باسی هەمە بابەتیان دەگێڕا. پێیناوێ بڵێم، لەهەموو دانیشتنەکاندا هێمن ئاخێوەرێکی بەرچاوو سەرنج راکێشی بیسەران بوو. بابایەك بوو قسە بەتامی نوکتە ئارای کەشکۆڵ ئاوەدان کە بەپێی بابەتی قسە لێوەکردن بتوانێ کوتاڵ و کالای گوتەسنجی. چ لەشیعرو ئەدەب بێت و چ لەخەبەرو گێڕانەوەی رووداو بێت و چ لەبیرورای پێوەند بە ناوەوەو دەرەوەی وڵات وەیا سەر بەفکرو سیاسەتەوە بێت، ئائەوتەرزە کوتاڵ و کالایە بخاتە بازاری کریارو نرخێنەرو رەخنە سازانەوە: هێمن لە وتوویژی هیچ مەجلیسێك دانەدەما، لە مندالییەوە راهاتووی ئاڵقە قسەرەوان و ئەدەب دۆست وخوێندەواران و کارگوزاران بوو، بۆ خۆیشی بەهرەی راوێژێ سازگارو ئاردا ویژی لەباری هەبوو کە لە شیعرو پەخشانیشدا بەرەو ریزی هەرەپێشەوەی ئەدیب و نووسەرانی کوردیەوە برد.

هێمن خۆیەو هەڤاڵەکانیو تێکرای برا کوردە ئێرانیە پەنابەرەکان دۆست و خۆشەویست و جێی متمانەم بوون، وابزانم هەمان هەستیش لەوانەوە بۆ من پەندی «دڵ ئاوێنەی دڵەیە» بەراست دەگێڕا. لە پەراوێزی تەسکی دەسەڵاتیدا کە وەها دەبوو بەعەیارەی حاڵ و باری ئەوان بەتەسك حیساب نەکرێت، پایەی ئەو برا کوردانە لای من رەنگی تەقدیسی پێوە بوو، ئێستاشی لەگەڵدابێت.. هەرگیز نەیانتوانی هێندەی کە من خۆشم ویستن خۆیانیان خۆش بوێت دەنا نەدەشیا ناو ناوە ساردا یییان بکەوێتە نێوانەوە.

پێوەندەی توندو تۆڵی ئەو برایانە بەکۆڕو منیشەوە بەشێکی بەرچاوی لەکەسانی دڵ کرمێو دەروون کەرواوێو هەناسە بێگەنی بێ شەرم و شکۆ بەرەو پیسکە رێگایەکەوە برد هەرگیزاو هەرگیز چ مرۆیەکی پێدا ناروات بایی تۆزقاڵێك هەستی مەردایەتی تێدا هەبێت: شکاتیان گەیاندە بەرزترین پایەی دەوڵەتی کە ئەو کوردە پەنابەرانە هەمووی جاسووسی ساڤاکی ئێرانن ئنجاکۆڕی زانیاری کوردیش بەهۆیانەوە بۆتە دایەرەیەکی ساڤاك. دوو جاران لە حکومەتەوە لێپرس هاتنە لام، لەکۆڕو پرسیارم لێکرا لەبارەی ئەو تۆمەتەوە: حکومەت لەمن و لەو کەسانەشی باشتر دەزانی کە تۆمەتەکە لەزرە بوختانێکی شەرم هێنەوە زیاتر نییە بەڵام دەبوو بەرواڵەت لەبارەیەوە پرسێك بکات چونکە دەستەیەکی هوروهوب بەئاگاداری هەندێ کاربەدەستی کوردەوە بوختانەکەیان هەڵ بەستبوو. وەڵامی پێویستم دایەوە کە لەحوکمی بەندەکانی یاسای کۆڕی زانیاری کوردەوە هەڵ دەستا: لەیاساکەدا هاتبوو

که دەبێ ئەندامی کارا لەکوردی غەیری عیراق هەڵبژێردرێن و ساڵی مانگێك ئەو ئەندامە کارایانە داوەت بکرێن بۆ بەشدار بوون لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی کۆڕو پاداشیان بدرێتێو مەسرەف هات و چۆو میوانەتیشیان لەسەر ئەرکی کۆڕ بێت. ئەو برا کوردە ئێرانیانە تێیاندا هەیە ئەندامی کاراو ئەندامی یاریدەری کۆڕن کە بەپێی فەرمانی یاسایەکی حکومەتی (بعث) دایناوە ئەو سیفەتەیان وەرگرتووە. کۆڕ هەتا ئیستاش [واتە هەتا دەمی شکاتەکە] قصوری کردووە لەوەدا کە هیچ کامێك لەو ئەندامانەی کوردی ئێران و هی یەکیەتی سۆڤیەت و شوێنی دیکەشی بانگ هێشتن نەکردووە، ئەوەندە نەبێ کە د. عبدالرحمن قاسملو وەختێکی لەخۆوە میوانی عیراق بووبێت بۆ کۆبوونەوەکانمان داوەت کراوە چونکە یەکێکە لەوکوردانەی غەیری عیراق کە بەئەندامی کارا هەڵبژێردراون. ئەویش و هەموو پەنابەرە بەرێزەکانی دیکەش لە کوردی کوردستانی ئێران میوانی حکومەتی عیراقن ئیتر (ساڤاکایەتی) لەکوێوە هەڵقوڵیوە.. شکاتەکە فشایەوە هەرچەند وەها دەزانم فتیل خۆش کەری ئەوکارە بەهێما لەلایەنێکەوە بەخۆی رەوا دیت لەچەقی درۆو بوختانی وەها رەچاڵدا هەڵوەستێت. دوواتر ناوی ئەو خەبەردەرانەم لەبەرپرسێکی زۆر گەورە بیست کە بەقێزەوە باسی دەکردن.

من هەرگیز لەهێمن و هەڤاڵەکانیم نەپرسی ئایا هەڵوەستیان بەرانبەر ئەو تەرزە کەسانە چ دەبێت چونکە پرسی ئەوتۆیی لەو بارەی ئەوانی تێدابوون بەئاوارەیی و پەنابەری، دەبوو بەرێگە لێبرینەوە لەورووەوە کە لەتەنگەتاوی و بێدەرەتانی‌دا مرۆ ناچار دەبێ سەر بەماڵی دوژمندا بگرێت.

لەوتوویژدا کە باسی پێوەندی‌ی باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵڵای م.لیم بە ماڵی قاضی و امین الاسلامی سابلاغەوە کرد هێمن گوتی خۆی نەوەی امین الاسلامە. لەمەوە دەرکەوت، تازە دەزووی تەنینەوەی دۆستایەتی‌ی نێوانمان لەریشاڵی بنەیەکی سەدساڵی ئاشنایی و ئەمەکداری کۆچ کردووانمان دەئاڵێت. لەوکۆنە نامانەی بەر لەسووتانی بروبزگورو کەل و پەل و کتێب و متێبی ژوورەکانی نهۆمی خوارەوەی ماڵەکەمان، ساڵی ١٩٦٣، نەکەوت وەڵام نامەیەکە لەحاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادەی باپیرمەوە بۆ (امین الاسلام)ی سابلاغ سەرەتاکەی بەم دوو بەیتە دەست پێدەکات:

**آنکه امروز بحر اکرام است**
**نور ایمان امین الاسلام است**
**ملك صاوجبلاغ ازیمنش**
**مرجع خاص ملجا عام است**

بەدوا ئەمەدا سپاسنامەی کاغەزو دیاری‌ی امین الاسلام دێت کە (هەزار پیشە)یەکی تاقمی چایەی بۆ باپیرم هەناردووە. سەیر لەوەدایە کە ئەم تەرزە پێوەندی‌یەی بەر لەسەد ساڵ بەو هەموو زەحمەتی بەیەکتر گەیشتن، لەخۆوەو بێ‌هۆی دەست نیشانی وەك ئاوارە بوون و لێ قەوماں بەزدەوام بووە کەچی لەسەردەمی سەیارەو رادیۆو فرۆکەو پۆستەی چالاك، لەکۆتایی‌ی سەدەی بیستەمدا هێمن و من لەیەکدیمان نەدەبیست، چ جایی برادەربین، ئەگەر حەمە رەزای پەهلەوی لەپیاو چاکی‌ی خۆیەوە هێمنی بەدیاری نەناردبایە بۆمان. بەڵام دەبێ لەبیرنەکەین کەوا بەر لەسەد ساڵ و دووسەد ساڵ حکومەتەکان وەکوو ئێستا هاتوچۆی خەڵقیان مەنع نەدەکرد، بگرە ئەوسا جاریێ بۆ حەشاماتی خەڵق پاسپۆرت و ڤیزەش جێی لێتوژینەوە نەبوو.

بگەرێمەوە بۆ قەصیدەکەی هێمن، کارم بەبەشێکی دوولاپەرەی دوایینی شیعرەکەوە هەیە:

لەو دێرە شیعرانەدا هێمن سۆزو مەهارەتی تێکەڵ کردوون، پێیانەوە بەرەژوور تێ‌هەڵکشیوە هەتا سنووری سەر سوورکێ خەیاڵی بیسەر لەگەڵی‌دا باڵ دەگرێت:

لەسەر سەکۆی مەدحێکی زێدە خەست و خۆڵی حاجی یەوە کەبۆم چوار بەیتە دەی‌گەیەنێتە توقەڵە:

**پەری دیوانەکەت گەنج و خەزێنە**
**وشەی شیرینی تۆ دوژمن تەزێنە**
**هەموو پەندن قسەی سووك و درێوت**
**وەکوو باڵی پەری پاکە جنێوت**
**بەنرخە، تازەیە، بەزرە، بەهێزە**
**ئەوی فەرمووت لەبارەی پیاوی دێزە**

ئەگەر کوردێك قسەی بابی نەزانی
محقق ... ... ...... .... زانی

بەدوا ئەمەدا، پاش سێ دێـر لە هەڵدانـەوەی دەوری شیعری حاجی بۆ بزاوتنی گیانی شۆڕشگێڕانە لە دەمار ومێشکی «کورە کورد»دا دەستەملانێی واقیعی بێ فێڵ دەبێت و کەسەری تازە هەڵ دەرێژێت:

**ئەوێستاش دەردە کورد نەکرا عیلاجی**
**ئەوێستاش کوردی کوێلە ماوە حاجی**

لەم بەیتەو چەند بەیتێکی دیکەی وەك:

**ئەوێستاش هەر دەمانکەن تیرە باران**
**دەنەخشێنن بەخوێن کوڵانی شاران**

دڵی بۆ کوردستـانی دیـوی ئێران و غەیـری ئەویش لێدەدات بەپێی واقیعی ئەو دەمـەی شیعـرەکەی تێدا دەخـوێندنەوە، لەبەرەو کۆتاییی ساڵی ۱۹۷۳.. تا لەم دوو بەیتـەی خوارەوەدا خۆی دەکـا بە کۆتـەڵێـکی زیندووی حاجی قادرێکی بەر لە ٧٦ ساڵ کۆچ کردوو:

**ئەوێستاش گۆر غەریب زۆرن وەکوو تۆ**
**ئەوێستاش بێ نەسیب زۆرن وەکوو تۆ**
**ئەوێستاش بێکەس و دووره وەتەن هەن**
**ئەوێستاش شاعیری پیرو رەبەن هەن**

شاعیری دووره وەتەن و پیرو رەبەن هێمن خۆیەتی، کە نوسخەیەکی حاجی قادری سەردەم بوو لەو دەمەدا..

هەقم بوو بڵێم مەرگ ناونـاوە شیرینـە: ئەگـەر مەرگ لەبـەینـدا نەبـوایە ئەو هەموو تام و شام و هێزو پێزە لەدەماری بەیتەکاندا نەدەگەراو دەبوو بەچێشتێکی کەم خوێ.. بەڵێ راستە مەرگ و هەموو هۆیەکی ئازارو بەژارە نرخی ئەو زێدە تاوو تینەی بەرهەمی ئەدەبیو هونەریی برینـدار لەمـرۆ وەردەگـرنـەوە و دنیـاش بەتێکراییو لەهـەمـوو رووییێکیشەوە گەش و خۆشتر دەبوو ئەگەر ئازارو کەسـەرو سفتوسۆ فەریان بزربایە بەڵام مادەم دنیـا بەکەسەرو خۆشییەوە تێمان ئالاوە وەیا ئێمە تێی ئالاویـن با لەرووی راستـییـەوە، وەك کوردی دەڵێ: قسەیەکی باشیشی بۆبکەین بەوەدا کە لەوەتەی مرۆڤ تەعبیر لەخۆی دەداتەوە بەهەڵرشتنی خەفەت و کەسەر فتیلەی چرای مەعنەویاتی هەڵکێشاوە. ئەو دڵدارانەی بەئـاگـری عیشقـەوە سووتـان لەیـادی پشتـاوپشتی

زینـدووانـدا دەژین.. زوڵمی بێ ئامـان و سامـانی داستانی زوحاك ئەورۆژی گەشاندۆتەوە: بەدەگمەنێکی زێـدە دەگمـەن نەبێ گەلان بیریشیان لەوەنەکردۆتەوە ئاهەنگی بیرکردنەوەی خۆشییەك بگێڕن کە هەرخۆشیی رووت بووبێت و هێوێنی بەڵایەکی گەورەی تێدا نەبووبێت.

بەهەمەحاڵ لەساڵی ۱۹۷۹ باری سیاسی ئێران گۆڕاو برا پەنابەرەکان دوعا خوازییان لێکردین بەرەو وڵات و کەس و کاریـان، من لەرووی نوکتـەوە گوتم: بەم گۆرانـەی وەزعی ئێران لەدووکەس قەوما، یەکیان حەمە رەزا شاو ئەوی دیکەش هێمن. قسەکەم نوکتە بوو بەڵام دەمزانی هێمن بەزەحمەت بتوانێ لەهیچ شوێنێکی کوردستاندا بگاتە ئەوپایەی خۆشەویستی کە لە کوردستانی عیراقی هەبـوو.. خۆی زۆر جاران باس و هەواڵی وەهـای بۆ دەگێڕاینەوە لەنموونەی روح پەرەیی گەنجەکان بۆی، بەتـایبـەت کیـژەکان، کە هەر لەخەیاڵدا شتی وەها بۆ مرۆی ئاسـایی دەسـازێت کەچی بۆهێمن بەرەهـایی دەسازا.. ئەوەی من لەدەرووی نوکتەوە بۆ هێمنم کرد بەپێشگۆیی، زۆر بەداخەوە، رۆژگار قوستییەوەو کردی بەنـوکتـەیـەکی دەسکـردی خۆی کەهـات (گـۆر غەریبی)یـەکـەی کە هێمن لە ساڵی ۱۹۷۳ بەرانبـەر پەیکـەری حاجی قادر دادوبڕوی لەدەستاندا دەکرد، زۆر بەسفتـو سۆو برژە برژەوە جێگۆڕکێی پێکرد بۆ جەرگەی زێدو مەفتەن و نشیمەنی لەدیوی کوردستانی ئێران، کە زانیمـان هێمن دوای گەرانـەوەی بۆئـەوێ هەنـاسـەی راحـەتی تێـدا هەڵ نەهێنـا هەتـا بەدڵ شکستەیی و نومێدی کوژاوەوە چاوەکانی بەسەر مەرگی تاریکدا لێك نان..!

خوێنـەر لێم بسـەلمێنێ کەدەڵێم هەرگیـز دڵم نەیهێنا بپرسمەوە لەچەندو چۆنی ئەو بارە بەرەوازەی بۆ هێمن خیجـا چونکە هۆی ئەو رروداوە لەخەتای هەرلایەکەوە سەری هەڵ دابـێـت وەهـای بێ سەغـڵەت دەبـم کە تەسکینی تێـدانەبێت، با هەر لەپشت پەردەی گوماندا بێت کەدەتوانم بەمل باری ناڵەباری داببرم..

مەرگ درنـدەیـەکی بێ بەزەیـیـە بەڵام ژیان خۆیشی لێـیدێت بەجـۆرێـك بزێتـەوە تاڵاییی مەرگ بەلای

شیرنایی‌دا ببات..
که بڵێم هێمن لەبیرناکەم شایەدی‌ی پیاوچاکی خۆمم داوە چونکە هێمن لەگەڵ نەبزی مێژووی خەبات و ئەدەبی کورد فرکە دەکات..
هەروا بەدەم نووسینی رووپەرەکانی سەر بەبابەتی پێشووەوە، دیسان بەرێکەوتی بێ‌نیاز، لەکاتی کاغەز دەرهێنان و سەر بەم و بەودا گرتن و سەرەتاتکەی بێ‌لزوم لێرەو لەوێ کردندا رۆخی کاغەزێکی ناوکتێبێکی بەرگ سپی، بارست مام ناوەنجی‌ی بێ نەخش ونیگار بە سەرنجمەوە نووساو لێی نەبۆوە.. ئەو هێندە نووسینەی که بەسەر کۆتایی دێرەکانی کاغەزەکەوە دیاربوو، رای دەگەیاند خۆرایی نی‌یە کتێبێك پەرەکاغەزێکی لاوەکی بەهەناوی خۆیەوە گرتبێ.. سەیری بەرگی کتێبەکەم کرد دیتم لێی نووسراوە:

عیززەددین فەیزی

یەکێتی نووسەرانی کورد و دوو کۆر

بێ‌ئەوەی زەکای مووقلاش پێویست بێت یەکسەر بیرم بۆ سەراوو دەراوی ئەو کتێب و کاغەزە رۆیی. نامەکە هی کاکە سۆرانی مامۆستا عیززەددین فەیزی‌یە لەرۆژی ١٩٨٨/٢/٨ بۆمی نووسیوەو لەگەڵ کتێبەکەدا بۆمی هەناردووە.. پێشتر بەتەلەفۆن لەگەڵدا دوواو لەسەر خوایشتی خۆم کتێبە باس کراوەکەی بۆم هەنارد تا لەدەرفەتێکدا بۆ بەشێکی ناوەرۆکی کتێبەکە بچمەوە کە پێوەندی‌ی هەیە بە ئاڵقەیەك لەئاڵقەکانی زنجیرەی «گەشتی ژیانم»دا.. با لەنووکەوە حیکایەتی ئەو پێوەندی‌یەت بۆبکەم!
لە ئاڵقەیەکی «گەشتی ژیانم»دا که دەگەمە باسی هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٥٢ بۆ خوێنەرم گێراوەتەوە کە خاتوون مامۆستایەکی قوتابخانەیەکی کچانی کۆیێ بەبۆنەی سەرکەوتنی بەرەی نیشتمانپەروەرەکانی ئەوسا شەکرو چوکلاتی بەشی‌بۆوە. ئەم خاتوون مامۆستایە (نظیرة محمد)، شەوێکیان تەقەی لێکراو هەروا بەحاڵ کوللەی دەمانچەکە دوو ئینجێکی لەشوێنی سەری بەسەر بالیفەوەی لادابوو.. حکومەت لەجیاتی دڵدانەوەو لاواندنەوەو بەدوا گوناهباردا گەڕان خوشکە نەزیرەی بۆ رەواندز هەڵداشت.. کارەکە سەرلەبەری، بە تاوانبارو حکومەتی‌یەوە، نامەردانە بوو چونکە بێ‌گومان ئەگەر مرشحی حکومەت لەهەڵبژاردنەکەدا سەرکەوتووبایەو خوشکە نەزیرە شەکرو قەیماغی بەشی‌بایەوە رەنگ بوو تەرفیعی پێ‌بکەن، خۆئەگەر تەقەی لێ کرابایە دڵنیام کە بەرەی ئێمەی هەڵبژاردنەکە تەپڵی تۆپانی پێ‌دەکرا..
بەهەمەحاڵ هەڵوەستی خوشکە نەزیرە هەرچەند لەودەمەدا دەردی سەری بۆ نایەوەو لەمردنی نزیك خستەوە، دیسانەوە لاپەرەیەکی گەشی ژیانی پڕدەکاتەوەو مایەی شانازیشە بۆ خۆی‌و منداڵەکانیشی..
تومەز مامۆستا عیززەددین فەیزی لەژمارە (١٠٩)ی رۆژنامەی هەولێر، رێکەوتی ١٩٥٣/٣/٣، گوتارێکی رق هەڵستاوی نەترساوی بوێر لەبارەی ئەم رەفتارە درندەیەی بێ‌بەزەیی‌و شەرم بڵاو دەکاتەوە کەوا رەنگە کاتی خۆی هەرپێم نەگەیشتبێت، دواتر ئەگەر زانی‌بیتیشم تا دەمی دەرچوونی ئاڵقەکانی گەشتی ژیانم هیچم لەبارییەوە لەیاد نەمابوو دەنا منێکی بەچرای گەنەگەرچەك بەدوا هەڵوەستی شەرافەتکارانەی خەڵقدا دەگەرێم چۆناو چۆنی مەردایەتی‌ی وەها زل لەبراو دۆستێکی زێدە بەرێزو خۆشەویستی وەك عیززەددین فەیزی یەوە کەهەتا سەرەمەرگ و گیانەلاوە بەکوردی‌و مەردی‌و پاکی ژیانی بردەسەر، چۆن نای‌کەم بەپرشنگێکی گەشی تریفەداری راگوزەری گەشتەکەم بەتایبەت کە گەشتەکە خۆی داوای دەکات، بگرە لێوسکت بوونی نوقسانی‌یە.. دیارە پاش دەرچوونی ئەو ژمارەیەی گۆڤاری «روشنبیری نوێ» کە لەناوتوێژی ئاڵقەی گەشتی ژیانمدا باسی ئەو رووداوەی تێدا هاتووە، کاکە سۆران تەلەفۆنی بۆ کردم باسی کتێبەکەی باوکی کرد ئیتر لەسەر تەکلیفی خۆم کتێبەکەی هەنارد بۆم بەڵکوو لەدەرفەتێکدا هەلی دەرخستنی ئەوهەڵوەستە شیرینەی مامۆستا فەیزی دەرەخسێت، دەرفەتیش نەمابوو کەلێنێکی بۆبکەمەوە لە ئاڵقەکانی گەشتی ژیانمدا چونکە چی‌هەبوو لەیاداشتەکانم تا دەگەنە ناوەراستی حەفتاکان بە سەرپەرشتی‌کەرانی رۆشنبیری نوێ گەیشتبوو، زۆریشم لێگران دێت هەلی ساختە هەڵ بەستم.. ئەم رێکەوتەی دەرکەوتنەوەی لاپەرە باس کراوەکانی قصیدەکەی هێمن و بەدوا ئەودا سەرکەل

بوونەوەی کتێب و کاغەزەکەی باوك و کوڕان لەخۆوەو بێ ئەرك و هەناسە سواری من سۆزێکی لە دەروونم گێڕا بۆئەو دوو کۆچ کردووەی ئازیز، بەجۆرێك، دەرگای کردەوە بۆ تارمایی گیانی چەندین ئازیزی دیکەی کاروانی رووەو مەرگستان.. لەیادکردنەوەدا گەلێك دیمەنی گەشی ئەو کۆچ کردوانەم هێنایەوە بەرچاوی خەیاڵ و لەگەڵیاندا سەرلەنوێ بەهەندێك لەسەفەری ژیانیاندا دەهاتمەوەو تێیدا رۆدەچووم تائەوەی بەدزە بۆ بەراوردکردنی یادی ئەوان لەگەڵ یادی زیندووان دەچووم دەمدیت دەستە تەرازووی ئەوان قورسترە لەهی زیندووان: لەژێر نواو سایەبانی مەرگدا تۆزە غەریبەی سالانی لەیەکتردابڕانمان بەگەشایی‌ی بیرەوەری‌یان وەکوو خەرمانەی شەوان کەتەنانەت وردە ئەستێرەش بزر دەکات، ئەویش هەموو کەم وکەسری مرۆڤایەتی‌ی عادەتی‌یانی لەخۆیدا دەشاردەوەو هەر تریفەی گیانیان دەمایەوە بۆ بەرنیگای فرمێسك تێدا قەتیس ماووم.. مەرگی تاڵ و ژار ناوناوە شیرینیت..

لەیادی ئەو مردووە ئازیزانەدا و بەئافەرینێك لەگیانی پاکی عیززەددین فەیزی، بە بلاوکردنەوەی ئەو دێرە شەرافەتمەندانەی کە لەوژمارەیەی گۆڤاری هەولێریدا بلاو کردبۆوە وا من لێرەدا بە دووبارە بلاوکردنەوەی ئەرکێکی قەرزداری خۆم بەرانبەر فەیزی بەجێ‌دەهێنم و کەلێنێکی گرنگی ئالقەیەك لەئالقەکانی گەشتی ژیانم پڕ دەکەمەوە ئەمەیە دەقی ئەو دێرانە:

## شەرمەو ناشیرینە

«لەشەوی شانزدەی مانگی شوبات هەندێك لەچەتە بێ‌دەسەلاتەکان لەکۆیە بەشەو بەتفەنگ پەلاماری ماڵی ئانیسە نەزیرە... مودیرەی قوتابخانەی کچانی کۆیەیان داوە، چەند تەقەیەکیان لەپەنجەرەوە بۆ کردووە کە بیکوژن، ئەم خێزانە بەرێزەش ژنن هیچ پیاویان تێدانی‌یە، زۆر خۆشی کە خوای مەزن رزگاری کردوون لەدەستی بەدکاران و هیچ گوللەیەکیان پێ‌نەکەوتووە. جا برادەران وەرن سەیرێکی ئەم سەیرانە بکەن لەهیچ شوێنێك ئەمە نەکراوەو نەبیستراوە، چەند شەرمەو ناشیرینە کە کۆمەڵێك پیاو دوژمنداری کچێك بکەن کە چەکەکەی قەڵەم و نووسینە. هیوایەکی زۆرمان هەیە لەدانیشتوانی کۆیە کە هەموو خوێندەوارێکی تێگەیشتوو ئیفتخاریان پێوە دەکات ئەم نەوعە کەسانە نەیەڵن لەناویاندا بژین، ئاشکرایان بکەن، تەشیر بکرێن لەناو کۆمەڵ و حکوومەتدا. بەراستی مامۆستایان لەهەموولایەك بەتایبەتی مامۆستایانی کۆیە بەم بزووتنەوەیە زۆر دڵگیرن، هەموو خوشك و برایانی ئانیسە نەزیرە لەلێوای هەولێر ئیحتیجاجیان پێشکەش دەکەن و تکایەکی زۆریش لەکاربەدەستان ئەکەن کە بنج و بناوانی ئەم ئیشە بێ‌جێ‌یە دەربخەن و بەقانوون جەزای خۆیان ببینن».

خوێنەر چاوپۆشی بکات لەوەی کەمن خوشکە نەزیرمم بە خاتوو مامۆستا داناو تەقەکەیشم بۆ دەمانچە بردەوە هەرچی مامۆستا فەیزی‌یە بە(مدیرە)ی ناو دەبات و باسی تفەنگیش دەکات.. بێ دوودڵی دەڵێم شایەدیەکەی مامۆستا فەیزی بۆ مودیرایەتی نیشانە پێکاوترە، خۆ کارەکە لەبنەڕەتدا نە بەمودیرایەتی‌و نە بەتفەنگ بوون و دەمانچە بوونیش ناگۆڕێت: پرووشکێکی بزووتنەوەی نیشتمانی بوو بەرەواژ گەڕایەوە بو کچێکی کوردی خاوەن هەست، کوردێکی مەردیش دەنگی تاوانبار کردنی لێ بەرزکردەوە، مسعود محمدێکیش کە قەرزداری هەڵوەستی ئەوکچەو ئەو مەردەیە دەیەوێ بەم یادکردنەوەیە قەرزەکە کەم بکاتەوە، بابڵێین قسطی یەکەمی لێدەداتەوە، زەمانێکی مێژووی لەبیرکراویش لەهەندێ دەمێری تۆمارخانەی دەفتەری شەرافەت دەگێڕێ.. دەقی ئەو دێرانەم بێ دەسکاری‌و بەشێوازو رێنووسی خۆی بۆ ئێرە راگوێست..

ئەم گوتارەم، هەر دەڵێی نەزری کردووەو لەخۆی گرتووە سەرەتاو ئەنجامی بەمەرگ بگەنەوە یەکتر چونکە وەك لێرەدا دوعاخوازی پاش مەرگ لە یادی مامۆستا فەیزی دەکەم، کە جارێ بەرحەیاتیش بوو دوایین جار لەخەستەخانە نەخۆش بوو چوومە هەواڵ پرسی.. دوای چەند رۆژێك لەهەولێرەوە خەبەری مەرگی هات: کەلێنێکی گەورەی لەشارەکەی خۆی‌و لەدڵی هەموو قەدرزانێك بەجێ‌هێشت.





# گەشتێک بەنێو هەنگاریادا*

سعید یحیی

لەسەعات هەشت و نیوی ئێوارەی ڕۆژی نۆزدەی شەشی هەزارو نۆسەدو هەشتاو نۆدا لە فرۆکەخانەی «بوداپشت»ی پایتەختی «مەجەر» دابەزین. لە ئێمە بترازێ کە دە ڕۆژنامەنووسی عیراقی بووین ئەگینا خەڵکەکەی دیکەی نێو فرۆکە لە زمان و ڕەفتارو جل وبەرگیان هەر هەموویان ئەوروپایی بوون. نێوان «بودا»و «فرانکفۆرت»، وەك لێخوری (!) فرۆکە پێیڕاگەیاندین، سەعاتێك و بیست دەقیقەبوو. ئەم ماوەیەش بۆ فرۆکەیەکی بچووکی سەر بە «لوفتهانزا» ئاوخواردنەوەیە. ئەگەرچی لەبەغداوە تا گەیشتینە ئەڵمانیا، چوار سەعات و نیوی خایەند، بەڵام چونکە تابلۆکانی سروشتی زەوی سەرنج ڕاکێش بوون و دوو فلیمەکانی بینیمان و دووا ژەمی خۆمانەی عیراقمان عافیەت کرد.. لەبەرئەوە مانای بێزاربوونمان نەزانی.

جارێ هەر بە ئاسمانەوە بووین و چەند میترێکمان مابوو بەتەواوەتی بگەینە زەوی، فرۆکەخانەی «هەنگاریا»م گەلێ پەڕبووت و هەژارانە هاتە بەرچاو: لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ئێرە وابێ، ئەی شوێنەکانی دیکە چۆنن؟

وادەزانم شوێنێکی وەکو فرۆکەخانە دەبێ ئەوەندە پێشکەوتوو بێ، هەرکاتەی خەڵکی وڵاتانی هاتنێ، هەر بەیەکەم دیقەت و تەماشا، بیروڕایەکی

پوخت سەبارەت بەم وڵاتەیان لەمێشکدا بچەسپێ. پاشان بۆم دەرکەوت کە بەڵێ ئەمەیان دەستی دووەمەو هی یەکەم گاڵتەی پێناکرێ.

دووای هەندێ پرسیارو وەڵام، ئەفسەری نێو شووشە، بەرپرسیار لەجێبەجێکردنی کاروباری چوونە وڵات، مۆرێکی خێواندە پاسەوپۆرتەکەم و مافی ئەوەی دامێ، بەکەماڵی سەڵتەنەت یەك مانگی تەواو لە «مەجەر»دا پیاسە بکەم. هەر کە پاسەوپۆرتی هاورێکانیش مۆرکران، ئەوە تێکرا داخیلی هۆڵێکی بەرفراوان بووین و بێ‌سێو دوو تەوقەمان لەگەڵ دوو فەرمانبەری بالیۆزخانەی خۆمان و بەرێوەبەری ئامۆژگەو یاریدەدەرەکەی کردن، کە نزیکەی نیو سەعاتێك چاوەروانی ئێمە بوون و هەندی یەك چاونوقێن جانتاو باوڵ و بارگەیان خستینە نێو دوو سێ ئۆتۆمبیل و بەرەو مەڵبەند بەرێکەوتین. ماوەیەك تا گەیشتینە شارو پردێکی نەقوڵامان برێو بەجادەیەکی شاخاوی پڕ لەپەناوپێچ و ئینجا خانوبەرەیەکی ژیکەڵە.

ژوورەکان بیندران و برادەران هەرکەسەو جێنوستنی خۆی زانی، دەموچاو شۆران.. ئیدی هەر بەدەم قسەوە، کۆبوونەوەیەکی دووازدە قۆڵیمان بەست و بەرێوەبەری ئامۆژگە هەندێ ئامۆژگاری بەنرخی کردین و ماڵئاوا زانیاریی بەکەڵکی لەبارەی بازارو هاتوچۆکردن و نرخی کەل وپەل و پارەگۆرینەوە، داینێ. ئەو نیو سەعاتەی وا لەباخچەدا دانیشتین، کزەباێکی ساردی وەك گوێزانی هەڵکرد. یەکسەر قسەی لێپرسراوی رۆشنبیری بالیۆزخانەی مەجەرم لە بەدا وەبیرهاتەوە.. کابرا گوتی: ئێوە بە هەوای ئێرەوە مەرۆن.. جل وبەرگی نیمچە گەرم لەگەڵ خۆتاندا بەرن و چەتریشتان لەبیرنەچێ!

**راستی دەکرد.. هەرچەندەی سەرمابردوو نەبووین، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کەواڵە هەوریەکیان گرت و رەش و سپی تێکەڵ بەیەکتر بوون. بەگرمەگرم و بۆڵە بۆڵ زەندەقی قوڵ رووتی وەك ئێمەیان برد. شوکری دەوێ هەر تەنیا چلوو راوو گرمە بوو.**

رۆژێك وچان و ئیستراحەت و بازارو تەدارك. لەسەعات نۆی رۆژی بیست و یەکی حەزیرانی مانگی شەش «حوزەیران هەڵەیە» یەکەم دیدار بەسترا، کە هی سەرۆکی بەشی دەرەوەی وەزارەتی دەرەوە بوو. لەماوەی چوار سەعاتاندا، بەتەواوەتی شارەزای مێژووی «مەجەر»ی کردین.

ئەم گەلی مەجەرەی وائەمرۆ ژمارەیان دە ملیۆنە، خۆیان لە ئەسڵدا حەوت عەشرەت بووینە. سوارچاك و چاونەترس، لە ناوەراستی ئاسیاوە هەڵقەناون بەشەروشۆرو کوشتن و برین و تاڵان کردن، گەیشتوونەتە ئێرە. هەندێکیان بەمەیش نەوەستاون بەرەو سەرزەمینی ساردتر هەڵکشاون و بوونەتە «فنلەندە»یی‌و خۆیان بە ئامۆزای مەجەرەکان دادەنێن. کەچی بەندە چەند لەزمانی مەجەر دەگا، ئەوانیش هەر ئەوەندە!! دووای جێگیربوون، بەتەدارك و چەپڵەرێزان و شاباش «ئشتیڤان» جل وبەرگی پاشایەتی دەبەرکردو تاجی لەسەرناو هەر بەم فاك وفیکەبوو بە پیاوێکی دیکەو نێویان نا، یەکەم مەلیکی مەجەر، کە ئەو کاتە بەرفراوانتربوو، بەشێکی یوگسلاڤیاو چیکۆسلۆڤاکیاو رۆمانیایشی لەگەڵدابوو.

رۆژگار هات و رۆیشت.. جەنگیزخانی چەمبەری[1] چەکدارو پیاوکوژو تاڵانکارانی سەرسەری، گەیاندە ئەوێو لەجیاتی عیزرائیل گەلێ رۆحی سەندو خەڵکەکەی نوقمی خوێن کردن و لەماوەی یەك ساڵدا ئەوەی ئەو بەئەوانی کرد، مەگەر هەر بەتاریخ بگێردرێنەوە. چەند ساڵ و عەیامی خایاند تا ئاسەوارەکەیان نەهێشت و پەنایان بردە بەرئەمپراتۆرو شاو مەلیکەکانی دەورو بەری خۆیان ژنیان دانێو شازادەیان لێ خوازبێنی کردن. جا لێرەدا دەکرێ ئەوماوەی دەکەوێتە چەرخی یازدە هەمەوە، بە ماوەی خێروبەرەکەت و بووژاندنەوە دابندرێ.

ئەمجارە سوپای عوسمانلی، سنوری مەجەری بری‌و دووسەدو پەنجا ساڵ لێی دانیشت. ئەو گەرەکەی ئێمە لێی‌بووین، دەیانگوتێ «کاپی» داوام لەکابرایێکی مەجەری‌کرد ماناکەیم بۆ لێکبداتەوە، کەچی هەرەمان مانا تورکی‌یەکە بوو.. «دەرگا»، تومەز سەرقافڵەی داگیرکەرانی تورك لێرەوە داخیلی «بوداپشت»ی پایتەخت بوونە.

دراوسێکانی مەجەر ترسیان لێنیشتووە، ئەگەر تورکەکان شاڵاوو هێرشیان هێنایە سەر ئەوان، ئەوە بەدەردی مەجەریان دەبەن.. ئیدی بەنهێنی‌و لەژێرەوە نوێنەرایەتی‌کان «نەمساوی»یەکان دەستیان خستووەتە دەستیان و لەسەر ئەوە رێك کەوتوون، تورکیان لەکۆڵ بکەنەوە. جا هەر بەرێگەی ئەم گەرەکی «کاپی»یەوە، سەربازانی سەفەربەلك تفەنگی رەشکەو ماهوزەریان لەشان کردووەتەوەو ئێرەو ئەوێ «هەر نانە زگ دەسکەوێ» خۆیان گەیاندووەتە زەوی‌ی بەردەستی عوسمانلی.. «رۆژی وا سەر سەلامەت بێ»!

بەلاّم تۆ وەرە ریشت لە چنگی یەکێکەوە دەربێنە، لەپر سمێڵت بکەوێتە دەستی یەکێکی‌تر. نوێنەرایەتیەکانیش نەیانکردووەتە نامەردی‌و ئەوانیش دووسەدو پەنجا ساڵی رەبەق مەجەریان داگیرکردووە.

دووکەڵی جەنگی دووەمی جیهانی هەڵساوەو بەرزبۆتەوە. ئەڵەمانیای دراوسێ هەرەشەی لەدەوڵەتانی دەوروبەرکرد. لەترسان و لەبرسان مەجەر دەستی لەنێو دەستی «هێتلەر» نا. پێی‌وابوو ئەگەر ئاڵای نازی‌یانە هەڵکا، دەتوانێ بەرگەی رەهێڵەی زەمانە بگری‌و کلاّوەکەی با نەیبا. کە ئاگری جەنگ دامرکایەوە، کۆمەنیست و دیموکراتە سۆشیالیستەکان هاتنە حوکم و سەرۆکی حزب و دەوڵەت «راکۆشی ماتیۆش» بەزەبری ئاسن و ئاگر ئەو خەڵکەی ئەوێی چەوساندەوە. دەڵێن کابرا شاگردێکی بەوەفای قوتابخانەی «ستالین» بووە.

بیروراو بۆچوون و رێبازی ئەوی، لەئەلفەوە تا کۆتایی بەزیادەوە جێبەجێ فەرمووە.

کە دەوران بوو بەهەزارو نۆسەدو پەنجاو شەش، خەڵکەکە هاواریان لێهەڵساو کردیانە هەراو شیرەشیرو گوتیان: ئەمانە هیچیان بۆ ئێمە نەهێشت. ئیدی هەر بابا بوو، دەستی‌دایە تفەنگ و داس و پاچ و خاکەناز. «راکۆشی» ترسا. دووپێی هەبوون دووی دیکەیشی قەرزکردن و های سۆڤیەت و مەرۆ هاتم. لەنێو ئەم بگرەو بەردەیەدا بیروڕای سەیر پەیدابوون. تەنانەت حزبێك سەری‌هەڵدا هەوڵی وازهێنانی لەستالین و شێوەی بیرکردنەوەی ئەوی دەدا.. ئەوەندەی نەبرد، حزب بوو بەدووکەرت. «کاداریانۆش»، ئەمەی بەهەل زانی، سواری تانکێکی سۆڤیەت بوو، لەپێشەوەی سوپای سوور پایتەختی داگیرکردو ئاوێکی کردە بان ئاگرەکەو «ئیمراناد»ی سەرۆکی جووڵانەوەکەی خستە زیندان و هەموو سەرکردەکانی ئەو شۆرشەی لەقنارەدان... دووای دوو ساڵ «ئیمراناد»یشی لەسێدارەدا. قسە لێرەدایە «یانۆش»، خۆی یەکێك بوو لەو کەسانەی داوای گۆڕینی دەکردو مریدێکی «ئیمراناد» بوو.

«تیبینی: بەر لەگەیشتنی ئێمە بەسێ چوار رۆژ، ئاهەنگ و خۆپێشاندانێکی گەلێ بەرفراوان گیرابوو. بەهەزاران کەس بەشداربوون و هەرچی حزب و دەستەی بەرهەڵستی دەوڵەت هەن ووتاریان خوێندەوە. تەرمی ئیمرانادیان بۆ شوێنێکی موعتەبەر گواستەوەو بەقارەمانێکی میللی‌یان لەقەڵەم دا. هەرچەندەی بەر لە ماوەیەك «کاداریانۆش» یان لەحزب و دەوڵەت لادا، بەلاّم هەر بەم خەفەت و کەسەرەوسەری نایەوە لەهێنجی تەمووزی رابردوودا فەوتی‌کرد».

ئێوە خۆتان دەزانن، دەمێکە رۆژنامەو ئاژانس و ئێرگەکانی جیهان باسی گۆرانکاری‌ی مەجەر دەکەن. دەڵێن و دەبێژن.. خۆ ئەگەر بەقسەی ئەوان دەبوو، دەبوایە مەجەر ئێستاکێ دەوڵەتێکی سەرمایەدارو کۆنەپەرست بێ! لێتانی ناشارمەوە هەرکە گەیشتنە ئەوێ، ئەوەی دەمی دەکردەوە، هەر باسی گۆرانکاری دەکرد: ئەمرۆ

نامبەی.. پەرلەمان بڕیاری گرنگ دەدا!

پێی ناوی بۆ هەرکوێ دەچوویین، باس باسی سیاسەتی ناوخۆبوو.. دووای پازدە ڕۆژ مانەوەمان، جێگری سەرنووسەری ئاژانسی دەنگوباسی مەجەر کە بەپێی پیتی خۆیانەوە نیشانەکەی (M.T.I) ە، کوڕێکی بۆ ئێمە بەست و باسی سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیانی کرد. کە تەواوبوو، دەبوو وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە. زاتم کردو گوتم: «بەندە سەرم لەم مەسەلەیە سوڕماوە.. پێم نالێن کوانێ گۆڕانکاری؟ من خەڵکی جادەو سەرشەقام دەبینم وەك کوێزیان بۆ بژمێرن وان..! کوانێ بەرهەڵست و حزبەکانی کە دەڵێن پێك هاتوون؟ من وادەزانم ئێوە بەشێکی «پرویسترۆیکا»ی گۆرباچۆفن و ئەوەی دەیڵێن و دەیکەن یاری پەرلەمانەو هیچی‌تر نیە»!

کابرا بێ‌ئەوەی دەمارگرژبێ، یا چاو زەق بکاتەوە، زۆر لەسەرخۆ گوتی: «جەنابت چەندە لێرەی؟» گوتم: «پازدە ڕۆژە». پێکەنی‌و گوتی: «بەم ماوە کورتە شارەزای ئێرە نابی‌و ئەم وڵاتە ناناسی». مژێکی لە جگەرەی دەستی داو گوتی: «بمانەوێ‌و نەمانەوێ گۆڕانکاری دەبێ‌و لە مانگی دەی ئەمساڵدا کە بڕیارە هەڵبژاردنی گشتی بکرێ‌و دەوری ئەم سەرکردایەتی‌یە چوارقوڵیە نەمێنێ، ڕەنگە ئەو حزبەی وانێستا لەسەر حوکمە سەرنەکەوێ». گوتمان: بۆ؟ گوتی: لەبەر هەندێ گیروگرفت و باری ئاڵۆزی وڵات لەرووی ئابوورییەوە. ئەم حزبە جەماوەرێکی زۆری لەکیس چووە. ئەگەر هەندێ نەخشەو پلانی پەلە ئەنجام نەدا، ئەوە مەجەر دووا ڕۆژێکی تەماوی لەپێشە. ئێمە نیوەی پێویستیمان لە سووتەمەنی لەدەرەوە دێنین. هەروەها لەسەدا هەشتای نەوت. لەبەر نەبوونی‌و قاتی‌ی کەرەستە هەوەڵیەکان، ئەوەی پێی بڵێن پیشەسازیی تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوو، لێرەدا نیەو نابێ. خۆ باسی گیروگرفتی کۆمەڵایەتیش هەرمەکەن.. تەلاق و نەزۆکی‌و تەمەنی کورت و خۆکوشتن و فێرە ئارەق، فرەبڵاوە...».



سەیر لێرەدایە، هەموو ئەوانەی لەماوەی ئەوبیست و یەك ڕۆژەدا سەردانی ئاموزگاری ڕۆژنامەنووسانیان کردو کۆریان گێرا، تێکرا بێ‌پەردەو بێ‌شارنەوە باسی گیروگرفتەکانی خۆیان دەکرد. دەیانگوت: مووچەی مانگانەی مرۆڤێکی مەجەر هەشت هەزار «فۆرینت»ە. ئەم پارەیە لە بازاردا ناکاتە سەد دۆلار. لە کاتێکدا نرخی کەل وپەل و خواردەمەنی‌و شتی‌تر. کەلێ لە کوورەی ئاسنگەر گەرمترە. جا ئەگەر دووای دەوام کارێکی سووك و سەرپێی بۆ خۆی پەیدا نەکا، ناتوانێ ساڵی جارێك بە سواری شەمەندەفەر بچێتە دەورووبەری پایتەخت و گەشت و گوزارو سەیرانێکی دوو ڕۆژە بکا.

ڕۆژ ڕۆژی شەممەیەو پشوودانە.. لە سەعات حەوتی بەیانی دەبوایە قاوەڵتیمان کردباو ئامادەی سەفەر بین. هێشتا چارەگێکی مابوو، کە (دکتۆر صابر العادلی) بەخۆو بەجانتا ڕەنگ قاوەیی‌یەکەی ملی یەکە

یەکە بەیانی باشی لێکردین.. «ئەم زاتە هاووڵاتی‌یەکی میسرەو دووازدە ساڵ دەبێ هاتووتە ئێرەو خوێندنی بەرزی لێ تەواو کردووەو ژنی هێناوە.. پێم وایە خۆیشی جارجار فەرامۆش دەکا، بڕوا نامەکەی ئەو لە چ پسپۆڕایەتی‌یەکە! کابرا خاوەن بەهرەو زمان و قەڵەمەو تابلۆی هوشیارە. لە فۆلکلۆرو کەلەپووررو میرات دا، مەلەوانی باشە.. لەهونەری تەشکیلدا گاڵتەی‌پێ ناکرێ، سەرەڕای وەرگێڕانی سەرکەوتووی، دەرسی زمانی عەرەبیش لە زانکۆی ئەوێدا دەڵێتەوە».

دکتۆر صابر لەپێشەوەو ئێمە بە دووایەوە، سواری پاسێکی خاوێن بووین و بەرەو دەریاچەی «بەلاتۆن» بەڕێ کەوتین. جارێ تاگەیشتینە ئەوێ یەك دووکەسی دەنگ خۆش، هەرچی کۆنە گۆرانی هەن چ کوردی‌و چ عەرەبی هەموویان بەسەر ئێمە ساغ کردەوە. بە ئامان و زەمان میکرۆفۆن و بڵندگۆیان لەدەست دەرنەدەهاتن. لەم ڕێکەو بانی واراست و ڕێکوپێك و پڕ لە دیمەنی سروشتی ئەو وڵاتە، کە بەجارێ سەوزەو دەڵێی مافوورە. سەدو بیست کیلۆمیترمان بڕی کەچی هەروامان دەزانی پێنج کیلۆمترە. تا چاو حوکم دەکا باغ و بێستانە.. تا دڵت حەزبکا، خانووبەرەیە، هەمووشیان هەر شیك و جوانن.. گوتیان: «ئەمانە ملکی تایبەتی دەوڵەمەندەکانی شارن، کە هاوینان لە ترسی تەوژمی گەرما پەنا دەبەنە بەر بەلاتۆن»! گەرما چ گەرما.. لە مانگی تەمووزدا لەبیست و پێنج پلە تێپەڕ ناکا!

دەریاچەی «بەلاتۆن» دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوا. لە گشت ناوچەکانی جیهانەوە خەڵك ڕووی تێدەکەن. ئەوەی بەرووت و قووتی مەلە دەکاو ئەوەی لێی ڕادەکشێ‌و خۆی دەداتە بەرخۆرو ڕەنگی پێستی دەگۆڕێ‌و ئەوەی سواری بەلەم دەبێ‌و وەرزش دەکا.. هەربابایە گوێی کارێکی سووکی گرتووە. هەمووشیان هەر بۆ وچان و ئیستراحەت هاتوون. جا ئەگەر خەڵکی مەجەڕبێ، ئێوارەی ڕۆژی یەکشەممە دێتەوە پایتەخت و شارەکانی دیکە.. ئەگەر نا چ زۆر میوانخانەو چادرو کەپرو پەنا.

لەبەر دەرگای ئیستراحەتخانەی ڕۆژنامەنووسانی مەجەڕ،(دکتۆر توماشی) سکرتێری گشتی‌ی یەکێتی ڕۆژنامەنووسان چاوەڕوان بوو. ماندوونەبوونی لێکردین و هەواڵی یەکەیەکەی پرسی. من بۆ خۆم و ڕەنگە دوو کەسی دیکەیش، دەمانناسی. کابرا بەر لەچوار ڕۆژ ئێمە بڕۆینە ئەوێ، ئەو لەعێراق بوو. لەگەشتەکەی عێراق، دوو شەوان لە هەولێر مایەوە. لەو ماوەیەدا بەندە بەهۆی نەقابەوە لەگەڵی دابووم. سەردانی هاوینەهەواری پیرمەم (صلاح الدین)و سەری ڕەشمان کردو گەلێ قسەو گفتوگۆمان کرد. وەك ئەمەك زانین و قەدر ناسین و دۆستایەتی ئەو سەفەرەی ، هەواڵپرسین و دەست گوشینەکەی ئێمە گەلێ تایبەت بوو.

خوا هەڵناگرێ، زەمینێکی چەورو بەلەزەتی نیوەڕۆی دانێ.. ئینجا پێشمان کەوت و شوێنەکەی پێ ناساندین کە ملکی یەکێتی‌ی ڕۆژنامە نووسانە.. دوو میوانخانەی سێ چوار نهۆمی‌و دوو چێشتخانەو بارێکی شەوانەی تێدایە. جگە لە باخچەی بەرفراوان و پلاژو یاریگەی وەرزش و گەرماوو شوێنی ئۆتۆمبیل وەستاندن. لە کاتی پشووداندا ڕۆژنامەنووسان بەخۆیان و خێزانەکانیانەوە ڕووی تێدەکەن و بەپارەیەکی کەم چەند ڕۆژێکی لێڕادەبوێرن. ناوە ناوەیش ڕۆژنامەنووسانی وڵاتەکانی دیکە بەتایبەت هی یەکێتی سۆڤیەتی دێنی.

هەندێ لەبرادەرانی خۆمان، نازانم بۆ حەزیان لەمەلە دەکرد.. خوا خوایان بوو نان بخۆرێ‌و خوان هەڵگیرێ‌و دە ئاوێ بکەون. لەبەختی ڕەش و ئەگریسی ئەوان، لە ناکاو پەلە هەور یەکتریان گرت و بوو بە باوبۆران و تۆفان. ئیدی هەر پیاوە، هەر خانمە بە مایۆو دەرپێی کورت خۆیان کوتایە ژوورەکان. برادەران هەر ئەوەندەیان بۆمایەوە، هەندێ وێنەی فۆتۆگرافی یادگار لەگەڵ پەیکەرێکی ڕووتی باخچەی ئەوێ بگرن!



بەرلەوەی لێپرسراوانی ئامۆژگە، شناسنامەی هاتووچۆمان بۆ دەربێنن، هەریەکە چەند دانە پلیتی رەنگ زەردو شینیان داینێ. کە یەکیان بۆ «میترۆ»ی ژێر عاردبوو، ئەوی دیکەیش بۆ پاس وترامی کارەبایی. رۆژانی هەوەڵ برادەران زۆر بە گەرمەوە بەکاریان دەهێنا. بەڵام چونکە کەس پێی نەدەگوتن بۆ کوێ دەرۆن، تا دەهاتن کزدەبوون. ئێوارەیەکیان سێ قۆڵی چوینە بازار.. دەبوایە بە میترۆ بچینە شوێن مەرام. دەستم بۆ گیرفانم برد، پلیتی زەردم نەمابوو.. دوو هەڤاڵەکەی دیکەیش هەروەك من: دەی ئەمرۆش با وەکو رۆژانیتربێ. پاشان کێ باسی پلیتمان لەگەڵ دەکا؟ بەهەڵە بینا لەسەر قسەی یەکێ لە برادەران، سواری فارگۆنێکی پێچەوانە بووین. کە زانیمان هەڵەمان کردووە دابەزین. دوو هەنگاومان برین، تووشی کچە شۆخێکی نازدارو دوو کەتە پۆلیس بووین. گوتی: کوانی پلیت؟ تا هاتین بە ئینگلیزییە شرەکەی خۆمان حاڵی بکەین، ئەو دەست پێش کەری کردو بە عەرەبی سەر زنشتی کردین! گوتمان: جا تۆکە ئەم عەرەبییە دەزانی، بۆوا تووڕەی؟!

ئەمجارە بمانبوورە.. گوتی: شتی وانیەو هەریەکە دوو سەد فۆرینت بدەن! زانیمان جاریوا چەنە لێدان نەك فۆرینتێ، بەڵکو فلوورێکیش ناکا، پارەکەمان داو تا لەپلیکانە کارەباییکانەوە سەرکەوتین بەخۆمان پێکەنین.. لەو کاتەوە ئیدی ئامۆژگاریی هەواڵانمان دەکردو دەمانگوت: دەستی ئێمەتان بەدامێن، نەکەن بێ پلیت سواری میترۆبن!

بەرای من، ئەگەر رژێم و سستەمی ئەوێ هەرچی هەیەو چۆنەو چ دەکا.. بەڵام مەسەلەی گواستنەوەو هاتوچۆی هاووڵاتیانی چارەسەر کردووە. مرۆ دەتوانێ بەچەند سات‌ە ومختێ، لەم سەری شارەوە بچێتە ئەو سەری.. قەتار بە دوواوی قەتارەوە.. دەقیقەچیە ناوەستن. هەر ئەوەندەو لە پلیکانەکانەوە دابەزە، ئیدی لە دوورەوە بایەکی سارد هەڵدەکاو هەرچی قژی درێژە وەسەر شانانی پەرت و بڵاو دەکاو هەرچی کراسە وەبان ئەژنۆیان دەخا.. ئەگەرچی کراسی لەم تەرحە دەکەمەن.. خۆ پاسیش لەو کەمترنیە.. ئەویش بەدەقیقەو سەعاتە. ترامی کارەباییش ماڵی ئاوا هاتوچۆکەران دەگوازێتەوەو بێزار نابێ..

لای خۆمان ئەگەر ئافرەتێك سەرکەوت، یەکسەر دوو سێ زەلام و مێردمندالّ فەرموویی لێدەکەن و شوێنی خۆیانی دەدەنێ.. لێرەشدا ئافرەتێکی چل پەنجا ساڵان سەرکەوت. سەیرم کرد خەڵکەکەی نێو پاس نەیانخوێندەوە.. یەك دوو کورسی بەتاڵیش هەبوون کەچی ژنە هەردانەنیشت. گوتم رەنگە ئەوانەی بەدڵ نەبێ وا لایەکی کورسییەکانیان گرتووە. بەرەو سەرووتر هەڵکشا. لەبەری هەڵسام و فەرمووم لێکرد. کەچی نەك هەر دانەنیشت، بگرە تەماشایشی نەکردم! دیاربوو دکتۆر صابر ئاگادارە. کە دابەزین گوتی: تۆ بۆچی تەعەدات لەو ئافرەتە کرد؟ تێی گەیاندم بەڵێ لێرەدا کەس لەبەر کەس هەڵناستێ چ ژن چ پیاو، تەنیا ئەگەر یەکێ پیرو پەك کەوتەبێ و نەتوانێ بەپێوە بوەستێ. سەیرە ئەمانە زۆربەیان عادەتیان بەوەستان گرتووەو ئەگەر خوانەخواستە داشنیشتن، ئەوە غەرقی خوێندنەوە دەبن.

جارێکی دیکەیش، ڕۆژی شەممەیەو تەعتیل پشودانە.. ئەمجارە «یوری»ی یاریدەدەری بەڕێوەبەری ئامۆژگە، ئاگاداری کردین کە دەبێ سەعات هەشتی سەرلەبەیانی ئامادەبین و ئەوەی حەزیش ناکا بێ، ئازادە. گوتمان: گەشتەو بۆ دەرەوەی پایتەختە، پێت وایە کەسی وامان هەبێ حەزنەکا؟!

نیو سەعات لەنێو پاس و گەیشتینە کۆنە دێیەك کەنیوەی خانووبەرەکانی لەبەرزایی دان.. خانووەکان ئەوەندە کۆنن بۆ مۆزەخانە نەبن بۆ هیچی‌تر دەست نادەن.. ئەوانیش هەروایان کردووە. هەندێکیان نوێ کردوونەتەوەو بووینەتە چێشتخانەو چایخانەو شوێنی ئیستراحەتی ئەو خەڵکەی لە هەندەرانەوە دێنە سەردان و پلیتی جۆراو جۆر دەبڕن و پارە دەژمێرن و وێری دەکەن.

زۆربەی خانووەکان گەڕاین، هەندێ کتێبخانەو هەندێ تابلۆی ڕەنگاوڕەنگ و ڕەش و سپی هونەرمەندان.. هەندێ پەیکەری کەسانێك لەم گوندەدا زەبر بەدەست بووینە. چێشتەنگاو بۆ سەرشاخ هەڵکشاین.. یاریدەدەری ئامۆژگە خۆی کوتایە حەوشەی خانووێك و گوتی: لێرەدا خۆراکێکی فۆلکلۆری هەیە، بلسەرو دانەتان بۆ بکرم! پێنج شەش دەقیقەو دە دوازدە نانی ساجی ڕۆناوی هێنا. پاشان کەهاتینەوە پایتەخت و پیاسەی بازارمان کرد، گەلێ چێشتخانەی بچووکی سەرشۆستەمان بینین هەرهەمان نانەڕۆنیان دەفرۆشت.. خەڵکی دەیکڕن و لەگەڵ شەربەت و بیرەو ئاوی سارد دەیخۆن.. نە فۆلکلۆرەو نە تەرەماش!

بەقەدی شاخەوە شانۆیەکیان دروست کردووە.. کەسانێکی هەندەران بەکامێرای دەست و شانیانەوە لەبەر هەتاو دانیشتوون. ئەوەیٚ وەکو ئێمەیش لەبەرنامە دووابکەوێ، دەبێ لەپێیان بوەستێ.. چوار کیژۆڵەی شۆخ و شەنگ و چوار کوڕی باڵا بەرزی قۆز، بەجل و بەرگی نەتەوەیی و لەسەر نەزمی مۆزیقای خۆیان سەمایان دەکرد. گووتیان: ئەمانە لەخۆیانەوە ئەم تیپەیان پێك هێناوەو ڕۆژانی شەممەو یەکشەممە لەسەر ئەم شانۆیە شایی و هەڵپەڕکێ دەکەن.

ئەوێمان جێهێشت و بەرەو لایەکی دیکە ڕێکەمان گرتە بەر.. دووای چارەگە سەعاتێ «دکتۆر صابر» بەر لەئێمەدابەزیو بەقەد ژمارە، پلیتی کڕین. دەرگایەکی تەلبەندو جادەیەکی قیرتاوی خاوێن. ئەمەیان مۆزەخانەی کرایەوەیە. هەرچی کەرەستەو خانووبەرەو کەل وپەل و پێویستی ماڵەو بۆ ژیان و گوزەران بەکاردەبردرێن، هەمووی دانراوە. خانووی ڕەنجبەرو جوتێر.. خانووی ئاغاو دەرەبەگ و گوێخای گوند.. کڵێسە، قوتابخانە.. تا دەگاتە ئەم ڕۆژگارەی خۆمان. گوتیان: ئەم خانووانە بێ ڕوخاندن وتێکدان لەشوێنی دیکەوە هێنراون.. بەمەیش دەبێژن: مۆزەخانەی سروشتیی کراوە..

بۆ ڕۆژی دوواتر، چووینە پەرلەمان. پاش نەختێ چاوەڕوانی لەیەکێ لەدەرگا زۆرەکانیەوە، خۆمان کوتایە ژوور. کچێکی باڵابەرزی خۆش ئاوازی لەسەرخۆ بەپیرمانەوە هات و بەخێرهاتنی کردین و خۆی پەناساندین کە لەبەشی ڕاگەیاندن و پێوەندی پەرلەمان کاردەکا. گوتی: ماوەیەکە ئەم بینایە کراوەتە ئاسەوارو هەر کەسێکی حەزبکا، پلیت دەبڕێو دێتەنێرە، تەنیا لەکاتی کۆبوونەوەی پەرلەمان نەبێ.

بینای پەرلەمان، زەوی‌یەکی فراوان و تەواوی داگیرکردووەو دەکەوێتە کەنار ڕوباری «دانوب». لەسەر عاردەوە تا بڵندترین شوێنی کە ئەویش ستارە سوورەکەی سەریەتی، بەرزی‌یەکەی نەوەت و نۆ میترە (بڕیاروایە بەم نزیکانە ستارە دابگرن). ئەندازیاری وا نەخشەی کێشاوە، بەرلەوەی بینا تەواوبێ، تەمەنی خۆی بەخشیوەتە ئێوە.. ئەوانیش نیوە پەیکەرێکیان بۆ دروست کردووەو لەشوێنێکی دیاری سەرپلیکانەی ژوورەوەیان داناوە. لەڕاستیدا دەکرێ ئەو وردەکاری‌و کاروبارەی لەبینای پەرلەماندا کراون، بەشاکار لەقەڵەم




بدرێن. تابلۆی بلیمەتانە ئیشیان تێدا کراوە. ئاخر کاڵتە نیە نۆزدە ساڵان موهەندیزو وەستاو کارگەر، رۆژ تا ئێوارە داروبەرد لەسەریەکدا کەڵەك بکەن! جاری ئەم هەشت ستوون و کۆڵەگە مەرمەرە چۆن تاشراون و هاتوون کە هەریەکە درێژییەکەی حەوت میترو دەڵێی حەزیای رەشە؟

کچە گوتی: ئەمانە دیاریی شاژنی سویدن.. هەشت دانەی دیکەیشی لەم جۆرە مەرمەرەی پێشکەشی پەرلەمانی ئینگلترا کردووە.

مافوورو قاڵیو گوڵدان و گڵۆپی سەیر سەیرمان بینی.. داخیلی هۆڵی کۆبوونەوە بووین. لەوێش کچە ماوەیەك باسی پەرلەمانی بوکردین و هەندێ وێنەی یادگاریمان کێشاو هاتینەدەرەوە.

رۆژی دوواتر، بەیانی سەرلەزوو، چووینە مۆزەخانەی نیشتمانیی هونەر، کەدەکەوێتە کۆرەپانی قارەمانان. بەدیداری سەدان تابلۆی رەنگینی هونەرمەندانی ئەم وڵاتە شادبووین، کەبەراستی ئەوپەری هونەرکاریان کردووە. ماوەی دوو سەعاتی تەواو گەراین و ناوە ناوە شەکەت و ماندوو لەبان تەختەو کەنەپەکانی دانیشتین.

بۆتاقی ئێوارە بێ ئیشوکاربووین.. ئیدی دوو قۆڵیو سێ قۆڵی بڵاوەمان لێکرد. لە «بەتهانی‌تێر»ەوە بۆ کۆرەپانی «ئەستۆریا»وە بۆ «کەلەتی»و «بلاها»، و دوورگەی «مارگریت»، کە دەکەوێتە نێوەراستی «بوداپشت»، و روباری «دوون»، شەق دەکا. بەپێو بەپاس و ترام و میترۆ، هەرچی بازارو کووچەو کۆرەپان و مەیدانن، هەر هەموویان شایانی پیاسە تێداکردنن. چەند سەد میترێك بەژوور «ئەستۆریا»وە یەك دوو جادە هەن دەکەونە کەنار روبارو ئۆتۆمبیلیان پیا ناروا.. ئێواران خەڵکی هەندەران و غەیرە مەجەری کۆدەبنەوەو پیاسە دەکەن و ئایس کریم و مۆتەوکەنەمشامیی برژاو دەخۆن. هەندێ منداڵ و مەزن جادووگەری دەکەن. هەندێکیش دوونەفەرییو تاك و تەنیا، تیپی مۆزیقایان پێك هێناوە و خەڵك پارەیان دەدەنێ. بیلامانێ سواڵکەری بەئەدەبن! لەولایەوەش دەستەو کۆمەڵی نیگارکێشان «پۆرتریت»، دەکەن و سەرگەرمی وێنە دروست کردنن (دەڵێن ئەمانە دەستکەوت و دەرامەتیان زۆرە!).

هەنگـارەکـان بایەخێکی تەواویان بەسیاحەت و گەشت و گوزەر داوە.. دەیـانگـوت ساڵی چەند ملیۆن کەس رووی تێدەکەن. ژمارەی دانیشتووانی پایتەخت دوو ملێـونـە کەچی هاوینان دەبنە چوار ملیۆن! بەڵام بۆخوا بڵێین گوزەران هەرزان نیە. هەرشتێکی دەیگریو دەستی بۆ دەبـەی ئاگـرە.. دیارە مەسەلە پێوەندیی بەباری ئابووریەوە هەیە.

لەم بارەیـەوە گەلێ پرسیـارمـان لەمامۆستاکانی ئامۆژگە کردن: وەکو دەزانین ئێوە دەوڵەتێکی کشتوکاڵین و نیمچـە پیشـەسـازی یەکیشتان هەس.. ئەی بۆچی حاڵتـان وایـە؟ دەیـانگـوت: راستـە لە کشتـوکـاڵ و دەرمانسازیدا لەپێشین، بەڵام چ فایدە! ئێمە ئەندامی ئەورێـکخـراوەین کە پێیدەڵێن «کـۆمیکـۆن»، کەهی وڵاتـانی سۆشیـالیستە. جاکە سێوک (پەتاتە)و گێزەر رەوانەی دەوڵەتێکی وەکو بولگاریا دەکەین، لەجیاتی پارە وەرگـرتن، ئەوانیش کولەکـەو دۆشـاوی تەمـاتەمان بۆ رەوانە دەفەرموون، کەلای خۆمان ئەوەندە زۆرن لێیان بێزارین! ئەگەر چارەسەرێکی ئەم وەزعە نەکرێ، حاڵمان پەرێشانە..

**چوونە گەرماوو هاتنە دەرەوە وەکو یەک نین.. لێرەیشـدا ناکرێ وا بەسووک و ئاسان خۆیان لەم رێکخراوە بکێشنەوە. مەسەلە رژێمەو پێوەندیی بەگـەلێ رژێمی وەك خۆی هەیە، هەمووشیان هەر لەسەر یەك سنوورن.**

برادەرێـکمـان هەڵیـدایێو گوتی: وا بەخـێر «بـۆش»ی سەرۆکی وڵاتـە یەکگـرتـووەکانی ئەمریکا سەردانتان دەکا. رەنگە هەندێ قەرزتان لەکۆڵ بکاتەوە!

دەمــە دەمی ئێـوارەیـەکی ساردوبـارانـاوی، بەســەدان سەربـازو پۆلیس رژانـە ئەو شەقـامـانەی کەبـڕیـاربوو کاروانی سەرۆکی ئەمریکای لێتێپەربێ. هاتـوچـۆی ئۆتـومبیلیـان وەستاندن. خەڵکی دەستەو کۆمەڵ لەسەر شوستەکاندا بەرێز وەستان هەوەڵ سوار ماتـۆڕو ئۆتـۆمبیلی پۆلیس و پاشان بەدەیان ئۆتۆمبیلی هەمە چەشنەی نوێ بابەت و خاوێن. «بۆش» و خانمی ژنیو یەك دوو کەسی دیکە لەنێو ئۆتۆمبیلێکی درێژو پان و بەریندا دەستیان بۆخەڵکەکە بەرزکردنەوەو سڵاویان لێدەکردن.. تاچاویش حوکمێ دەکا، جادەکان بەئاڵای ئەمـریکـا رازاونەتەوە. هەر لە فرۆکەخانەوە تا کۆشکی تایـبـەت هەرچـی گوتـیو هەرچـی کردی لەمــاوەی دووسەعاتی رەبەقدا درایە تەلەفزیۆن. بەڵام داخەکەم پاشـان زانیمـان جەنـابی (مستـەر بۆش) دۆلار چیە نەیـدانێ و وەك «پـوڵەندا»ی تەماشا نەکردن. ئەوەندە نەبێ داوای لەبانقی نێو دەوڵەتان کرد پارمەتی (مەجەر) بدا. هەنگـارەکـانیش لێیـان یەقینـە ئەم بانقە کۆمەڵێ مەرجیـان لەسـەر فەرز دەکاو تا عانەیەکیان دەداتێ، سەتـڵێ ئارەقـیـان پێ دەکـا!! دەزانن مەرجـەکـان پێوەندییان بەسیاسەتی وڵاتەکەیانەوە هەیە، کە دەبێ بیگۆڕن و بەگوێی بانق بکەن، ئەگینا «نەم دۆلار».

چەنـد سەعاتێك بەرلەوەی بەرێوەبەری ئامۆژگا خواحـافیزیمان لێبکا.. گوتی: ئەو رۆژەی وائێوە هاتنە ئێرە،هـەواسـاف و بێگـەردو رۆژەکەی تابلێی خۆش و لەباربوو.. ئەمرۆش کە دەگەرێنەوە هەروا.. کەچی ئەو رۆژەی «بۆش» هات باران بوو.. سبەینێش دەگەرێتەوە وابزانم هەر بارانە.. ئەمە جیاوازی نێوان دۆست و نەیارانە!

بۆ یەکێکی غەریبە، ئەگەر زمانی ئەڵمانی بزانێ، مەحتەڵ نابێو کەسانێکی زۆر هەن لێی حاڵی دەبن.. ئەگینـا زمـانـەکـانی دیکـە سفـر.. خەڵکێکی وامەن، بەتایبەت لەبازاردا، لە هەنگاری بترازێ ئەوەی زمانە نایزانن.

من بۆخـۆم کە ئێـواران بێئیش و دەست بەتاڵ دەبووم، لە گەڵ نۆبەتداری ئامۆژگاکە، کە کورێکی روح سووك بوو، هەندێ ووشەم ساغ دەکردنەوەو ماناکانیم دەنووسینەوەو لەگەڵ زمانەکانی ئەم رۆژهەڵاتەم بەراورد دەکردن. کە دەچنەوە سەریەك رەچەڵەك و گەلێ مانایان لەیەك دەکەن. «یوری»ی یاریدەدەری بەرێوەبەر ئاگای

لەمەبوو. ڕۆژێکیان گوتی: کاکە تۆ بێهوودە خۆت خەریک کردووە، لەجیاتی ئەمە خەریکی زمانێکی زیندووی دنیابی باشترە کە لەهەموو شوێنێکدا بەکەڵکت بێ.. زمانەکەی ئێمە ئەوەندە بێسوودە کەگەیشتیە سنوور دەبێ لەکۆڵ خۆتی بکەیتەوە.. ئەگینا قەزاو بەلایەو کەس پووڵێکی قەڵبی پێ نادا!

لەو ماوەیەدا دووجار بەکۆمەڵ سەردانی باڵیۆزخانەی خۆمانمان کرد. جەنابی سەفیر گەلێ ڕێزو حورمەتی گرتین. ئێمەیش هەر بە کۆمەڵ ئامادەیی خۆمان بۆ ئاوەدان کردنەوەی شاری بەرگری (فاو) نیشان دا. سەفیر پیاوێکی دنیا دیدەو گەڕیدەو لەسەر خۆبوو.. ئێوارەیەکی تەرخان کرد بچینە ماڵەکەی ئەو. تێکرا چووینە ئەوێ کە دەکەوێتە گەڕەکێکی بەرزو شاخاوی «بوداپشت». ئەوەندەی نەبرد بەڕێوەبەری ئامۆژگەی خۆمان و یاریدەدەرەکەیو د. صابر هاتن. بەسوحبەت و قسەی خۆش سەعاتمان کردنە یەك و دووی شەو. گەلێ «حاتەمانە» پێشوازی کردین و تازگمان نیشاو دڵمان بردی پاپراخ و برنجی خۆمانەمان خوارد.

بازاری ئەوێ، بەتایبەت فرۆشگاو دوکانی خۆراك و کەل وپەلی ڕۆژانەی ماڵ، گەلێ پڕو شلووغن. لەدەرزییەوە دەیگری تا گۆشت و مریشکی هەن.. بەڵام ئەوەی سەرنج ڕاکێشە، شووشەو بتڵی شەراب و بیرەو ئارەقە. ئای کە بەکاریان دێنن و دەیانخۆنەوە!

خۆشییەکەی ئەم دوکان و بازارانە لەو دایە، بنیادەم دەتوانێ تەنیا یەك تەماتەو یەك باینجان و یەك سەلکە پیاز بکڕێ.. فرۆشیارەکان کە زۆربەی هەرزۆریان ئەگەر هەموویان نەبێ، کچن.. نەبێزار دەبن و نە خۆیان توورە دەکەن و تا دەچیتە ژوورەوەو دێیتە دەرەوە بەخێرت دێنن. لەوەیش مەترسە زمان نازانی.. هەرشتێکی دەیکڕی نرخی بەسەرەوەیەو تۆش بەگوێرەی گیرفان چت لازمە دەیکڕی.. نەك وەکو ئێرە پاش مامەڵەو بەسەری من و بەقەوری باوکت، دەتوانی نیوەی نرخەکەی دابەزێنی!

لەماوەی ئەو بیست و چەند ڕۆژەی ئەوێ، ڕووداوێکی وام بەرچاو نەکەوت شایانی باس بێ. ئەهەراو ئەقیرە قیرو ئەشەڕو گێچەڵ.. ڕۆژنامەی «دەنگی گەل»، کە دکتۆر صابر ڕۆژانە دەیکڕیو لەهەندێ هەواڵ حاڵی دەکردین.. هەواڵی کودەتاکەی «سودان»ی بڵاوکردەوە. نووسیبووی «صادق المهدي» یان لە ئاهەنگێکی بووك گوازتنەوەدا وەگیرهێناو گرتیان.

ئەوڕۆژەی وا «بۆش» دەهاتە (مەجەر) لەمەیدانی «ئەستۆریا»دا زەلامێك بەر ترام کەوت. جا نازانم خۆی کوشت یا بەهەڵە بان هێڵی ترام کەوت.. پۆلیس و ئەمبولانس (اسعاف) ڕژانە ئەوناوەو سەعاتێك چۆڵیان کرد.

مەجەرەکان، مەراقی جگەرەو کتێبن.. بۆ جگەرەکێشانە کە دەستەی کچان لەپێشن و لەهەر شوێنێکدا بزانن قەدەغە نیە، ئەوە دووکەڵی لێ بەبادەدەن. بۆ کتێب خوێندنەوەیش هەردوو دەستەی کوڕو کچ بەشدارن.. ماشەڵڵا کە غەرقی دەریای مەتاڵە دەبن، تۆبیان لەبنا گوێ بتەقێ باکیان نیە.

ئەمە هەندێ سەرەنج و تێڕوانین و بینینی خۆم بوو لەو وڵاتەدا.. ڕەنگە شتی وردم نەنووسیبێ کە کەم وزۆر بەکەڵکی تۆی خوێنەر نایە. هیوادارم بەمە کەمێ زانیاریت لەبارەی ئەوێ حاسڵ کردبێ.. ئیدی کەسەنۆم سیپان (زۆرسوپاس)

(★) نووسەری ئەم وتارە لەنێوان ١٩٨٩/٦/١٩ تا ١٩٨٩/٧/١٢ دا بەشداری خولێکی ڕۆژنامەنووسی کرد، کە لە (بوداپشت)ی پایتەختی مەجەردا سازدرا.

(١) دوا بەدوای ئەو خۆسازدانەی یەکێتیی سۆڤیەتەوە، قەدرو قیمەتی «جەنگیزخان»یش گەڕایەوە و ئیدی کتێبی مێژووی خوێندنگەی منداڵان بە داگیرکەرو کوژی لەقەڵەم نادا، کە لەسەدەکانی دوازدەهەم و سێزدەهەمدا مەملەکەتەکەی خۆی لە «دانوب»ەوە گەیاندە «سین»، و بڕیارە ناوی بخەنە سەر گەورەترین ئوتێل «مەنگۆلیا»، هەروەها دەسەڵاتدارانی مەنگۆلیا کتێبیان لەبارەی ژیانیەوە داناوەو بەدامەزرێنەری نەتەوەی ئاوڕەبەین!



چیرۆکی فۆلکلۆری....

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بابەتە فۆلکلۆرییە بڵاو دەکەینەوە؛ کەچی ئێمە وەکو لیژنە وای بۆ دەچین کە زیاتر لەوە دەچێ لە فۆلکلۆری گەلانی ترەوە وەرگیرابێ؛ بەڵام بەهەر حاڵ تام و بۆیەکی کوردەوارییانەی وەبەر خراوە، ئیتر نووسەر زیاتر لەم ڕووەوە بەرپرسیارە.

لیژنەی فۆلکلۆر



# سەلیمی جەوهەری

ئەحمەد شادی

هەبوو نەبوو، دەگێڕنەوە پاشایەکی زۆر داد پەروەرو ژیرو دانا هەبووە، لە شارێکی فەرمان ڕەوایی کردووە، خەڵکی ئەم شارە پاشایان زۆر خۆش ویستووەو گوێ ڕایەڵیان کردووە: کت وپڕ شەوێـك لە شەوانی شێت بووە: بەوەزیرو حەکیمان خەریکی بوون هیـچ چارەسـەرێکی ئەوتـۆیـان بۆ نەکـراوە یەکێك لە حەکیمـەکان زۆر ژیرو ئەستێرەناس بووە، ڕوی لە وەزیران و ڕاوێـژکەران کردوو. گوتی: نەخۆشیو شێتی پاشا تەنها یەك چارەسـەری هەیـەو بەس: ..دەبێ بگەڕێن لە پیاوێکی داناو چیرۆك زان: هەر شەوەی چیرۆکێکی بۆ پاشـا بگـێڕێتـەوەو، چارەسەری دەردو نەخۆشیەکەی بکات: .. وەزیران فەرمانیان دەکـرد بەیـاساوڵ و خەڵکی شار، کە جاڕبدەن و بگەڕێن، لە پیاوێکی ئاوا زاناو دونیا دیتە: سەلیمی جەوهەری لەو شارەدا ژیـانی دەبـردە سەرو، بڕیـاریداو خۆی هەڵبژارد بەم کارە سەختە: .لە کۆشکی پاشا جێگایان بۆ دەست نیشان کردو، هۆدەی پاشـایان نیشان دا، .. سەلیمی جەوهەری لە یەکەم شەوا دەستی پێکرد.. ڕوی لە پاشا کردو گوتی: پاشای بەڕێزم ئەو چیرۆکـانـەی کە بۆت دەگـێڕمەوە هەموویان بەسەرهات و سەرگوزشتەی خۆمن کە بەسەرما هاتوون: پاشا بەبێ دەنگی بەرامبەری دانیشتبوو تاقە قسێك چیە نەیدەکرد: ..دەستی بەگێڕانەوە کرد

– ١ –

## ژیان و بەسەرهاتی سەلیمی جەوهەری

سەلیمی جەوهـەری.. کوڕی بازرگـانێکی هێجگار دەوڵەمەند دەبێت. ژیانێکی زۆر خۆش و بەختەوەریان دەبردە سەر: باوکی هەیبوو نەیبوو ئەو تاقە کوڕەی شك دەبرد، بە ئەندازەیەك خۆشی دەویست هیچ سنوری نەبوو: چی کردباو چی نەکردبا لە دڵی نەدەدا؛ لە دڵیشـەوە نارەحەت بوو، تا ڕۆژێکیان بانگی کردو گوتی: ڕۆڵە شیرینەکەم سەلیم. جگە لە خوا کەسی دیکە شك نابەم: دەست بەم سامان و پارەیەدا بگرە، چی دیکە بۆ برادەرو بۆ ڕابـواردن و، ئەم لاولادا بە بەلاش سەرفمـەکـە: ئەگـەر دەتـزانی چۆنم پەیـدا کردووە، گەیشتـوومـەتـە ئەو ڕۆژە: بەزەییەکت پێدا دەهاتەوە: ..وریای خۆت بە، ئەوانە برادەری گیـانی بەگیانیت نین برادەری سەر سفرەو خوانانن.. سەلیم گاڵتەی بە قسەکانی بابی دەهات؛ هەرزوو گوێ ڕایەڵیەکانی بیچوویەوە، دووای خستن: باوکی کەزانی سەرزەنشتی کردنی کوڕەکەی؛ بێکەڵکە ڕۆژێکی دیکە بانگی کردەوەو گوتی: کوڕم

گوێم لێبگرە: دەزانم قسەو ئامۆژگاریەکانی من لە گوێ ناگری؛ بەلام دونیایە مردن کەس ناناسێ: ئەگەر مردم وەسیەتم ئەوەیە: ئەو سامـان و دارایی‌یە وا بڕوات چەند ساڵێك لەبنی دێنی‌و هەژار دەبی، یادگـارێکم لە فلانە هۆدە بۆ بەجێ هێشتووە‌و شاردومـەتـەوە، هەر کاتێ نانی خواردنت برا، بەپەلە خۆی گەیەنەو، دەری بێنەو لەکاتی تەنگانە فریات دەکەوێت؛ بەس لەبیری نەکەی.

سەلیمی جەوهەری.. کوڕە لاوێکی بەجەرگ و نەترس و پاڵەوان بوو، کەسێ نەبوو لەم شارەدا شان لەشانی بدات لە ئازایەتی‌و سوارچـاکیدا؛ پێش ئەوەی باوکی بمرێ ژنی بۆ هێنا: ساڵێك تێوەر نەسوڕایەوە بابی مرد.. سەلیم ڕێگای هێندەی دیکە بۆ خۆش کرا؛ بەڕاست و بەچـەپ لە سامـان و ماڵەکـە وەربوو، شەوانـە بە دەیان برادەری داوەت دەکردو، دەکەوتنە بەزم و کۆڕی شەراب خواردنـەوە:. هاوڕێکـانی بە زمـانی لوس لە خشتـەیـان بردبوو، ئیشی لەسەر نەدەکرد، ڕۆژ لەدووای ڕۆژ سامانی باوکی بەرەو کەم بوونەوە دەهات. تا وای لێهات، هیچ پارەو پوڵێکی ئەوتـۆی نەمـا، خێـزانـەکـەی هەمـوو شەوێك قسـەکانی باوکی وەربەرگوێدا دەدایەوە، چ کەڵکێکی نەبوو؛. وردە وردە برادەرو هاوڕێیـە گیـانی بەگیـانیـەکـانی لێی دەتەکینەوە: ناچار بوو خانووبەرەکەی بفرۆشێت؛ ئەویشی لەبن هێناو، ڕوت وقوت مایەوە؛ کاتێك وەسیەتی بابی بیرکەوتەوە، کە نانی شەوی نەبوو بیخوات؛ پەنای بۆ هەر برادەرو دۆستێکی دەبرد، خۆیان لێدەدزیەوە، وەك قەت نەیاندیبێ‌و نەیان ناسیبێ؛ بەسکی برسی بۆ ئەو خانووەی چووە کە فرۆشتبووی، ئەو شوێن و هۆدەیەی دۆزیەوە، یادگارەکەی باوکی لەژێر زەمین دەرهێنا؛ لەنێـو سندوقێکی زەلامدا بوو نوسراوێکی بۆ بەجێ هێشتبوو خوێنـدیـەوە [کـوڕی شیرینم سەلیم: تاقـانـەکەم. هەر زوو دەمزانی تووشی ئەو ڕۆژە ڕەش و نەهاتیەت دێی، قسەکانی منـت پشـت گوێ خستـوون؛ ئەو سامـان و پولەی کە کۆم کردبـوۆوە، تۆش دەرخـواردی ناکـەس بەهـانت دەدان، بەم کورتانی حەمباڵیەم پەیدا کردبوون؛ پاشان بووم بە بازرگان، تۆش سڵ مەکـەوە، کورتانی باوکی خۆت لەشان بکەو، سەر لەنوێ تێرا بچۆوە، کەسێ کە فریات بکەوێ‌و، نانت پێبدا هەر ئەم کورتانەیە!!.]

سەلیم.. دەستی کرد بەگریان و بە فرمێسك هەڵڕشتن؛ بەزگی برسی شەوگاری بردە سەر، ژنەکەشی دڵخۆشی دەدایەوە، کە بۆ بەیانی کورتانەکە لەشان بکات، ڕۆژیان لێبۆوە، سەلیم پێی نەنگی‌و شورەیی بوو حەمباڵی بکات؛ چەند شەوێ بەبێ نان و ئاوی ژیانیان بردە سەر، تەنانەت دۆستێ هاوڕێیەکی بەلایدا نەهـاتن: .ئینجـا بیری کردەوە، برسیـەتی تینی بۆ هێنـا، بەشەرمەوە کورتانەکەی لەشان کردو بەرەو بازاڕی شار ملی نا: .خەڵکی ئیشیان پێ نەدەکرد، باوەڕیان نەدەکرد کە سەلیمی جەوهەری بۆتە حەمباڵ؛ ئەو ڕۆژەش بە دەست بەتاڵی گەڕایەوە، بۆ ڕۆژی ئایندە قۆڵی مەردانەی لێهەڵکردو، بۆخۆی بەربینگی بەخـەڵك دەگـرت کە کاری پێبکـەن؛ کام بار قورس با؛ تاوی دەدایـە، لەکۆڵی دەنا، ئەگەر حەمباڵەکانی دی باریان بەچوار پەنـاباد هەڵگرتبا ئەو بەدوو پەناباد باری دەکرد.. وردە وردە خەڵك ئیشی پێکـردو، خۆی ناسـانـد کە حەمبـاڵێکی ئازارو لەخـۆبردوو هەرزان چی‌یە.. گوزەرانی ماڵەوەی چاك کردوو، خواردنێکی بەتامی لەئارەقەی نێو چەوانەوە دەچێژت شەوانە خەوێکی بێگـەردی لێـدەکەوت بڕیاریدا هەرگیز لەگەڵ ئەو برادەرو دۆستـانە هاتوچۆو هەڵس وکەوت نەکا. [پاشا لێرەدا لەخـۆشیان دەست بە پێکەنین دەکا.] کە کورتانەکەی لەشان دەکـردەوە ماچی دەکـردو، ئامـۆژگـاریـەکـانی باوکی بیر دەکـەوتنـەوە، ئەوسـا بۆی دەرکـەوت باوکی چەنـد دڵسۆزو بەپەرۆش بووە بۆی.. دووای ماوەیەك کە باری ماڵەوەی چاك بوو هەندێ پارەی دانراوی بۆ ڕۆژی ڕەش دانابوو: کورتانەکەی بەکـۆڵ دادایـەوە، بە بەردەمی ماڵی پاشادا ڕەت بوو، دیتی کاروانێك بە بارەوە چەند فیلێك پێشەنگی سەرکاروانن، وا لە قوڕو لیتەدا چەقیون و ڕۆچوون چەند پاڵەوان خەریکیانن، کە دەریـان بێننەوە لەنێو قوڕاوەدا دەربازیان بکەن، هیچیان پێ لەگـەڵ نەکرا؛ سەلیمی جەوهەری خۆی پێ ناگیرێ‌و، لەخۆی ڕادەبینێ یەکسـەر پڕ دەداتـە گوێی فیلەکـان و بەبـارەوە ڕزگـاریـان دەکـا، لە قوڕاوەکـە و کاروان دەست بەڕۆیشتن دەکـاتـەوە... پاڵەوان و سوارچـاکان و خەڵکی شار سەریان دەسوڕمێ لە هێزو ئازایەتی ئەم کابرایە، ئەویش فیلێك بەبارەوە

هەڵدەگرێ دەماری پشتی ئازاری پێدەگاو، بەلادا دەکەوێو دوو سوار هەڵیدەگرن و دەیبەنەوە ماڵەکەی خۆی، تا ساڵێك لەسەر گازەرای پشتی رادەکشێو، هیچ ئیشێکی ئەوتۆی پێ ناکرێ ئەو پارەیەی کۆی کردبۆوە لە تەنگانە فریای کەوت: [پاشا لەتاو سەلیمی جەوهەری دەست دەکا بەگریان.] کە پشتی چاك بۆوە سەلیمی جەوهەری بریار دەدات ئەو شارە بەجێبهێڵێو، بچێتە شارێکی دی، ژنەکەشی بەجێهێشت و، خانووبەرەیەکی کەلاوەی بۆ سازدابوو، هەندێ پەناباديشی بۆ بەجێ هێشت و لێیداو رۆیی...

– ٢ –

## دێوی رەش

کاتێك سەلیمی جەوهەری لەو شارە سەری خۆی هەڵگرت، چەند شەوو چەند رۆژ بەدەشت و بان و شاخاندا رۆیشت. وەختی نیوەرۆژێك توشی شوانکارەیەك دەبێو، مێگەلە مەرێکی مۆڵ کردبوون. سەلیمی جەوهەری لە دوورەوە دەستی هەڵبریو گوتی: هۆی کاکی شوان بەدەوڵەت بی: شوانەکەش بەخێر هاتنی کردەوە.

ئەوجا سەلیم داوای لێکرد کە لە تکەنانێ پێخورێکی بداتێ؛ زۆری برسی بوو شوانە بەروویەکی خۆشەوە فەرموی لێکرد؛ یەکسەر چوو دەستی بەمەر دۆشین کرد، قاپە شیرێکی بۆ هێناو چارەکە نانێکیشی بۆ لەبەردەم دانا، پێش ئەوەی نان و شیرەکە بخوات شوانە خەو بردیەوە: .. یەکێك لە مەرەکان خۆی دەگەیەنێت و بە سەلیم دەڵێت: کورە نەکەی دەخیلت بم؛ ئەو شیرەی نەخۆیتەوە، دەنا وەکو ئێمە دەبیتە مەر ئەوە شوان نیە، دێوی رەشە خۆی وا گۆریوە، ئێمە مرۆڤین و بەنی ئادەمین جادوی لێکردووین و بەم فێڵە هەڵی خەڵەتاندووین:. شوانە بەئاگا دێتەوە، سەلیمی جەوهەریش قاپە شیرەکە دەرێژێت و، نایخواتەوە ئینجا شوانە پێی دەڵێت: کاکی رێبوار شیرەکە خۆش بوو، با قاپێکی دیت بۆ بدۆشم، ئەویش دەڵێت: نا کاکی شوان لێت مەمنونم تێرم خوارد.. شوانە شکی لێدەکاو داوای لێدەکا کە شەویش میوانداری بکات: سەلیم کە بەم نەهێنییەی زانی بریاری دا ئەم مەرە بەستەزمانانە رزگار بکا لە دەستی دێوی رەش، شەو لەگەڵی چووە، ملیان بە غارێکی عاسێوە نا:. کە تاریکی بەسەرداهات مەرەکان دەبنەوە بەبەنی ئادەم و، شوانەش بوو بە دێوێکی زەبەلاح و رەش: هەرچی کەسێ هەبوو لە ئاغەڵی دەکردن و، دەرگای لێ پێوە دەدان ، تاو نا تاوێ ببونەوە مەرو، وەباعە باعی خستن؛ ئینجا روی لە سەلیم کرد، ها رێبوار شیرەکەت خوارد، دیارە تۆ فێڵ بازو پاڵەوانی؛ دەردت لەگیانم ئێستا خۆت دەبینیەوە سەلیمی جەوهەری لەنێو ئەم غارو ئەشکەوتە ئەفسوناویە تینی بۆ هات و، رەنگی هەڵبزرکا، دەرگای لەسەر داخرابوو، دەرباز بوونی بۆ نەدەکرا [پاشا لەتاوان دەستی کرد بەگریان:] بەفێڵ و بە ئاقڵانە خۆی گەیاندە مەرەکان، مەرێکی دی بانگی کردوو گوتی: کاکی غەریبە نەکەی نان و شیرو گۆشت بخۆی لەگەڵ کورە وەك ئێمەت لێ بەسەردێ پاش تاوێکی دی ئاگر دەکاتەوەو، گۆشت دەبرژێنێت و، شەراب دەخواتەوە؛ بەو شیشە گۆشتانە چاوی کوێر نەکەی نامرێت، هەرکە خەوی لێکەوت شیشەکان سوور بکەوەو، مەردانە لە چاوانی رۆبکە دەزووکە برۆوە لای؛ دێوی رەش مەرێکی کردبووە قاورمەو بە برژاوی دەیخوارد، سەلیمی جەوهەری بەفرت و فێڵ دەستی کرد بە خواردن لەگەڵیا؛ نەدەوێرا بڵێت ناخۆم: دێوەش دەیویست بیکاتە مەرو بیباتە نێو ئاغەڵەکە دێوی رەش تاو نا تاوێ روی تێ دەکردو دەیگوت: ئەمن هەتا ئێستا ئەم هێشتووە غەریب و رێبوار بێرەدا رەت ببن تا خزمەتم نەکردبن؛ زۆری بخۆ، گلەیی لەسەر خۆتە؛ دێوە زۆر زۆری خواردو کە چاوی کەوتنە خەوەوە؛ لێی خەفتا؛ دەیزانی نوستنی دێوان وەك مرۆڤان نیە، کاتێ کە خەویان لێکەوت چاویان بز دەچن، کە بە ئاگاش بوو چاویان دەنوقێت !!، شیشە گۆشتەکانی بەفێڵ خستنە نێو گری ئاگرەکەو، بەرامبەر بەدێوەکە راوەستا؛ تا شیشەکان سور بوونەوە بەچاکی؛ ناوی خوای هێناو هەردوو شیشە سوور بووەکانی بەدەستی گرتن و لە چاوەکانی رۆ کردن؛ چرە دوکەڵی لێبەرز کردنەوە؛ دێوە لەتاو ئازاری دەیناڵاند، هێندەی نەدەما ئەشکەوت و غارەکە تێك برووخێنێ بەم لاو لادا دەخولایەوە، تا بەسەر پشتاکەوت وگوتی: ئەمزانی رێبوارێکی لەمن فێڵ بازترو، چالاکتری؛ ئەگەر زووتر کوشتبامی ئێستا توشی ئەم رۆژە رەشە نەدەبووم؛ سەلیم گوتی: دێوی دزێو بگرە لە دەستانم ئەمەیە ئەنجامی کاری خراپەو دز

ـه مرۆڤـایـەتی، دەهـەڵگرەوەو مەرگ بنۆشە؛ ئینجا مەرەکان
ـەخـۆشیـان دەستیـان کرد بە باعە باع ..یەکێك لە مەرەکان
ەواری کرد؛ هۆی کاکی پاڵەوان خوێنی دێـوەکـەش بەسەر
ـێمەدا بکەو، دەبینەوە مرۆڤی جاران: زووکە فریامان بکەوە!..
ـەلیم هەر بە پەلە خوێنەکەی پرژاندە سەر مەرەکان، بوونەوە
ـە بەنی ئادەمی؛ دەستیان لەمل یەکتر کردو، زۆر ستایشیان
کرد [پاشا لەخۆشیان قاقا پێدەکەنی]. سەلیمی جەوهەری ماڵ
ـاوایی لەوان کردو، ئەشکـەوتەکەیان بەجێ هێشت و، ئەو بە
ـەنیا مل ڕێگای گرتە بەرا..

- ٣ -

## دۆڵپای بەحری

سەلیمی جەوهەری ئەشکەوت و غارەکەی جێهێشت و، ڕۆیی
ـۆیی چەند ڕۆژان تا گەیشتە سەر چۆم و ڕووبارێکی بێئامان؛
کەرا لە شوێنێکی بوار کە بپەڕێتەوە، پیاوێکی پیری دیت لەڕۆخ
ـووبارەکە دانیشتبوو، سەلیم ڕوو لە پیاوەکە دەکات و دەڵێت:
خاڵە پیرە بۆ وا بە مەلولی دانیشتووی. کابرای پیریش نوزەیەکی
ـەبەرەوە دێت و، دەڵێ: برای خۆم پیرم و ناتوانم خۆم لەقەرەی
ئەم ڕووبارە بدەم، دەترسم ئاو بمبات. سەلیم دەڵێ: دەستت
بێنـە لەگـەڵ خۆم دەت پەڕێنمەوە. کابرای پیر ڕازی نابێت .
پاشان گوتی: ئەگەر لەکۆڵم دەکەی خێرت دەگاتێو لەو ڕووبارە
دەربازم بکەی، سەلیمی جەوهەری بەزەیی پێدا دێتەوەو، لەکۆڵی
دەکـات و، بەنێـو ئاوەکـەدا دەڕوات.. کابـرای پیر هەردوو
قاچەکانی پێوە گیر دەکاو، خۆی توند دەکا؛ درێشێکی تیژی پێ
دەبێولەبەر پشتێندێ دەری دێنێ جار بەجار درێشەکەی لەمل
دەژەنێت: ئەویش ڕادەوەستێو، بەکابرا دەڵێت: خاڵی خۆم من
چاکەم لەگەڵدا کردوویو، لەکۆڵم کردووی، بۆ ئەو سوژنە تیژەم
لەمل دەژەنی؛ ئەوە چاکەم دەدەیتەوە: کابرا دەنگ ناکاو هەستێ
لەخـۆی دەبرێلەنیوەی ڕووبارەکە دووبارە درێشەکەی بەبێ
بەزەییانە لەمل دەژەنێتەوە: سەلیمی جەوهەری ئازاری پێدەگا:
ڕووی تێدەکاتەوەو دەڵێت : خاڵە لەبەر خواو ئەرکێکی مرۆڤانە
نەبێ

فرێت دەدەمە نێو ئەو ڕووبارەیو بخنکێیو، ئاو بتبات وازبێنە
کابرا قاقا پێی پێدەکەنێو دەڵێت: قورت بەسەر بەنی ئادەم،
توشی دەردی خۆت هاتـوی، من دۆڵپای بەحریم: دەفرێم بدە
ئەگـەر ئازای تازە لەکـۆڵیتۆ نابمەوە.. سەلیمی جەوهەری کە
گوێی لەم قسـانە دەبێ ڕەنگی زەرد هەڵدەگەرێ دەیویست
فرێی بدا، کابـرا لەپشتێ ئەدەبۆوەو، ئەدەکەوتە خوار، زۆر
خەریـك بوو بێکەڵك بوو: دۆڵپاش لێك لێك درێشەکەی لەملی
دەداو، خوێناو بە گەردن و سەرشانیدا دەهاتە خوار، هەر ئەو
بەرو ئەوبەری ڕووبارەکەی پێدەکرد لەتاو ئازارو ژانی سەرو
مل، فرمێسکیدا دەباراندن. [پاشا دەستی بە گریانێکی بەکوڵ
کرد.] دوو ساڵ دۆڵپـای لە کۆڵ نەبـۆوە، دەینـاڵاند لەتاوی
ئازارەکەی دۆڵپاش دەرمانێکی پێبوو، کە برینەکان زۆر سەخت
دەبوون، دەرمانی دەکردو چاکی دەکردەوە، پاشان وەك خۆی
لێدەکردەوە: بە سەلیمی گوت: بمبە بۆ سەر ئەو کانیاوەی کە لە
نزیکی باخەکەمدایە، لاق هەڵێنە تینوومە دەنا برینە کۆنەکانت
دەکولێنمەوە.. ئەویش لەتاو ئازارو ژان و، کۆڵی سەر شانی، بە
پەلە بردیـە سەر کانیـاوەکـە؛ کاتێ ئاوی خواردەوەو، چەنـد
درێشەیەکی لەمل ڕاکردەوە، بەکۆڵی سەلیمەوە خەوی لێکەوت:
دوو ساڵان ئەم ئازارەی چێشت، ئەو خەوی لێنـەدەکـەوت،
دۆڵپـای هەر بە پشتـەوە بوو، کاتێـك دەنگێکی بیست.. دوو
تەیـری بچکۆلانە هاتنە سەر ئەو دارەی کە لەسەر کانیاوەکە
بوون: یەکیـان دەیگـوت ئای بۆ سەلیمی جەوهـەری توشی
ڕۆژگارێکی سەخت بووە، ئەوی دیکەش دەیگوت: حەیف بۆ ئەم
پیـاوە ئازاو قارەمانە، دەبا چارەسەرێکی بۆ بکەین:. هەردوو
باڵندەکە ڕویان لە سەلیم کردو گوتیان: یەك چارە هەیە دۆڵپای
بەحری لەنێو بچێت و سەلیم ڕزگاری بێت.. هەستێت بچێتە نێو
باخەکەیو کولەکەیەکی گەورە لێبکاتەوەو ببیات پری کا لە ترش
و خوێو تفتێو تاڵیو بیخـاتە ژێر زەبڵ و سەران گوێلکێ، بۆ
ماوەی چەند ڕۆژان لێی گەرێت تا دەرزێت و دەترشێت ئینجا
دەری بێنێو، بە دۆڵپـای بەحـری بڵێت، ئەمن زۆرم برسیەو
کەیفم بە خواردنێکی زۆر خۆش دێ، داواشی لێبکا نەیداتێ، تا
بەزۆر لێی دەستێنێو، دەیداتێ: کە خواردنەکەی خوارد، ئەو

ترش و سویریه قورگی دەبرێتو، داوای لێدەکا بیباتەوە سەر کانیاوو ئاوێ، ئەویش ئەگەر جوامێرو قارەمان بێ خۆرابگرێو بەرگەی درێشەکانی بگرێت و، دووری بخاتەوە لە ئاوو، بەرەو بیابان و وشکارۆیەك هەنگاو بنێت: تا دۆڵپا وای لێدێت لە تینوان بەلادا دێت و، لە کۆڵی دەبێتەوە سەلیمی جەوهەری کە گوێی لەم وت و وێژە بوو دڵی خۆش بوو، دۆڵپاش وەخەبەر هات:. ئینجا چوو بۆ نێو باخ و کولەکەیەکی باشی لێکردەوەو، بە دۆڵپای دەگوت: ئەمن خواردنێکی بەتام بۆ خۆم دروست دەکەم، دۆڵپاش لە کۆڵێ کرابوو، چ غەم و ژانێکی نەبوو پێ‌دەکەنیو، جارجارەش سوژنەکەی لەمل دەژاندەوە، دوو باڵندەکان چییان پێکوتبوو، وایکرد، تا رۆژی خۆی هات و، داوای لە دۆڵپا کرد کە رێگای بدات و خواردنە خۆشەکەی بەتەنیا بخوات، دۆڵپا کە زانی بەشی نادات بەزۆر لێی ستاندو درێشەیەکیشی تێوە راکرد، خواردنەکەی بەتەنیا خوارد.. کاتێ لە خواردنەکەی بۆوە زارو قورگی بری، شێت بوو، داوای لێکرد بیباتە سەر کانیاوێك، سەلیمی جەوهەریش بەرەو وشکانی ملی دەنا، هەرچەندە درێشەی زۆری بەردەکەوت و، ئازارو ژانی پێ دەگەیشت، خۆی راگرت: بەرەو هەورازو بیابانا ملی دەنا، تا دۆڵپا پەکی کەوت و بەلادا هات ئینجا رووی تێکردو گوتی: قورمساخ ئەمەیە ئەنجامی کاری نامەردیو زۆرداریت من چاکەم لەگەڵدا کردی: دە بخنکێ لەتینوان.. سەلیمی جەوهەری لە خۆشیان گەرایەوە سەر کانیاوەکەوە تێر ئاوی خواردەوە. [پاشا لە خۆشیان دەستی بە پێکەنین کرد.] ئینجا ئەم باخ و شوێنەوارەشی بەجێ هێشت.

- ٤ -

## میوان خانە

ئەو رۆیشتنەی رۆیشت، تاگەیشتە شارو ئاوەدانیەك، لەم شارەدا زۆر گەرا کەس رای نەگرت.. سەری سوڕما پرسیاری کرد لەیەکێك لەماڵەکان.

ئەوانیش پێیان گوت: فەرمانی پاشایەو، میوان خانەی بۆ غەریب و ئاواران دروست کردووەو خزمەتیان دەکەن.. سەلیمی جەوهەری میوان خانەی دۆزیەوەو رووی تێکرد.

کابرایەکی مجێوری خزمەتی دەکردن و، بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردو، جێگایەکی تایبەتی بۆ دانا، لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی خۆی، خواردنی دەدایەو، دەینواند.

سەلیمی جەوهەری لەسەر هەست دەخەوت، شەوێکیان کابرای مجێوری دیت کێردێکی زل و تیژی بەدەستەوە بوو، پری دایە میوانێك، کە غەریبەو رێبوار بوو، دەم و لوتی گرت و، بردیە دەرەوە بە سیلەی چاو تەماشای کردو، خۆی لێگرت.

دیتی لەدەرەوە سەری دەبڕێو، گۆشتەکەی چاك دەکاو، دەیکاتە خواردنیمیوان و غەریبان بەهێواشی هاتەوە جێگای خۆی بۆ سبەی شەو لەترسان نەوێرا بنوێت، پێشی نەنگی بوو بڕوات و رابکات دەیویست ئەو خەڵکە هەژارو رێبوارانەی رزگار، بکات؛ وای لێهات نۆرەی گەیشتبۆ سەر، نیوەشەو لەجێگاکەی خۆی رۆیشت و کوڕی مجێوری خستە جێگاکەی؛ کابرای سەربڕ پەیدابوو، بەبێ ئەوەی تەماشای بکا، بەرۆژ هەڵی دەنان.

کوڕەکەی خۆی بردو، سەری بڕی.. سەرەکانیشی دەخستنە نێو تورەکێك و لە تاقەیەکی بەلاوە دەیشاردنەوە، تا زۆر دەبوون و، لەدووری شار حەشاری دەدان بۆ سبەی سەلیمی جەوهەری کە کارەکەی بەتەواوی شارەزابوو شوێن تاقەکەی پێزانی، خۆی گەیاندە پاشای شار، بۆ خۆی نانی ئەو میوانخانەی نەدەخوارد کە کابرای مجێور کوڕی خۆی سەربڕیو، گۆشتەکەی چاك دەکردو بیداتە رێبوارو غەریبان [زۆر گریا پاشا.] سەلیمی جەوهەری هەرچۆنێ بێ خۆی گەیاندە دیوە - خانی پاشاو گوتی: گەورەم پاشا نەمزانیوە لەم شارە بۆ میوانخانە دروست کراوە؛ دیارە ئێوە فێرن سەری زەلامان سەربڕن و، گۆشتەکەشی بکەنە خۆراکی میوانان: ئەوەیە رێزو پیاوەتی پاشا کە گوێی لەو قسانە بوو، زۆر نیگەران بوو رووی لە سەلیم کرد: ها کابرای غەریبە لە قسەکانت ناگەم؛ مەبەستت چیە؟! سەلیمی جەوهەری گوتی: قوربان مجێوری میوان خانە، سەری خەڵك سەر دەبڕێو، گۆشتە کەشی دەداتە میوانەکانی، بۆ درۆو راستی قسەکانم لەگەڵم وەرن. دوێنێ شەو نۆبەی من بوو سەرم ببڕێت، بەڵام توانیم خۆم رزگار بکەم

و کوڕی مجێـوەرم لە جێگـاکەی خۆم نواندو، منیش چوومەتە جێگاکەی: ئەویش پێی نەزانیووە کوڕی خۆی سەر بڕیووە.. پاشا فەرمانی بە یاساوڵەکانی دەرکرد کە لەگەڵی بچن؛ کە چوونە میوان خانە؛ چی گوتبووی ڕاست دەرچوو ئینجا بە مجێوەری گوت: بڕۆ لە فلانـە تاقـە ئەو تورەکە سەر براوانە بێنە بزانە سەری کوڕی خۆشتیـانی تێـدایە یان نا؛ کەچوو چەپەڵۆکی بەسـەر خۆی داداو، دەستی کرد بەگـریـان.. پاشا فەرمانی دەرکرد لەداری بدەن.
سەلیمی جەوهەریان خەڵات کردو بڕیاریدا ژنێکی جوانیشی بدەنێ.

[پـاشـا لە خۆشیـان دەستی کرد بەپێکـەنـین]. ئافرەتەکەی گواستەوەو وای بەباش زانی چەند ساڵێك بمێنێتەوە؛ بەلام لەم شارە داب و نەریتێکی سەیـری تێدابوو. ئەگەر لەژن و مێرد یەکێکیان مردبا، ئەوی دیشیان بەزیندوویی لەگەڵ دەخست و خواردنی چوار ڕۆژیان لەگەڵ دەخست. بۆ بەدبەختی سەلیمی جەوهەری ژنەکەی مرد؛ زۆری نەخایاند لەسەر سەلیمیان داو، نانی چوار ڕۆژیـان پێـداو، خستیاننە نێو بیرێکەوە!.. [پاشا دەستی کرد بەگـریـان] سەلیم بەتـەنیا لەنێو ئەو زیندانەدا مایـەوە، گوێی لە دەنـگـێـك بوو، کە نزیـکی بۆوە، ژنێکی جوانکیلانە بوو، مێردەکەی کردبوو ئەویشیان خستبۆ نێو ئەو چاڵە زیندانیە.. سەلیمی جەوهەری خواردنەکەی لەگەڵ بەش کردوو بڕیاری دا ئەگەر ڕزگاریان بێت بیهێنێت؛ خواردنەکەیان لێبـڕا، سەلیم تینی بۆ هات شەو بەسـەرداهـات لە برسان و لەتـرسی مردن کە دەربـاز بوونی بۆ نەدەکـرا تینی بۆ هات؛ نیوەشەو گوێی ڕاگرت دەنگە دەنگێك و قرچە قرچ و خشەخشێ دێ گوێی هەڵخست و بەرەو دەنگـەکە بەچنگە ڕنێ ڕۆیشت کەچاوی پێکەوت ڕێویەو گۆشتی مرۆڤە مردووەکان دەخوا، پڕی دایـەو کلکی گرت. ژنەکە دەیگوت: سەلیم گیان بەری نەدەی گۆشتەکەی بەشی سێ ڕۆژ دەکاو دەیخۆین. ئەویش گوتی: نا، ئەو ڕێویەیە ئەگەر ڕزگارمان بکا، چۆن گۆشتەکەی دەخۆین، وەرە دەست بە پشتێندی منەوە بگرە، تا دەمانکەیەنێتە دەر.. ڕێویەکە لەتاو ئازاری خۆی بەهەمان کون ڕۆیشتەوە، سەلیمی جەوهـەریش بەدەست کونـەکـەی فراوانتـر دەکردو، گڵەکەی دەردەدا؛ ژنەکە هێزی لێبڕابوو لەنێو زیندانی چاڵەکە مایەوەو مرد، ئەو بەخـۆڕاگری خۆیو، بەهەوڵدانیو بەهۆی ڕێویەکە ڕزگاری بوو، [پاشا دەستی بە پێکەنین کرد] ئەویش بڕیاریدا ئەو شارەش بەجێ بهێڵێ...

- • -

## مەیموونی سپی

پاش چەند شەوو ڕۆژان، هەر ڕۆیشت، برسیەتی تینی بۆ هێنا، شەوانە بەسەر دارانەوە دەنوست لەترسی دڕندەو زیندەوەری بەزەر، دەسـتـی کرد بە گەلا خواردن: گەلای دارو باری دەخوارد، شەوێکیان لەسەر دارێکی بەرز خۆی مەلاس دابوو، یەك ڕەوە مەیمونی لێیدا بوون، تا ڕۆژ بۆوە نەوێرا بنوێت، مەیمـونـەکـانیش بۆنی ئادەمیـان کردبوو گەمارۆیان دابوو، چاوەڕێی بوون کە لە دارەکە بێتە خوار.. سەلیم ناچاربوو هاتە خوارو، دەست و لاقیان بەستن و بەتەنیا جێیان هێشت. [پاشا دەستی کردەوە بە گریـان]. مەیمـونـەکـان خەبـەریـان بۆ پاشایەکەیان بردەوە، مەیمونی سپی پاشای ئەم شارە بوو، کە مەیمون بوون و بەس؛ سەلیمی جەوهەریان هەڵگرت و بردیانە ژووری پاشاکەیان مەیمونی سپی زۆر کەیفی خۆشبوو، داوای لێکرد کە بیخوازێو، ببێتە مێردی ئەویش لەبەر مەیمونی سپی دەپـاڕایـەوە بێ‌کـەڵك بوو؛ مەیمونی سپی مێردەکەی مردبوو، پاشـایەتی بۆ وی بەجێ‌هێشتبوو.. مەیمونی سپی هەڕەشەی لێکـرد ئەگـەر نەیهێنێت بیکوژێت؛ ئەویش بەناچاری بڕیاری دایە کە دەیهێنێ!.. شاییو زەماوەندیان بۆ گێڕان و سەلیمی جەوهـەریان کردە پاشای خۆیان؛ بەتەنیا لەشاری مەیمونان فەرمان ڕەوایی دەکرد، چەند ساڵێ بەم جۆرە ژیانی بردە سەرو کوڕو کچێکی لەمەیمونی سپی بوون!.. ڕۆژێکیان زۆر بێزارو نارەحەت بوو، نەیدەزانی بەچ فێڵ و ڕێگایەك خۆی دەرباز بکا، ڕووبـارێکی پان و فراوانی لێبوو لەنزیك شارەکەیان، بەبۆنەی ڕاوو مەلەکـردنـەوە کەڵەکێکی بەتەختەو داران دروست کرد،

هەموو ڕۆژێ ڕاوی دەكرد، تا بەتەواوی شارەزاو كارامە بوو، ئەوجا سواری كەڵەكەكە بووو بەیەكجاری تێی تەقاندو ڕای كرد؛ مەیموونەكان بەغاردان هەواڵیان بۆ مەیمونی سپی برد، كە سەلیمی جەوهەری ڕای كردووە. ئەویش بە پەلە دەستی كوڕو كچەكەی گرت و هاتە ڕۆخی ڕووبارەكە؛ ڕەنگ و ڕوخساری كچ و منداڵەكە لە سەرەوەیان وەك ئادەمی وابوون لەخوارەوە شڕا مەیمـون بوون.. مەیمـونی سپی هاواری دەكـردو دەیگـوت: سەلیمی جەوهەری بگەڕێوە دەنا كچەكەت بە ئاوێدادا دێڵم! ئەویش لەو بەریـرا دەیگـوت: پێیـدا بێڵە كچی خۆت نی‌یە.. مەیمـونی سپی كچـەكـەی بە ئاودا داهێشت، پاشـان ڕوی تێكـردەوە؛ سەلیمی جەوهـەری كوڕەكـەت پێیدا دێڵم ئەگەر نەگەڕێیەوە، سەلیمیش دەیگوت: بە ئارەزوی خۆت بكە كوڕی خۆتـە.. مەیمـونی سپی كوڕەكـەشی پێـدا هێشت؛ سەلیمی جەوهەری خوا خوای بوو ڕزگاری ببێ هەر نەگەڕایەوە [پاشا لە خۆشیـان دەستی كرد بە پێكـەنـین]. ئەوجـا بڕیاری دا ئەو شوێنەوارەش بەجێ بهێڵێ.

- ٦ -

## پەری بەحری

سەلیـمی جەوهــەری شاری مەیمــونــانی بەجێ هێشت و، بەنەشارەزایی ڕوی كردە شوێنێكی دی. تا گەیشتە شارێكی گەورە، لە دەروازەی شار ئاوابوو دەستی بەگەڕان كرد دیتی چۆڵ و هۆڵە ڕوح لەبەرێكی تێدا نی‌یە. چەند ڕۆژ بوو بەری داروگەڵای خواردبوون، زۆر برسی بوو، دەنگی هەڵبڕی لەو ماڵ ئەو ماڵ كەسی نەدیت و، كەسیش وەڵامی نەدەدایەوە.. تەواوێك سەری سوڕمـابـوو كوچـەو كۆڵان نەمـا چەنـد جارێ پێیدا نەڕوات؛ لەپڕ پیرەژنێك بانگی كرد، لەخۆشیان بەرەو دەنگەكە هەنگاوی هەڵهێنان، لە خانوێكدا بوو، نەیدەزانی لەكوێ قسان دەكـا!. پیرەژنەكە سەری تەندورێی هەڵدایەوەو گوتی: وەرە غەریبـە لەســەرەخۆ قسان بكە، چت دەوێو بۆكوێ دەچی!. سەلیمی جەوهەری بەواق وڕمانەوە سەیری پیرەژنەكەی كردو گوتی: دایـە پیرە ئەوە چی دەكەی لەنێو ئەو تەندورەی، وەرە

دەرێ پێخۆرێكم دەیەو خێرت دەگاتێ زۆرم برسیە.

پیرەژن گوتی: كوڕی خۆم وەرە نێو تەندورێ جا بەسەرهاتی ئەم چۆڵەوانی ئەو شارەت بۆ باس دەكەم!. ئەویش خۆی هاویشتە نێو تەندوورەكەو؛ لە پشتیری هەندێ خواردنی بۆ هێناو ئینجا پێی گوت: كاكی ڕێبـوار بیكە بەرای خوا ئەوە خواردنەكەت خواردو هەستـە بڕۆو خۆت دەربـاز بكـە دەنـا لەنـاو دەچی سەلیمیش گوتی: پیرە دایێ ئەستەمە بڕۆم تا نەهێنی ئەو كارە نەزانم و چارە سەری نەكــەم. پیرەژن گوتی: كوڕە لاوە بەتـۆ چارەســەر ناكـرێ سەدان پاڵەوانی وەكـو تۆ وایـان گوتووەو نەشمــاون، بەقســەی دایكی خۆت بكـە زەرەر دەكـەی بڕۆ، سەلیمی جەوهەری هەر سوور بوو داوای لێكرد باس و خوازی ئەم شارەی بۆ بكات، پیرەژن گوتی: كوڕم كچی پاشای شێت بووەو، گۆشـتی سەگ و پشیلەو بەنی ئادەمیـان دەخــوات قرەواری لەم شارە بڕیـووە، تەنهـا ئەمن ماوم لەو شارەیـدا، ئەویش پێی نەزانیـوم كە لەنێـو ئەو تەنـدوورەی دام، دەنا لەمێژبوو دەیخواردم، پاش دوو ڕۆژی دیكە دێتەوە ناو شارو، ئەو ڕۆح لەبەرەی تێیدا ماوە دەیخوات:. سەلیم گوتی: پشت بەخـوا پیرەدایێ بۆت دەكوژم. پیرێژن پێكەنی‌و گوتی: كوڕم بەدەستی بەتاڵ چ دەكوژی ئەو چەتیوە هارو شێت و پاڵەوانە، مادام هەر بەقسەم ناكەی بڕۆ لەدیوەخانی پاشا كەچۆڵ و هۆڵە شمشـێرێكی باش بێنەو خۆت ئامادە بكە، سەلیم هەر لەجێ لەگەڵ پیرەژن ڕۆیشتن و شمشێرێكی تیژیان هێنا؛ بۆ ڕۆژی چوارشەمەی كەسەرە ڕۆژی هاتنی بوو كچی پاشای بەسواری ئەسپێكی ڕەش هات؛

دەیزیقاندو بەكوچەو كۆڵانی شاردا دەسوڕایەوە پشیلەو سەگی دەدیت یەكسەر پڕی دەدایەو دەیخوارد [پاشا دەستی كرد بەگریان].

سەلیمی جەوهەری پیرە دایێ لەنێو تەندورەكە بەجێ هێشت و، نەعرەتەی لێدا بەرەو ڕووی كچەی هارو شێت چوو. كە كچەكە دیتی بەغارو ڕەبازی هات كەبیخوات سەلیم جوامێرانە یەكەم شمشێر لە ئەسپی هێنایە خوارو،نەیهێشت ڕاست ببێتەوەد دوو كەرتی كرد [پاشا لە خۆشییان دەستی كرد بە پێكەنین]. ئەوجا

گەڕایەوە بۆ لای پیرە دایێ‌و، مزگێنی دایە کە کوشتوویەتی.. ـەخۆشیان دەربەڕیە دەرو ڕوی تێکردو گوتی: جا کوڕی خۆم ـلێ بڕۆی‌و بەجێم بێـڵی دەبێ ئەو شارەی ئاوەدان بکەینەوە ـۆش ببە بە پاشای شار.. سەلیمی جەوهەریش گوتی: پیرە دایێ ئەمن پێویستم بە ژن هێنانەو، لەکوێی بێنم؛ شار وا چۆڵ و هۆڵ بێ؛. پیرێژن پێکەنی‌و گوتی: کوڕی خۆم مادام ئەتۆ ئەو بەڵایەت لەسەر لابردین، باشترین کچە پەریم بێ شك دێت، هەر لایقی تۆیـە. ئەویش دڵخۆش بوو ئەگەر وای پێگوت پیرە ـایێ دەستی بە پیلان و فێڵ دانانەوە کرد کوڕم سەلیم لەو بەحـرەی کەنـزیکی شارەکەمانە هەموو ڕۆژی جومعان کچی پاشای پەریان و کچی وەزیرەکانی کاتی نیوەڕۆیان دێنە ڕۆخ بەحرەکەو کەمێ شایی‌و زەماوەند دەکەن و دەمێننەوە، پاشان ـەچنەوە نێو بەحرێ؛ بەڵام هێندە جوانن و ناسك و نازدارن ـەبێ وریـای خۆت بی دەنا دەبووریێیەوە؛ جا ئێستا ڕۆژێکی ماوە بۆ جومعـەی سەلیـمـی جەوهـەری شەوو ڕۆژی لەلا نەدەڕۆیشتن، عاشقی کچی پاشای پەری بەحرێ بوو پیرەدایێ بڕیاری‌دا، ڕۆژێك پێش هاتنیان چاڵێك هەڵکەنن و سەرەکەی داپۆشن و بچنە ناوی، تا ئەو کاتەی دێنەدەر لەبەحرو، زەماوەند دەکـەن، ئەویش پڕ داتـە کچی پەری بەحـرێو، بیگـرێو بیـهـێـنێت.. سەلیم دڵی خۆش بوو لەم شارەدا بمێنێتـەوەو ئاوەدانی بکـاتەوە. بۆ ڕۆژی جومعە چیان بڕیار دابوو وایان کرد، لەنێـو چاڵەکـەدا خۆیـان حەشـاردا، نزیکی نیـوەڕۆ کچکۆڵەیەکی نازك و جوان لە بەحرەکە هاتە دەر، خەریك بوو پیـلی بگرێو بۆی بچێت، پیرە دایێ نەیدەهێشت، ئەوە کچی وەزیـری دەستـە چەپی شای پەریـان بوو، دووای ئەو کچی وەزیری دەستە ڕاست هاتە دەرێ ئینجا کچی پەری شاژن و جوان و قەشەنگ بەلارو لەنجە هاتەدەر.. یەك لەیەکتر جوانترو ناسکتر بوون، دەستیان کرد بە زەماوەندو بە شایی. پیرە دایێ ڕوی کردە سەلیـم و گوتـی: کوڕەکـەم بتـبـیـنـم ئەوەی سەرچـۆپی‌یـەکـەی گرتووە کچی شای پەریانە وریابە، دەی ڕاپەڕە! سەلیمی جەوهەری هێزو تینی تێدا نەمابوو مێرخاسانە هەڵەتی بردو، کچە پەری گرت و باوەشی پێدا کردو، بردیەوە نێو شارو لەبەحر دووری خستەوە [پاشا دەستی کرد بە پێکەنین.]

مارەی کردو چەنـد ساڵێك ژیانێکی بەختەوەرو خۆشی لەگەڵدا بردە سەر کوڕو کچێکی لێ پەیدا بوو، شاریان ئاوەدان کردەوە ڕۆژێکیـان شاژنە پەری بیری دەم چۆم و ڕووباری کردنەوە، داوای لە سەلیمی جەوهەری کرد، کە بچن و زەماوەندێ ساز بکەن، ئەویش دڵی نەشکاندو لەگەڵی ڕۆیشت: دەستیان کرد بە مەلە کردن، کچـە پەری ماڵ ئاوایی لێکـردو گوتی: سەلیمی جەوهەری، خۆت ماندوو مەکەو، لەبیرم بکەو، ژنێکی دی بێنە؛ هێندە جوامێرو ئازاو قارەمان بوویت، بۆیە دڵم نەهات بەجێت بێڵم چەند ساڵە لەگەڵتام، ئێستاش منی پەری بەحریم تاسەر بۆتـۆ نابم، بەخوات دەسپێرم؛ کچی پاشای پەریان خۆی ون کردو، کچ و کوڕەکـانیشی وەك دایکی بیری بەحـریان دەکرد، ئەوانیش خۆیان بە بەحرەکەدا کردو ماڵ ئاواییان لە باوکی کرد. سەلیمی جەوهەری هێندەی ژن و منداڵەکەی خۆش دەویست، هەرگیـز بیری لەو ڕۆژە نەدەکردەوە، خەریك بوو شێت ببێت، لەتاوان ئەویش خۆی بە بەحرەکەدا داداو، نەیتوانی مەلە بکاو خۆی ڕزگار بکا، هێندەی نەما بخنکێت، کوڕو کچەکانی لەبنی بەحرەکەدا بۆی هەڵکشانە سەرو باوکیان ڕزگار کردو لەڕۆخ بەحـرەکـە بەجێیـان هێشت گەڕانەوە لای دایکیان [پاشان دەستی کرد بەگریان]. کاتێ کە بەهۆش خۆی هاتەوە دیتی نە کچە پەری‌و نەکوڕو کچەی لاماون، بڕیاری دا، لەم شارەشدا نەمێنێتەوەو بڕوات:.

– ٧ –

## گەوهەری شەو چراغ

بە برسیایەتی‌و ماندوو بوون، تا تینی هەبوو ئەو شوێنەوارەشی بەجێ هێشت پاش چەند شەوو چەند ڕۆژان ڕێگای کەوتە نێو جەنگـەڵ و دارستـانێکی چڕو پڕ لە ڕۆخ دەریـایەکی پان و فراوانا: کە شەوی بەسەردا دەهات لەسەر داران هەڵدەنیشت و دەخـەوت: شەوێـك لە شەوانی لەنێـو ئەو دارستـانـەدا لەنێـوەشـەوێـدا شڵپ و هوڕی ئاوەکـە هات، خەوی لێزڕاو تەمـاشـای خوارەوەی دەکرد، دیتی وا گایەکی زەلام خەریکە بێتـەدەر، دیتی گەوهەرێکی بەدەمەوەیە، شەوی کردۆتە ڕۆژ، گای بەحری گەوهەرەکەی لەنێو دارستانەکە داناو، دەستی کرد

به لەوەرین تا تێربوو پاشان گەوهەرەکەی دەخستە نێو دەمی‌و خۆی بە بەحرەکەدا دەدایەوە، سەلیمی جەوهەری سەری سوڕما، هێجگار سەرمای بوو، بەگەڵای داران برسیەتی نەدەڕەویەوە تێری نەدەخوارد، جانەوەرو دڕندە شپرزەیان کردبوو برینیان لە لەشی خستبوو، لەسەر دارانیش لەخۆی ئەمین نەبوو، بەبێ خەوی دەمایەوە [پاشا بۆی گریایەوە]. کە ڕۆژ بۆوە بڕیاری دا نەڕوات و ئەو نەهێنیەش بزانێت. بۆ شەوی ئایندەش لەسەر هەمان دار جێگای خۆی خۆش کردەوە بینی وەك شەوی پێشوو گای بەحری هاتەوە دەرو گەوهەرەکەی بەدەمەوەیە، زانی کە چاوی نابینێت و، لەبەر ڕۆشنایی گەوهەرەکە دەلەوەڕێت

عەشقی گەوهەرەکە بوو، بیری کردەوە لە فێڵ و پلانێك، کە گەوهەرەکەی دەست بکەوێ. بۆ ڕۆژی داهاتوو، دەستی کرد بە شوڵ بڕین و قەرتاڵەیەکی چنی‌و پڕی کرد لە لم و بردیە سەر دارەکە.. هەر لە ئێوارەوە ئێشکەی لێگرت گای بەحری هاتەوە دەرو گەوهەرەکە لەبن ئەو دارەی دانا کە سەلیمی جەوهەری لەسەری بوو.. لەوەرا گایەکە کەمێ دوور کەوتبۆوە، ئەویش جوامێرانە قەرتاڵە لمەکەی هەڵرشتە سەر گەوهەرەکەو دایپۆشی، دونیا تاریك داهات، گایەکە تومەس چاوەکانی بەشەو ئەیان دەدیت، لەتاو تاریکی خۆی بەدارو بەردا دادەدا ڕێگای لێ تێك چوو بهێنێتەوە نێو دەریایەکە؛ خۆی بەهەر دارێك دادەدا لەرکەوە دای دەهێنا سەلیمی جەوهەری بەو ئەنگوستە چاوە تینی گەیشتبۆیە، گایەکە خۆی بەو دارەشی دادا کە ئەو لەسەری بوو، تاوای لێهات شل و کوت بوو بەزەویدا کەوت، مرد:. تا ڕۆژ بۆوە نەوێرا توخنی گایەکە بکەوێت کاتێك دیتی‌و ڕۆژ بۆوە، گایەکە مردبوو.. ئەوجا لمەکەی لەسەر لابردو گەوهەرەکەی دەرهێنا، بەڕۆژ دەردەوشایەوە؛ لەخۆشی ئەم گەوهەرە بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ هەمان شار کەلێ‌ی بووە، دەترسا کە لەڕێگا توشی شتێك ببێت، گەوهەرکەی خستە نێو ئەو کونە برینەی کە لەرانی ڕاستەی دابوو، [پاشا دەستی کرد بە پێکەنین]

★ ★ ★

کۆڕی دیوەخانی پاشا جمەی دەهات لەوەزیرو حەکیم و پیاو ماقوڵانی شار سەلیمی جەوهەری بە حەوت شەوان پاشای چاك کردەوە وەك جاران، هەڵس و کەوتی دەکرد... سەری حەوتەم شەوە پاشا ڕووی لە سەلیمی جەوهەری کردو گوتی: سەلیم ئافەرین بۆخۆت سەرگوزشتەکانت، بەڕاستی دەرسم لێوەرگرتن و، سوودم لێیان دیت؛ بەڵام چۆن باوەڕ بکەم ئەم بەسەرهات و ناخۆشیانەت وا بەسەردا هاتوون، کێ دەڵێ ڕاستن!.. سەلیمی جەوهەری بە پێکەنینەوە ڕووی تێکردو گوتی: پاشام قسەکەت ڕاستە، ئەم بەسەرهاتانەی کە بەسەرم هاتوون بۆ هەر کەسێکیان بگێڕمەوە باوەڕ ناکات. بەڵام بۆ درۆو ڕاستی قسەکانم، ئەو گەوهەرە شەوچراغەم هەرماوەو، لەنێو ڕانم دا حەشارم داوە.. وای کردو دەری هێناولەبەردەمی پاشای دانا' برینەکەیان بۆ دوریەوەو دەرمان کرد.. پاشا هێجگار دڵی پێخۆش بوو، یەك پێ لەبەری هەستاو ناو چەوانی ماچ کرد' ئەوجا وەزیرو کاربەدەستەکانی ویش ماچیان کرد، بڕیاریان دا که بیکەن بە وەزیری پاشا!.

**«سەرچاوەکان»**

---

ئەم چیرۆکە لە باوکم وەرگیراوە؛ بەناوی فەقێ ڕسول محمودە ڕەش. دانیشتوی شاری قەڵادزێو، تەمەنی ٦٣ ساڵ بووە. تاکە میرزای شاری پشدەر بووە، شەوانە هەمیشە کۆڕی دیوەخانی جمەی هاتووە؛ ئەو کتێبانەی کە بۆ خەڵکی شاری دەخوێندنەوە، بریتی بوون، لە ئەسکەندەرنامەو، شانامەو، گوڵستان و، بوستان و، سەعدی شیرازی‌و، ئەمیر ئەرسەلان و، شێرۆو، دەیان کتێبی دیکە... باوکم لە ساڵی ١٩٧٨ گیانی پاکی سپاردووە! کە ئەم چیرۆکەی بۆ دەگێڕاینەوە دەیگوت: سەلیمی جەوهەری پاڵەوانێکی کوردبووەو، لەو کوردستانە ژیانی بردۆتە سەر، هەندێ کەس دەڵێن گوایە فارس بووە، بەڵام ڕاستی‌یەکەی بە کورد ناسراوە..

**تێبینی،**

لە داڕشتن و گێڕانەوەی چیرۆکەکە، دەست کاری دەستەواژەکانی ناوەوەی کراوە، چونکە لەمێژ ساڵە گێڕاوەتەوەو، بۆ خۆشی نەمابوو، تا بە دەماوەدەم بنووسرێتەوە:. بەدەیان چیرۆکی دی بۆ بەجێ هێشتووم:



# سیرو

غیاث الدین عەلی نەقشبەندی

سێ برا هەبون یێ بچویك ترێ ناڤێ وی سیرو بو . هەرسێکا رێنجبەری دکر لگوندەکی .. لوی گوندی مروڤەك هەبو یێ خودان جوت و کێل .. بەر و بێدەر و وی مرووڤی دایکەکا پیر هەبو و دیهلکەك هەر روژ دا چیتە مەیدانکا پالا دا پالەکی دگەل خو بەت و نە ئێڤاری ونە روژا پاشتر و نە چ روژا نەدهاتەڤە . دا چیت لوێ چونێ وبەرزەبیت . روژەکی سیرو و هەردو براێن خو چونە مەیدانکی دیت ئەو مروڤ یێ دهێت یێ بخو لپالەکی دگەرێت . هاتە بنك سیروی و براێن وی ڤە و گوتێ :- من پالەك دڤێت ..

برایێ مەزن گوتێ :- ئەز دێ دگەلێ تە هێم .

وی مروڤ گوتێ :- من موهانەك یاهەی هەکە تو بشیێی بومن بکەی ئەز دێ تە بەم و نە چەند دڤێت ئەز دێ بوتە ئامادە کەم .

برایێ سیروی گوتێ :- تە چ دڤێت ئەز دێ بوتە کەم .. دێ چەند دراڤا دەیە من ؟ ؟ .

وی مروڤ گوتێ :- دێ زێرەکێ زەر دەمەتە روژانە

(وی دەمی زێرەك گەلەك بو بوروژانا پالەی)

و دگەل چو برێڤە گوتێ : موهانا تە چیە ؟

مێرکی گوتێ :- ژنەڤروکە هەتا (توك) دخوینیت چینابیت تو ژکار و کەسپێن من برەڤی و قەد چێنابیت تو سل بی وکی ژمە هەردوکا عاجز بو ئان سل بو دێ یێ دی زولەکا گوشتی ژپشت پاتکا وی ڤەکەت هەتا دگەهیتە پشت کماخا .

دەڤێ برایێ سیروی ژکەیفادا بەش بو چونکی وی مروڤ گوتێ دێ زێرەکی دەمەتە و ئاگەهژ موهانا نەما .

هەردوك پێکڤە چونە مالا مێرکی لوێرێ برایێ سیروی گوتێ :- ئەز بوتە چ بکەم .؟

مێرکی گوتێ :- هەردو (گـا) یێ دگوڤێ ڤە ببە سەر ئاڤێ دا ئاڤ دەیێ و بینەڤە و وەرە (مساسا[1] خو هەلگرە . توڤ یێ دکارکێ دا چاڤیکا وێ ڤەکە چار خمسا بکە تێرتوڤکێ و لەپشتا گایێ بەلەك بکە وهەرە جوتێ خو . برایێ سیروی گوتێ :- بلا مائەز دێ کیرێ کێلم ؟

مێرکی گوتێ :- دێ دیهلك دگەل تە هێت ... چی جهێ لێ رونیشت دێ وێرێ کێلی .

وی ژی ئەو کر یامێرکی گوتیێ و گایێن خو ژگوندیدەرێخستن دێهلك دا بەری خو هەتا گەهشتینە بەیارەکی لنیڤا وێ زەڤیێ کە ڤرەك مەزن یێ حولی لێ بو .. دێهلك چو سەر کە ڤری رونشت . هندی برایێ سیروی هاتێ نەشیا دێهلکێ ژجە ب لڤلڤینیت دا بەر بەرا .. دێهلك دا هێتە خارێ ژکەڤری دا جارەکادی زڤریتەڤە سەر کەڤری چچار نەمان ما هەتا لێ بویە ئێڤار دێهلك ژکەڤری نەهاتە خارێ نە چار بو گایێن خو دانە بەری خو و زڤری ڤە گوندی .

لمال مێرکی گوتێ :- تە توڤ هاڤێت ؟

برایێ سیروی گوتێ :- نەء

مێرکی گوتێ :- بوچی ؟ مامن چ گوتبو تە ؟

برایێ سیروی گوتێ :- دێهلکا پیس ئەڤروکە گێرە یاب من کری .. دێهلك چو لسەر تەحتەکی رونیشت و نەرابو من هندی کر و نەکر ئەز نەشیام ژسەر کەڤری بینمە خارێ ما ژخو ئەز کەڤری ناکولم ؟

مێرکی گوتێ :- ماتو یێ (سل)ی ؟

برایێ سیروی گوتێ :- ئەرێ ؟ ئەز گەلەك یێ سلم .

مێرکی گوتیێ :- موهانه بسەر تەهات .. وهەر زوی مێرکی دەستدا چەقویێ و زولەکا گوشتی ژێشتیێ ڤەکر برایێ سیروی کەفت و مر .
روژا پاشتر سیرو و برایێ خو یێ دی چونه مەیدانکیێ دیت ئەو مروف هاتەڤه ... سیروی گوتیێ :- تە پالەك دڤێت ؟
مێرکی گوتیێ :- ئەریێ من پالەك دڤێت .
برایێ دی گوتیێ :- بلا ئەز دیێ دگەل تە هێم بەلیێ کا ب بێژه من کا برایێ مە ؟

مێرکی گوتیێ :- ل‌نك مە نەما نزانم نجو کیڤه چو .
برایێ دی یێ سیروی دگەل وی مروڤی چو . مێرکی ژی ئەو بسەری ئینا یا بسەریێ برایێ وی ئینای .
روژا پاشتر ئەو مێرك هاتەڤه و پالەکیێ دی دڤیا ئینا سیرو دگەل چو و ئەو موهانه بو گوت .. روژا پاشتر سیروی گا برنه سەر ئاڤیێ و دێهلك دا بەری خو دێهلکیێ وەکی روژێت بەریکر سیروی ژی نەکره نەمەردی دێهلك دا بەر گومتل و بەرا هەتا دێلك کوشتی . سیروی چان ورەخێن کەڤری کێلان و توڤیێ خو هاڤێت و ئێڤاری گایێن خو دانەف بەری خو وقەستا مال کر .
ل‌مال مێرکی گوتیێ :-سیرۆ تە توف هاڤێت ؟

سیروی گوتیێ : بەلیێ و من دێهلکا تە ژی ب‌بەرا کوشت .
مێرك شر بو . سیروی گوتیێ :- ماتو سل بوی ؟
مێرك ڤەگەریا سەر هشێن خو و گوتە سیروی :- نەء .
مێرکی گوتیێ :- تویێ سلی ؟ ؟

سیروی گوتیێ :- نەء ما ئەز دیێ بوچی سل بم من دێهلکاتە یاکوشتی . مێرکی ددلی خو دا گوت :- دیارە ئەڤە دیێ شێتە من و گوتە سیروی دیێ رابە هەردو گا ئاف دە بە لیێ دەریێ گوڤیێ نەڤەکەی .
سیروی گوتیێ :- هەکە دەریێ گوڤیێ نەڤەکەم دیێ چەوا گا ئاف دەم ؟
مێرکی گوتیێ :- دپەنجەرێرا .

سیرو چو بەر پەنجەرا گوڤیێ هندەك سەر بێژکره ئامانەکی گای سەریێ خو ئینادەر دا سەر بێژیێ بخوت سیروی دەستدا چەقوکیێ و سەریێ گای ژێڤەکر و گایێ دی ژی وەلی کر . سەرکێت هەردو گا برنه سەر ئاڤیێ و دەڤیێ وان کره دئاڤیێ دا و زڤراندەڤە دپەنجەرێدا هاڤێتە دگوڤیێ دا و هاتە ڤە مالا مێرکی . مێرکی گوتیێ :- تە گا ئاف دان ؟

سیروی گوتیێ :- بەلیێ .

مێرکی قەستا گوڤیێ کر دا بەریێ خو بدەتیێ کا سیروی چەوا گا ئاف داینه .. دیت کو هەردو گایێ دسەرژیێ کرین مێرکی گوتیێ :- ئەڤە تەچ کریە هەی مال میرات ؟ .

سیروی گوتیێ :- بسەریێ بابیێ تە من دەڤیێ هەردوکا یێ کریە دئاڤیێ دا و من یێ دپەنجەرێرا ئینانیە ڤە ..
ماتویێ (سل)ی ؟

مێرکی هەر زوی گوتیێ :- نەء - نەء تە چاك کر . مێرکی هزرێن خو کرن و گوت ئەمە دیێ بکێر روحا من هێت دڤێت ئەز رێکەکیێ بو ڤی کەربابی ببینم و گوتە سیروی :-
دێ رابە سیرۆ گوشتیێ هەردو گا پرت پرت کە و هندەکیێ بکە تەلیسی و بوکچا من ببە . ویێ ژی نیڤا تەلیس تژی گوشت کر و ب پشتا خو ڤەدا و چو مالا کچا وی ب رێڤە ئەو گوشت ڤالا کره بن‌دا رەکیێ و هندەك گل‌گله کرەسە پرتەکا چەرمی و بو بر .. دەما کچا مێرکی ئەو پرتا چەرمی دیتی هەر زوی گوتە سیروی :- هەرە لەسەر پیێ خو بزڤرەڤە ما بابیێ من ئەز ژرەنگیێ ڤیێ پرتا چەرمی دیتیمە ؟ چیە ما مە گوشت نەدیتیە ؟
هەرە تو ژکیریێ هاتی هەرەف و یریێ . سیرو چو گوشتیێ گا ژبن داریێ راکر و کرەف تەلیسی و چو گوتە مێرکی :- کچا تە دبێژیت : ئەز ژرەنگیێ ڤیێ پیچا گوشتیێ دیتیمە ؟ ئەڤە کێمە .
مێرکی گوتیێ : هەرە هندەکا دی بکە سەر و بو ببە .

**سیروی گوتیێ :- وهەکە ڤیێ جاریێ ژی وەگوتە من . . . چ لیێ ب کەم ؟ مێرگی گوتیێ :- هەستیەکیێ لویلاقی ل شلکا سەریێ ویێ ب دە. سیروی هندەك گوشتیێ دی کره سەر وی ئەویێ دتەلیسی وبرە کرەڤ بن داریێ وچو، هەر زوی کچکیێ دیت گوتیێ :- ئەڤە تو هاتیەڤە !!؟ دیێ هەرە ل سەر پیێ خو ب زڤرە . سیروی ژی دەست دا لویلاقەکی و ل شلکا سەریێ ویێ دا پیێ لیێ جوت کرن و کوشت . سیرو هاتە ڤە گوتە مێرکی :- کچا تە ئەز دەرێخستم . مێرکی گوتیێ :- ئیێ تە چ کر ؟ سیروی گوتیێ :- من هەستیەك ل سەری دا و من گوشت سیروی کوتیێ :- بوچی ؟ما تو یێ (سل)ی من کچا تە کوشتی ؟.**

مێرکی گوتێ :- نەء
هەیامەك پێ چو ڕوژەکێ ژنا مێرکی گوتە سیروی :- وەرە دگەل کورێ من هەرە دەست ئاڤێ .
سیرو دگەل کورێ وێ چو و شویژنەك ژپاخلا خو ئینا دەر سەرێ وێ گەهـاندە ڕەهنێ کورکی . . . کورکی ژبنێ پیا کرە هەوار سیروی ژی کورك ئیناڤە و گوتە ژنکێ بێ دکەتە گری و نامیزیت . ژنکێ گوتەڤ سیروی وەرە دگەل هەرەڤە .

سیروی گوتێ :- هەکە ڤێ جارێ ژی وەکر ؟
ژنکێ گوتێ :- دبـانی دا ب هاڤێژە . سیروی کوڕ د بانی دا هاڤێت و کوڕ ژی لێ کوشت .
بابێ کورکی گوتێ :- مال وێران ئەڤە تە چ کر ؟!
سیروی گوتێ :- ب خودێ دەیکا وی گوتە من : دبانی دا
سیروی گوتێ :- بوچی ما تو بێ (سل)ی ؟ .
مێرکی گوتێ :- نەء بەلێ دەمێ تە بێ هاتی کو تو مە ب هێلی و ب خو بچی .

سیروی گوتێ :- ما توکێ خاندیە ؟ .
مێرکی گوتێ :- بەلێ تە گوهـ لێنەبویە . مێرکی گوتە دەیکا خو :- هەرە سەر کەلا توهیرکا هەنێ ل بەردەرێ مالێ و وەکی توکێ ب خوینـە دا سوبەهی سیروی ب کەمە دەرێ ، سیروی ژی ئاگەهـ ژێ هەیە و ددلێ خو دا دگوتێ :- تو ڕاوستە ئەز دێ چ ب سەرێ تە ئینم تەگەلەك بێ دگەل من کرین .
بو شەڤ دەیکا وی چو سەر توهیرکێ ب دەنگەکێ نزم ڤە گوت :- توك - توك . سیروی دەست دا پیخرەکی و ڤرڤراند بوچی ئەو بەر ناچیت ب بن گوهێ دەیکا مێرکی ب کەڤیت، دای، خارێ . مێرکی لێڤا خو گەزت لێ چ پێ چێنەبو . سیروی گوتێ :- تو بێ (سل)ی ؟

مێرکی گوتێ :- نەء . وتو ؟ سیروی ژی گوتێ :- نە مادێ بوچی سل بم . مێرکی ددلێ خو دا گوت :- ئەڤ کەربابە دێ درهـ و بنیاتێت من چیت و گوتە ژنا خو:- حورمەتێ ڕابە دا ئەم بخو ب ڕێنینە ڕێکەکێ دنیا مروڤێ پیس ژناڤ خودکەنە دەرێ . . لێ ئەڤێ چ ڕێ ناچنێ دڤێت ئەم بخو ژبەر ب ڕەڤین . سیرو ژی ل پشت دەرگەهی بو گوهێ خو دداێ .
مێرکی گوتـە ژنێ :- ئەم دێ ژڤی گوندی بارکەین ئەڤ شەڤە سیرو بێ دخەوە دێ سپێدێ ڕابیت کەسێ نابینیت دێ بخو ل ڕێکەکێ گەریێت .
سیرو چو دجوهالەکی دا وانژی تشت کرنە سەر مێرك و ژنا خو رابـون تشت بارکـرن و ژگـونـدی دەرکـەفتن هەر.چون هەتـا گەهشتینە گوندەکێ دی (سە) هاتنێ ب چ تەرزا نەشیان ژ خو ڤەکەن

ژنێ گوت :- خوزی سیرو د گەل مەبـا دا نوکـە ڤان سا ژمە ڤەکەن . سیروی دبنێ خراری دا گوت :- ئەز ئەڤە مە کا من بیننە دەرڤـە . . سیرو ژخـراری هاتـە دەرڤـە و ڕاهـاژوتـە سا هەتـا دەرێخستین. ب شەڤێ ل وێرێ مان مێرێ گوتە ژنا خو دێ بلا ئەڤ شەڤە ژی ل سەر بیت سپێدی دێ بخو چین. وێ شەڤێ سیروی هەر زوی خو دخەو بر گوهێ خو داێ مێر بێ دبێژیتە ژنا خو :- ئەڤ شەڤە دێ سیروی هاڤێینە ئاڤێ . . هەردوك چونە سەر جهێن خو. . سیرو ژی ڕابو چو نك ژنێ و گوتێ :- ڕابە دا سیروی ب هاڤـێژین ئاڤێ. ژن ڕابـو ئەووسیرو چون نەزانی باژوێڤە مێرێ وێ یە ل وێرێ هەردوك زڤرینەڤە مالا خو پشتی هەیامەکی ژنێ شوی ب سیروی کر . . پشتی هینگی سیروی چیروکـا هەردو براێن خو و مێری وێ بو بەحس کر دا بزانیت چەند بێ بێ بەخت بو و هەردو مانەیکڤە و پێك خوشبون .

١) دارەکـە بێ وەکی هستیفکێیە سەرێ دیژی بزمارەکا تیژە هەکە مەگا ڕاوستیان دێ پێ هاژون و ڕەخێ هستیفك بو هندێیە هەکە هەری ب گێسنی ڤەما دا پێ ژێڤەکەن .

★ ژزار دەڤێ ژنەکا ئامێدی ژێ و ێ نێزیکی (٦٠) سالانە و ل دەڤەرا ئامێدیێ دژیت سالا ١٩٨٧ێ من ژێ وەرگرتیە .

●

# مەحموود پاشای جاف

## «١٨٤٦-١٩٢١»ز

## «١٢٦١ - ١٣٣٩» ك

ئامادە کردنی
ئومێد ئاشنا

### بەشی یەکەم

مەحموود پاشای جاف یەکێکە لەو پیاوە گەورانەی کە خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە نەتەوەکەی کردوەو هەر لەپێناوی ئەو خزمەت کردنەدا گەلێك ئازارو گیروگرفت و دەربەدەریو دەست بەسەری چەشتووە. ئەم پیاوە مەزنە لەکاتێکدا بە پەرۆشەوە زۆربەی تەمەنی خۆی بەخشیوە بە ئەدەب وکەلەپووری ئەدەبی نەتەوەکەی کە بەدەگمەن کەسانێك هەبوون بیر لەوە بکەنەوە ئەو سامانە گەورە نەتەوەییە بپارێزن جگە لەوەی کە ژیانی خێلەکیو گەرمیان و کوێستان کردنی هۆزی جاف بارێکی ئارام و جێگیر بوونێکی تەواوی نەرەخساندوە کە



مەحموود پاشای جاف بە بەرگی پاشایی یەوە

ئەم دڵسۆزە بەو شێوەیە هەموو مەبەستەکانی خۆی بەدی بهێنێ جگە لەوەی کە نەزانین و دواکەوتویی

نەتەوەکەی لەلایەك و بروبیانوو شەڕ پێفرۆشتنی دەوڵەتی عوسمانیو دەولەتی ئێران بە کورد لەلایەکی

ترەوە کەمتر ئەو دەرفەتەیان داوەتێ بۆ کارکردن لە پرۆژە گەورەکەیدا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لەو سەردەمە تاریکەدا تەنیا کەسێك و دڵسۆزێك بووە کە سەدەها

لاپەرە لە شیعری کوردی بەخەتە خۆشەکەی خۆی بنووسێتەوە و ئەوچەند کەشکۆڵێکی نایابی لێ دروست

بکات بەرهەمی زیاتر لەچل شاعیری کوردی لە فەوتاندن رزگار کردووە. ئەگەر کەشکۆڵەکانی مەحموود پاشا نەبوونایە هەرگیز ئێمە بەم شێوەیەی ئێستا شیعری مەولەویو وەلی دێوانەو بێسارانی و ئەحمەد بەگی کۆماسیو حەمە ئاغای دەربەند فەقەرەو مەلا وڵەوخان و چەندین شاعیری گەورەمان دەستگیر نەدەبوو.
مەحموود پاشا هەر لەمنداڵیەوە، لەناو هۆزێکدا چاوی کردۆتەوەو پێگەیشتووە کە شیعرو کۆڕی شاعیرانی لە هەموو شت زیاتر تێدا بووە، بەتایبەتی شیعرەکانی شاعیرانی هەورامان و زەنگنە.

لەلایەکی تریشەوە گیانی نەتەوەییو گەڕان و سەفەر کردنی بۆ ئەستەموڵ و ڕوسیای ئەوکاتە، بەتایبەتی کە ئەستەموڵ کانگای شارستانی و پێشکەوتن و شیعرو مۆسیقاو هونەر بووە کارێکی زۆر گەورەیان بووە لە پەروەردە کردنی زەوقی ئەدەبیو هەستی نەتەوەیی ئەم پیاوە نەمرەدا. ئەوە بوو کە لە تورکیا گەڕایەوەو لە پێناوی خزمەتکردنی نەتەوەکەیدا وازی لە پلەی ـ متصرف شاری ـ ئورفە ـ هێنا، لە شارەزووردا کەوتە بڵاو کردنەوەی بیرو باوەڕی نیشتمانیو هەموو سەرۆکە کوردەکانی هۆزوو تیرەکانی لەسەرانسەری کوردستاندا کۆکردەوە هەتا بتوانن یەکێتی و هێزێکی گەورە دروست بکەن کە بەرانبەر دەسەڵاتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بوەستنەوەو جۆرە سەربەخۆییەك بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، ئەوە بوو کۆنگرەی کەنار زەڵم یاخود (دواوان)ی پێکهێنا، ئەو بوو کۆنگرەیەی کە دوایی باسی دەکەین و تەواوی کێشەکە لە یاداشتەکانی پیرەمێردا باسکراوە.
مەحموود پاشا زۆر باش لەوە گەیشتبوو کە هەر نەتەوەیەك خوێندەواریو ڕۆشنبیری تێدا بڵاونەبێتەوە ئەوا ئەو نەتەوەیە هەرگیز پێشناکەوێو بە ئاواتەکانی خۆی ناگات.

لە پێناوی ئەم ڕاستیەدا مەحموود پاشا کەوتە کۆکردنەوەو سەر لەنوێ نووسینەوەی شیعری هەرچی شاعیرانی کورد هەیە ئەوانەی کە دەستی کەوتوە، تەنانەت کە شکۆڵەکانی لەگەڵ خۆیدا بردوە بۆ تورکیاو کاتێکیش بەناچاری چۆتە چیای زمناکۆ لەوێش هەر لەگەڵ خۆیدا بردوونیو هە چ شاعیرو خوێندەوارو نەخوێندەوارێکی تووش هاتبێ پرسیارو هەواڵی شاعیرانی لێ پرسیوەو لە دەمی ئەو کەسەوە پاشا شیعرەکەی ڕاگوێزتۆتە ناو کەشکۆڵەکەیەوە، هەروەها ناوی شاعیرەکەو جێگاو کاتی نووسینەوەکەشی دیاری کردووە.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لەم بابەتەکە نووسیویە:
١ـ «نووسرایەوە لەبەر دەسنووسەکەی شێخ موحسینی کوڕەزای شێخ قادری سنەیی»[1]
٢ـ «ئەم تەختەیەم لەبەر نوسخەکەی شێخ موحەمەدی شێخ کەریمی سەرکۆیی قەرەداغ نووسیەوە لە ئەستەموڵ لە ١٠ی موحەرەمی ـ ١٣١١ـدا.»[2].
٣ـ «میرزا موحەمەدی میرزا یاقوو ئەم شیعرانەی بە گۆرانی بۆ وتم ومنیش نووسیمەوە لەـ١٥ـی ڕەمەزانی ـ١٣٠٩ـدا لە زمناکۆ لە کاتی قاچاخیمدا کەلەئەستەموڵ هەڵاتبووم ـ»[3]

٤ـ «لە ١٢٧٩ـدا لەکانی چەقەل ـ
جەنابی سەیید فەتاحی جەباری لەبەر ئەم شیعرانە بۆ خوێندمەوەو منیش نووسیمەوە»[4].
٥ـ لەبەهاری ـ١٢٨٢ـدا بۆ جۆماڵ و پاك کردنەوەی دەلێن جۆگاکانی تری شارەزوور لەبەرکراوا بووم کاك ئەحمەدیش هاتبوو ئەم پێنج شیعرەی سەرەوەی وت»[5].
کاك ئەحمەد مەبەست لە شاعیر ئەحمەدی خوسرەو چاوەش ـ یاخود ئەحمەد پریسییە کە نازناوی ـ مەجذوب ـ بووە سەبارەت بەژیان و ساڵی لە دایك بوون و کۆچی دوایی مەحموود پاشا گەلێك بیرو ڕا هەیەو چەند مێژوو

نووس و ئەدیب و شاعیر لەم بارەیەوە زانیاریان داوە بەدەستەوە ئەگەرچی زانیاریەکان کەم یاخود ناتەواویش بن بەلام جێگای خۆیان هەیەو سوود دەگەیەنن.

مێژوو نووسی مەزن ـ محمد ئەمین زەکی بەگ ـ لە کتێبی ـ تەئریخی سلێمانیوە ولاتی ـدا نووسیویە «مەحموود پاشای جاف کوڕی ـ محمد پاشا ـیە. لە ساڵی ـ ١٢٦١ هیجری هاتۆتە دنیا لە پاش کوژرانی باوکی کرا بە رەئیس جاف وقائمقامی هەڵەبجەو روتبەی ـ میری میران ـ ی درایە. لە ساڵی ـ ١٣٠٦ ـ عوسمان پاشای برای کرد بە رەئیسی جاف و قائمقامی هەڵەبجەو مەحموود پاشا کرا بە متصرفی ـ ئورفە ـ. بەلام قبوولی نەکرد. چوو بۆ ئەستەمولّ سێ ساڵی تیا مایەوە لەنهایەت بەدزیەوە بەسەر روسیەدا فیراری کردو هاتەوە شارەزوور، دوای بەینێك بەرووتبەی ـ بەگلەربەگی کرا بە رەئیسی عەشیرەتی جاف و دەوامی کرد تا هەڵگیرساندنی حەربی گەورە.

مەحموود پاشا زۆر موحیبی شیعرو شوعەرا بووە، دیندار بووە، زۆر مزگەوتی کردوە. [روتبەی ـ خان ـ ی درابویە]، لە ساڵی ١٣٣٨ی هیجریدا لە هەڵەبجە وەفاتی کرد. لە ـ قزلرباط ـ دفن کرا لەو مزگەوتەی کە خۆی دروستی کردوە. ئەم زاتە حەزی لە یەکێتی قەومەکەی ئەکرد»[٦]. ئەم بیروراو زانیاریانەی ئەمین زەکی بەگی مێژوو نووس هەتا بڵێ جوان و سوود بەخشە بەتایبەتی کە بە رستەیەکی پر مانا لایەنێکی گەورەو پر بایەخی مەحموود پاشا باسکردوە کە نووسیویە ـ ئەم زاتە حەزی لە یەکێتی قەومەکەی کردووە ـ. لە چەند خاڵێکدا وەك ساڵی لە دایك بوون و مردن و مانەوەی لە تورکیادا جیاوازی دەبینرێ لەنێوان بیرورای ئەم و چەند نووسەرێکی تردا.

لەبارەی ژیانی مەحموود پاشاوە سەرچاوەیەکی گرنگ و پر بایەخمان لەبەر دەستدایە ، ئەویش بەشێکە لە یاداشتەکانی خوالێخۆشبوو کەریم بگی فەتاح بەگ، کەتیایدا نووسراوە لە ساڵی ـ ١٢٩٠ ـی کۆچیدا والی بەغدا مەحموود بەگی کوری محەمەد پاشای بانگ کردە بەغداو داوای جێگیر بوونی جاف لێکرد مەحموود بەگ وەلامێکی تەواوی نەدا بەدەستیانەوەو گەرایەوەو لەسەر ئەمە محەمەد پاشا لە حکومەتی عوسمانی کەوتە شکەبەو بەخۆیو جافەوە روویکردە ئێران بەلام مەحموود بەگی کوری لەگەڵی نەچوو گەرایەوە بەغدا محەمەد پاشا کرا بە سەرۆکی گشتی عەشایری جوانرۆو بەرەبەرە باقی عەشیرەتی جاف خاکی عوسمانی واز لێهێناو چووە لای محەمەد پاشا، مەحموود بەگی کوری لەبەغدا جێگیر ئەبێ وردە وردە ئەرازیەکی زۆر لە قەزای خانەقین و کفریدا ئەکرێ والی بەغدا تەحسین پاشا بۆ هاتنەوەی محەمەد پاشا بۆ ولاتی سلێمانی هەوڵ ئەداو سێ جار مەحموود بەگ ئەنێرێت بە شوێنیا سەر ئەنجام فەرمانی قائمقامیەتی هەڵەبجەو سەرۆکایەتی جاف و هەندێ زەوی بۆ ئەنێرێ، محەمەد پاشا ئەگەرێتەوە ولاتی سلێمانی تا ساڵی ـ ١٢٩٩ ـ ی کۆچی بەم جۆرە مایەوە لەم بەروارەدا لە کاتێکا کە محەمەد پاشا بێ ئاگاداری لە چیمەن ئیبراهیم سەمین دا ئەبێ تیرەیەکی شاتری بە ناوی کەرەم وەیسی ـ کە هەندێ لە پیاوەکانی لە حەپسی محەمەد پاشادا مرد بوون ئەچنە سەریو ئەیکوژن، مەحموود پاشا بۆ سەندنی خوێنی باوکی لەشکر ئەکاو بەشوێنی عەشایەری هەمەوەند کە پەنای کەرەم وەیسیەکانیان دا بوو تا ئێران ئەچێو هەندێ لە هەمەوەندو هەموو قاتڵەکانی باوکی لەناو ئەبات، مەحموود پاشا لە دوای باوکی ئەبێتە سەرۆکی جاف و قائمقامی هەڵەبجەو لە دوای دوو ساڵ، یانی لە ـ ١٣٠٢ ـدا روتبەی میری میران ی بۆ دێ لە ـ ١٣٠٧ ـ دا کە نامق بەگی میر ئالای بۆتەشکیلاتی ـ سەنیە ـ و چەند راپۆرتێك کە دژی مەحموود پاشا درابوە سولتان عبدالحمید دێتە شارەزوور، لەو راپۆرتانەدا مەحموود پاشا ئیتیهام کرابوو کە سەرۆك عەشائرەکانی کورد هان

ئەدات کە لە دەوڵەتی عوسمانی یاخی ببن، وەگوێ نەدەن بەکاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی مەحموود پاشا ڕوو ناداتە نامق بەگ بە پێچەوانەی ئەو عوسمان بەگی برای زۆری خزمەت ئەکا. لەسەر تەلغرافی نامق بەگ قائمقامی هەڵەبجە لەگەڵ ڕوتبەی ـ میری میران ـ ئەدرێ بە عوسمان بەگ و مەحموود پاشاش ئەکرێ بە متصرفی ـ ئورفە ـ. مەحموود پاشا ساڵی دوایی لە بەهاردا لەگەڵ محەمەد عەلی بەگی برای ئەچێتە ئەستەمووڵ. لە ئەستەمووڵ دەست بەسەر ئەکرێت، دوو ساڵێك لەوێ ئەمێنێتەوە لە دواییدا هەلێکی بۆ ڕێك کەوت بەسەر ڕوسیادا دەرچوو هاتە ڕەشت و لەوێش هاتەوە ناو جاف بەڵام زۆری پێنەچوو دوو هەزار سواری دەوڵەتی عوسمانی هاتنە سەر هەڵەبجە بەڵام مەحموود پاشایان دەس نەکەوت و مەحموود پاشا بەهێزێکی جافەوە لە حکومەتی عوسمانی یاخی ئەبێت. دوای مەحموود پاشا توسطی بە نەسرەت پاشا کرد بۆ لێبووردنی‌و چووە بەغدا بەڵام بۆ چوونی بۆ ئەستەمووڵ زۆر اصرار کرا بەکورتی مەحموود پاشا خۆی لە بەغدا دەرباز کردو هاتە ناوچەی ـ قەرەتەپە ـ لەوێ لەشکری جافی بۆ ئامادە کرا بوو لەگەڵیا چوو بۆ ـ کانی چەقەڵ ـ لە دواییدا جارێکی تر سەربازی کرایە سەرو تەکیان پێ‌هەڵچنی‌و دایەشاخی‌زەناکۆ[٧].

ئەمە ئەو بەشەی یاداشتەکانی کەریم بەگەی فەتاح بەگ بوو کە هەمیشە بۆ ئەوە دەست دەدات ببێتە سەرچاوەیەکی ڕوون بۆ مێژووی گەلی کوردو مێژوی هۆزی جاف بەتایبەتی و بەشێك لە ژیانی پڕ لە هەوڵ و تێکۆشانی مەحموود پاشا بۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەی. ئەوەی لەم یاداشتانەدا هەستی پێدە کرێت ئەوەیە کە گیانی نەتەوەیی و عاشق بوونی سەربەستی لای مەحموود پاشا لە پێش هەموو شتێکەوە بووە، ڕازی نەبوون و قەناعەت نەبوونی مەحموود پاشا بە هەریەك لە دەسەڵاتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی یەکێك بووە لەو بنەماو هۆ ئاشکرایانەی کە هەستی نەتەوەیی لای مەحموود پاشا دەردەخات. لێرەدا بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیانی هۆزی جاف، کە ژیانی مەحموود پاشا لە منالیەوە تێکەڵ بەو ژیانە بووەو پەیوەندی ڕاستەو خۆی بەباسەکەمانەوە هەیە لە چەند سەرچاوەیەکی ڕوونەوە پێشکەش ئەکەین، عەلی بەگی حسێن بەگی جاف، لەوەڵامی پرسیارێکماندا لەم بارەیەوە دەنووسێت:ـ

«جاف هۆزێکی گەورەو فراوانن و دوای ئەوەی لەسەردەمی سوڵتان موورادی عوسمانیا لە ناوچەی جوانڕۆوە هاتوونەتە کوردستانی ئەو سەردەمە کە بە شکراو بوو لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا لەسەر هەندێ هۆی تایبەتی ئەو سەردەمە لە ناوچەی ـ دزیایش ـ دەربەندیخانی ئێستا ـ دا نیشتەجێ بوون دوایی پەرەیان سەند، وردە وردە دەستیان گرتوە بەسەر شارەزووروو گەرمیاندا، گەرمیان و کوێستانیان کردوە. دوای پەرەسەندن و گەشە کردنی و زۆر بوونیان و هاتنی دەستە دەستەی تیرەکانی جاف لە ئێرانەوە بۆ ئەم ناوچەیەو دەوری ـ زاهیربەگ ـ ی سەرۆکی جاف ی ئەو سەردەمەو دامەزرێنەری جافی موورادی و باپیرە گەورەی بەگزادەی جافی موورادی ، کە جاف بەم پێیە دووبەشن جافی جوانڕۆ لە ئێران و جافی موورادی لە عیراق ، جافی ئێمە لە دوای ئەمەی لەسەردەمی مەدحەت پاشای والی عوسمانی بەغدادا کە زەوی و زاریان ئەفرۆشت بە نیازی نیشتە جێ‌ی هۆزە گەرمیان و کوێستان کارەکانی ئەو سەردەمە حەمە پاشاو مەحموود پاشای کوڕی کەوتنە کڕینی هەرچی زەوی و زاری قەڵەمڕەوی جاف هەیەو ئێستایش لە سەنەدەکانی زەمانی عوسمانیا بەناو سنووروو نرخی کڕینیانەوە هەمووی تیایەو زۆری لەلایەن ئەوەی خاوەنەکانیاوە پارێزراوە. ئیتر جاف لە سنووری ـ جبل حمرین ـ وە تاکو (شلێرو ناو خوان) هەمووی بوو بە موڵکی تاپۆی بەگزادەی جاف بێجگە لە هەندێ جێگای تایبەتی کەم نەبێت یان بەدەست میریەوە مایەوە یان کەسانی تر خاوەن تەکیەو پیاو ماقوڵانی ئەو سەردەمە کڕیان یاخود میری پێ‌ی بەخشیون. ئیتر

جاف لەـ قزرەباتــەوەـ کەوا دامێنی کوردستانە تاکو شلێرو ناوخــوان بەشی کوردستــانی عێراق و لەو دیـو سنووریشەوە هەتا ناوچەی مەریوان و گۆلی زرێبارو لای خواروی قزرەبات و شیروانەو کەلار، پێیازو شارەزوورو پێنجوین و ئەودیو سنووریش ئەوانەی سەرەوە بەزستان و بەهــار هاوین و پایـز هاتـوچـۆیـان تیا کردووە. بۆ چەسپـانـدنی ئەوەش جاف چۆتە ناو ئێرانیشەوە هەتا موڵك و زەوی‌و زاریشیان لەوێ کڕیوەو هەیانە. بەتایبەتی ئاغـاکـانی گەلاڵێ ئەوەی کلودیـوس ریـچ لەگـەشت نامـەکـەیدا ئەڵێت: کە چوومە ماڵێ کە یخوسرەو بەگی سەرۆکـی هۆزی جاف هاوینی ـ١٨٢٠ـ لە کاتێکـدا ئەچووم بۆسنە بۆ دیدەنی ئەمانوڵلاخانی والی ئەردەلان لە سنە ماڵی کەیخوسرەو بەگ لە نزیکی گۆمی زرێبارەوە بوو، ئەو میـوانداریەم هەتا مردن لە بیر ناچێتەوە بەم بۆنەیەوە جاف بەشێکیان پەڕیونەتەوە ناوچەی دوکان لە پارێـزگـای سلێمـانی کە ئەوانیش سمایل عوزمێڕی ، جافـەرەشکـەن. ئەوان لەو ناوچـەیـەوە لەکـاتی خۆیا گەرمیان و کوێستانیا کردوەو ئێستاش خۆیان. بە جاف ئەزانن. گەرمیــان و کوێستــان کردنی جاف ئەوەنـدە جێگیرو چەسپاوە لە ناخیانا چونکە زۆربەی کەوتت جاف واتا ئاژەڵ دارو مەڕومالات بەخێوکەر، هەتا ئەم سالانەی دواییش گەرمیــان و کوێستانیان ئەکرد. هەر نەشبوایە تاکـو ناوچەی پێنجوین ئەچوون بۆ لەوەڕ خۆری. هەر چەنـد ماڵ لەگـەرمیـان جێگیر بوو بوو بەڵام هاوینان ئاژەڵەکانیان شوان کەژاو کەژ ئەیانبردن و خۆشیان بەبنە ـ واتــە ماڵی سووك و کەم ـ بەلۆری یان عەرەبـانـەی تراکتۆر لەگەرمیانەوە

ئەمساتتە شارەزوور یان چاوەڕوانی ئاژەڵەکەیان ئەکرد یان لەوێ لایان ئەبوون بەو نیازەی بەڵکو ئەگەر میری عێراق و ئێرانیش وەکو جاران ڕێگەیان ئەدەن بۆ لەوەڕ خۆری بچنە ئێران بەڵکو بچنە ناوچەی پێنجوین جا بەو بۆنــەیــەوە ئەم شیعـرەی مەولەوی کەوا ئەزانم یا لە شبنـەکـەیـ ئەمنـە خانی ژنی بارام بەگدایە یان لە شینەکەی قادر بەگی کەیخوسرەو بەگدایە کە ئەڵێت:ـ

زیرەی تەڵیت بار کۆچ ئەوەماڵان

تەنسیرەش نیەن ئەم ساڵ چون ساڵان

داخ و حەسرەت بۆ کزبوون و ئاڵۆزاوی رێ کۆچی ئەو ساڵە ئەخوازێت»[٨] هەروەها بۆ زیاتر شارەزا بوونمان لە مێــژووی جاف و دەوربینینیــان لە کێشــەکـانی ئەو سەردەمــە با تەمــاشــای چەنـد لاپــەڕەیەك بکەین لە یاداشتکــانی ـ کەریم بەگی فەتــاح بەگ، کە بەڵگــە نامــەیــەکی زینـدوە لەم بارەیــەوە «جـاف مورادی لە سەردەمی سوڵتـان مورادی چوارەمدا هاتونە خاکی ـ بەبە ـ ١١٤٥ی کۆچی ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە لەپاشدا چوەتــەوە ـ جوانــڕۆ ـ لە جێگـەیـانـدا لەشــارەزوور عەشیرەتی گەلاڵی ئەمێنێتەوە لەدواییدا ـ ظاهر بەگ ـ و ـ طاهر بەگ ـ کوڕانی یار ئەحمەد بەگ کوڕی سیف الله بەگی کوڕی سەیـد ئەحمـەد بەگی سەرۆکی جاف بە چوارسەد ماڵێکەوە دێتەـ بانی خێلان ـ کە لەقەزای ـ سەلاحـیـە ـ دایـە. ١١٥٠ـ کۆچـی لەم بەروارەدا شارەزوور بەدەس عەشایری گەلاڵی ـ مەنمی ـ کەڵهور ـ گەڵباخیـ تیلە کۆو بڵباس ـ وە ئەبێ. ظاهر بەگ بەرە بەرە بەکۆچەرانی جاف جوانرۆ هێز پەیدا ئەکاو هەزار ماڵێـك پێکـەوە ئەنێ‌و لە هەلێکـدا لەسەر داوا کردنی حاکمی بەبە ـ ٤٠ ـ جەردەی ئەو ناوە ئەکوژێ‌و حاکمی بەبە لەسەر ئەم خزمەتە ـ بانێ خێلان ـ و ـ دزیایش ـ یان ئەداتــێ و لەوێ جێگـیر ئەبــێ ئێستــەش لەوێ نەتەوەی ماوە. لە کوڕانی ظاهر بەگ سلیمان بەگ و قادر بەگ لەشــەڕێکـدا عەشـایـری شارەزوور ئەشکێنن و جێگـەکەیان لێ زەوت ئەکەن و لە دوای ئەمەـ عەشایر جاف جوانرۆـ نزیك پانزە هەزار ماڵێك دێنە شارەزوورو جێـگــیر ئەبـن. لە دوای سلێـمــان بەگ و قادر بەگ سەرۆکـایـەتـی جاف ئەکـەوێتـە دەس قادر بەگ و کەیخوسرەو بەگی کوڕانی سلێمان بەگ ئەم دوو سەرۆکە هاوچەرخی سلێمان پاشای باوکی ئەحمەد پاشای بابان بوون ـ ١٢٤٣ ـ ١٢٥٤ ـ ی کۆچی لە دوای کەیخوسرەو

بەگ سلێمان بەگی کوری بۆتە سەرۆك و لە دەوروبەری ـ ۱۲٤٥ـ دا کە لەشکری ئەردەلان و ئێران هاتنە سەر سلێمانی عبدالله بەگی برای سلێمان بەگ بە دوو هەزار سواری جافەوە دێت بۆ یارمەتی سلێمان پاشای بابان و لە ـ گردە گروێ ـ نزیکی سولەیمانی ئەشکێو عبدالله بەگی کەیخوسرەو بەگیش زامار ئەبێو هەر بەو زامەوە کۆچی دوایی ئەکات. لە دوای ئەم شەرە ماوەیەکی درێژ سەرۆکایەتی سلێمان بەگ دەوام ئەکاو قادربەگی برای بۆ جێگیر بوونی عەشیرەتی جاف خزمەتێکی زۆر ئەکا لە دوای مردنی سلێمان بەگ سەرۆکایەتی جاف ئەکەوێتە دەس محەمەد بەگی برایان کە هێشتا منالْ ئەبێ ـ ۱۱٤٨ـ کۆچی. وادیارە کە ئەحمەد پاشای بەبە لەگەلْ محەمەد بەگدا بەینی چاك نەبوەوەو ویستویەتی ـ ئەحمەدبەگی وڵەوبەگ ـ کە خالۆی بوو بکا بە سەرۆکی جاف بۆ ئەم مەبەستە ویستویەتی بەفێلێك محەمەد بەگ بگرێو دەعوەتی کردوە بۆ سلێمانی بەلام محەمەد بەگ نەچووەو چەند بەگزادەیەکی خزمی ناردوە ئەحمەد پاشا ئەم بەگزادانە ئەگرێو لەکۆیە ـ حەپسیان ئەکا. بەرامبەر ئەمە محەمەد بەگیش ئەحمەد بەگیو لەوبەگ ئەگرێو ماڵەکەی تالان ئەکاو لەگەلْ عەشایری جاف ئەچێتە ئەردەلان بەلام بەهۆی خزمایەتی ئەحمەد بەگی وڵەو بەگ و والی ئەردەلان لەوێ گونجانیشی نابێ و دێتە دەوری ـ قزرابات ـ وـ خانەقین ـ و خۆیشی ئەچێتە لای والی بەغدا حکومەتی بەغا زۆر رێزی ئەگرێو لەگەلْ عەشایری جاف دا لە دەوری ـ قزرابات ـ جێگیریان ئەکا لە دوای سێ سالْ لەگەلْ ئەحمەد پاشای بابان ئاشتیان ئەبێتەوە، دێتەوە شارەزوور تا دوای هاتنی ئەمارەتی بەبەـ۱۲٦٤ـی کۆچی بەم شێوەیە دەوامی کرد کاتێك کە سەردارـ عومەر پاشا بۆ دروست کردن و رێکخستنی بەرێوەبەرایەتی هاتە خاکی بەبە ویستی رەسمێك بخاتە سەر عەشایری جاف و هەرەشەی لە محەمەد بەگ کرد لەپاشدا لەسەر رەسمێکی چل یەکی لەمەرو بزن رێك کەوتن بەم جۆرە سەرۆکایەتی جاف و قائمقامیەتی هەڵەبجە تا ـ ۱۲۹۰ ـ ی کۆچی بەدەستیەوە مایەوە»[٩].

بۆ زیاتر شارەزابوون لە مێژووی جاف و قولْ بوونەوەو پەلهاویشتن لەم بوارەدا کورتە نووسینێکی پیرەمێرد هەیە کە گەلێ لایەنی گەش و نوێمان بۆ دەردەخات، پیرەمێرد لەرێزی ئەو نووسینانەدا کە بەزنجیرە لەژێر ناوی ـ تأریخ و اشخاص ـ دا بلاوی کردۆتەوە، نووسیویە «ئێمە رێزمان لێگرتووە ئەمانەوێ ئەم ئێلْ و تیرە کۆنانە بهێنینە ریزو زنجیرەی تەئریخەوە با هەموو لاێیکی بەرێکو پێکیش نەزانین بەلام ئەوی خۆمان ئاگادارین ئەینووسین و ئەوی لە ئێمە شارەزاترە چینێکی تری لێ هەڵچنێ، ئەمجارە لە ئێلی جاف ئەدوێین:ـ

وەکو لە هەندێ تەئریخا بۆمان دەرکەوتوە ئەم شارەزوورە بەرو دوای تەئریخ پر بووە لە ئێلات و هەر حوکمدارێك کە زۆرو دەستەلاتێکی پەیدا کردبێ بەو ئێلاتەوە بووە وەکو بابا ئەردەلان کە بەتەنها هاتوەتە شارەزوورو لەناو ئێلاتا خۆی شیرین کردوەو بەرە بەرە هەمویانی یەك خستووە حکومەتێکی لە شارەزوورو زەلْدا دامەزراندوە کە یەکە حکومەتی تەئریخی کوردانە.

ئێستایش جاف ناوی تەنها عەشرەتێك نییە ناوی شیرازەی جزوبەندی عەشایرێکی زۆرە کە ئەمانە پێش زەمانی ساسانیش تیرە تیرەو بەش بەش لە شارەزووردا بوون. گاهـ لە ژێر حوکمی شاهانی ئێراندا گاهـ لە سایەی پادشاهانی عوسمانیدا هەڵیان کردوە تاسوڵتان موڕادی رابع کە هات بۆسەفەری بەغدا ئەم ئێلاتەی کۆکردەوە. وڵدبەگی باپیرە گەورەی برایم بەگی کرد بە رەئیسیان و بەناوی ئێلی موڕادیەوە هێنانیە ئینتزامەوە کە ئەو تەئریخە نزیك بە ـ ۳۰ ـ تیرەو عەشیرەت بوون. میکائیلی، روغزادی، شاتری، ئەوروڵی، سعیدانی، گەلالی، تەرخانی، چنگی، هاروونی، پشتماڵە، رەش و بۆری، کەمالی، بداخی، یەزدانە بەخشی، ئەخەسووری، یوسف جانی، باشکی، سۆفی وەند، وینەوەند.

چونکە ئەم ئێڵە زۆر بوون لە شیروانەوە تاپشتی سنە خێڵەرێ گەرمیان و کوێستانی ئەوان بوو، تەنها رەئیسێك ئیدارەی پێ نەدەکرا، خێڵ خێڵ. و بەش بەش دایاننە دەست چەند ئەمیرێك و ئەو ئەمیرانە لە ئیدارەی منفردی بەشی خۆیاندا سەربەست و لە کلیاتدا تابعی رەئیسێکی عموومی بوون هەر وەکو Federasyon ـ فەدراسیون. لەم دواینەوە کە یخوسرەو بەگیانی تیاهەڵکەوت. باوی لە هەموویان سەند بەسیاسەت و ئیدارەی سەردار عەشرەتی و سەرئێلی ولد بەگی سست کرد ئێجگار محەمەد بەگی کوری کە لە رۆم و عەجەمدا بە پیاوێکی هوشیارو نامدار دانرابوو لەگەڵ دوو دەوڵەتا پەنجەی لێنەدا، خۆی بە عەقڵ و سیاسەت و کیاسەت، قادر بەگی برای بەشجاعەت و بەسالەت ئێلی جافیان گەیاندە هەژدە هەزار خانە. حەتتایەکێ لە ئاساری فەراسەتی محەمەد بەگ ئەمە بوو کەلە حدوودی بەغداوە تاپشتی شاری سنەی تاپۆ کرد بە پێی بەدەل وەختێ محەمەد بەگ لەگەڵ والی بەغدا لێیان بوو بە ناخۆشی ئەو هەموو ئێلەی بارکرد چوو ئێران، ناصرالدین شاـ زۆری حورمەت گرت. هەموو بەرەی زەهاو جوانرۆو قەسری شیرینی دایە تا عوسمانی مەجبوور بوو دڵنەوایی کرد، هێنانیەوە کە هیچ تەکلیفیان لەسەر نەبێ تەنها لە ئەغنام چل یەکی عەینی شەرعیو سالێ هەر ماڵێ خەرجێك بدا. محمد پاشا ـ١١ـ کوری بوو، محمود پاشا، عوسمان پاشا، حسن بەگ، سلیمان بەگ، فەتاح بەگ محمد عەلی بەگ قادر بەگ و کێ و کێ. قادر بەگیش تایفەی بارام بەگی لێ کەوتەوە کە ئەوانیش زۆربەی ئێلاتیان بەدەستەوە بوو بەڵام رەونەق و دەبدەبەو ئیداراتی جاف بەسەر ئێڵی مەحموود پاشاو ئەمیریی عبدالله پاشاوە بوو وەسمان پاشا کە لەسەر ئێلیەوە بوو بە قائمقام لە ئێل براو لە هەڵەبجە لە سایەی سەڵتەنەتی خانمدا بەختیار ژیا» [١٠].

پیرەمێرد تەنها ئەم بەشەی لە زنجیرەی مێژووی جاف و مەحموود پاشا بڵاو کردۆتەوە، لەوەدەچێ لەبەر سەرقاڵیو زۆری بابەتی رۆژنامەکەی لەیادی چووبێت ئەم زنجیرەیە تەواو بکات و تەواوی مەبەستە مێژووییەکە بدات بەدەستەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەشە. کەمە گرنگیەکی زۆری لە مێژووی هۆزی جافدا هەیە.

**تەمەن و ساڵی لەدایك بوونی مەحموود پاشاو کۆچی دوایی**

لە ئەنجامی ئەو زانیاریانەی ئێمە بەدەستمان هێناوە مەحموود پاشا ـ ٧٥ ـ یاخود ـ ٧٧ ـ ساڵ ژیاوە، مێژوو نووس ئەمین زەکی بەگ نووسیویە ـ ساڵی ـ ١٢٦١ ـ ی کۆچی واتە ـ ١٨٤١ ـ ی زاینی لەدایك بووە. علاء الدین سجادی لە مێژووەکەیدا نووسیویە ـ١٨٤٦ـ لەدایك بووە. هیچ کامیان جێگای لەدایك بوونەکەی نەنووسیوە. هەروەها ئەمین زەکی ساڵی ـ ١٣٣٨ـی کۆچی بەساڵی کۆچی دوایی داناوە واتە ساڵی ـ ١٩١٨ ـ ی زاینی وە. مامۆستا علاءالدین سجادی ساڵی ـ ١٩٢١ ـ ی بە ساڵی کۆچکردنی داناوە. بە بروای من ئەو مێژووەی کە مامۆستا سجادی دایناوە نزیکترو راستترە وە دەکرێت پشتی پێ ببەستین.

پاشا لە شاری هەڵەبجە کۆچی دوایی کردووە لە ـ قزرابات ـ لەو مزگەوتەدا کە خۆی دروستی کرد بوو بەخاك سپێرراوە.

**«مەحموود پاشای شاعیر»**

گومانی تێدانییە کە یەکێکی وەك مەحموود پاشا زەوق و حەزو ئارەزوویەکی ئەوەندە زۆرو بێ سنووری لەگەڵ شیعردا هەبوو بێ دیارە ئەگەر شاعیرێکی گەورەش نەبووبێ هەر دەبێت کۆمەڵێ شیعری بووبێ. ئەم گومانە مایەوەو چەندین بیرورا هەبوو لەسەر ئەوەی کە ئایا مەحموود پاشا شیعری هەیە؟ دەبێ چەند شیعری هەبێ؟، هەتا ئەم دواییە کە چەند کە شکۆڵێك دەستاو دەست هاتوو گەلێ کەس بەوردی کەوتە خوێندنەوەو تاوو توکردنیان وەك ـ کەشکۆڵی مەحموود پاشاـ خۆیو کەشکۆڵی ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ و رەزا بەگی فەتاح بەگ ـ کە بەخەتێکی خۆش و شێوەیەکی جوان سەدەها

شیعری مەولەوی‌و وەلی دێوانەو بێسارانی و خاناو هتد- لەو کەشکۆلانەدا نووسراوەتەوە، زۆربەی شیعرەکان شیعری شاعیرانی ناوچەی هەورامانن ، لە ریزی ئەوانەدا شیعرێکی مەحموود پاشا هەیە، کە بەو شێوە زمانە نووسیویەتی. شیعرەکە شیوەنی مەحموود پاشایە بۆ مەرگی براکانی بەڵام ئەم شیعرە بەهەڵە لە دیوانی پیرەمێردی محمد رەسول هاوار -دا، دراوەتە پاڵ پیرەمێرد و لەلاپەرە - ٣٣٨ - دا بڵاوکراوەتەوە. بەناونیشانی - یادی مەحموود پاشای جاف - کە گوایە پیرەمێرد ئەو شیعرەی لە یادی مەحموود پاشادا وتوە. وەپیرەمێرد لە شێوەی گۆران - هەورامی - یەوە وەریگێراوەتە سەر شێوەی سلێمانی‌و دەستکاری شیعرەکەی کردوە.

مەحموود پاشا شەش برای هەبووە کە بریتین لە: وەسمان پاشا، حەسەن بەگ، حەمە عەلی بەگ، سلێمان بەگ فەتاح بەگ، قادر بەگ.، ئەم قادر بەگە ئەوە نی‌یە کە مەولەوی شیعرێکی شین و لاواندنەوەی زۆر بەرزی لە کارەساتی کۆچکردنیدا وتوە. بەڵکو ئەمیان برای مەحموود پاشا بوەو قادر بەگی لای مەولەوی مامی مەحموود پاشا بووە. شیعرەکە خۆی بیست و پێنج بەیتە، پیرەمێرد لەوەرگێرانەکەدا کردوویە بە نۆزدە بەیت، وەهەندێ دەستکاری تێدا کردووە. مەحموود پاشا لە شیعرەکەیدا ناوی هەرسێ براکەی نووسیوە کە شیوەنی بۆکردوون. کە بریتین لە فەتاح بەگ، حەسەن بەگ قادر بەگ. وەمەحموود پاشا کوڕە گەورەی حەمە پاشای جاف بوەو لە دوای هەر شەش براکەی کۆچی دوایی کردوە. لێرەدا دەقی شیعرەکەی مەحموود پاشاو وەرگێرانەکەی پیرەمێرد دەنووسین:-

«وادەی خێڵەو خوار ئێلاخ بێزانەن
وادەی گەرمەسێر سەحرای شیروانەن
براکانم هیچ کەسیان نی‌یەن دیار
وەك جاران سوار بن بۆ ڕاووشکار
هانا هاسێ بەور، سێ نامدارم ڕۆ
سێ پڵەنگ هیممەت شێر کردارم ڕۆ
سێ شاهین، سێ‌باز، شیروان ماوام ڕۆ
سێ پڵەنگ نەهیب، وەقت داوام ڕۆ
سێ - سەعد وەقاص - سەر ئاوردەم ڕۆ
سێ ڕم ئەزوڵفان داخان بەردەم ڕۆ
- ئیللا - سولەیمان - ئەو بێ ئەندێشە
ئەو جەهدو غیرەت عەداوەت کێشە
ئەو شمقار شۆخ ئەریمان شیمە
ئەو مەرد مەیدان بێ‌خەوف و بیمە
ئەو شۆڕە سوارە گورجی ئەزینە
ئەو حاتەم هیممەت سەرحەد نشینە
هارەی یەدەکان نیهاش وەتاو بی
سەر زەمین بەعەشق هات هات ڕاو بی
نیستە نادیار ڕووی سەر بیساتەن
تالعیش ئەگێج ئەرد نا هاتەن
ئەنە فەتاح بەگ ئەو ڕۆستەم ڕەنگە
ئەو پیلەتەن تەن بوورزو ئەمەنگە
ئەو هەڵۆ هیممەت قەهار قینە
ئەو دەست و بازوی شۆخ ڕەنگینە
سەرتاپا تەیار وێنەی فلامەرز
جەسەهەش ماتەن زەوارەی گۆدەرز
نیستە نادیار دەشتی شیروانەن
داخ ئەو سەرمەشق کول دەورانەن
ئەنە حەسەن بەگ ئەو ئەو جوانە
ئەو شێوەی شیرین، ئەو میهرەبانە
ئەو میرەزن ئەو توولْ لاوە
ئەو باهوو بەدەن ئەو چەرخ چاوە
ئەو فەغفور ئەژاد مەنشووری جەعام
دنیای پڕ مەینەت وەنەش نە داکام
ئەنە قادر بەگ ئەو تەیار شەختە
ئەو کەس بێ کەس یانەش دەربەستە
خانمان خەریك ئەهاتی دەردەن
ئێش فەتاح بەگ عەلاوەی گشتەن

جەزوبان لاڵ بم کەچەن کارتان
مەندەن وەبێ سەر دەستەی سوارتان
فەڵەك هانە فیکر سەودای مەکروفەن
خاك وەبێ زنجیر شێر مکەرۆبەن
دەی کێ بۆ جەرەنگ سایە نیشانتان
هۆرداروٚ ماردم ئاتەش ئەفشانتان
وڵڵا ئەو فەڵەك برایێش مەرد
یاچون تۆ ئاهـ سەرد مکەرد
ئەویش سفتەی جەرگ وێش مشنەفتەوە
تا ئەبەد جەمەرگ دوور مکەفتەوە
برا چون فەڵەك کەسش نەمەردەن
مەرگ جوانان وەعادەت کەردەن»[11]
وەرگێرانەکەی پیرەمێرد :ـ
«وادەی خێڵەو خوار، ئێل جافانەن
دەمی گەرمەسێر دەشتی شیروانەن
لەبراکانم کەسیان نییەن دیار
وەك جاران سواربن بۆ راوو شکار
هانا برایان شوێن نادیارم رۆ
سێ پڵنگ هەیبەت شێرشکارو رۆ
سێ شاهێن سێ باز شیروانی ماوا
فەڵەك لە زۆریان کەوتبوە داوا
ئای سلێمان بەگ عەدالەت پیشە
لەدێوی کێوی قاف بێ ئەندێشە
ئەو شۆرە سوارە زینەتی زینە
ئەو حاتەم هیممەت سەر حەد نشینە
چابوك سواری بەناوو داو بوو
لە شیروانەدا هاتی راوبوو
ئێستا نادیار سەر رووی بیساتە
لە دوای ئەو عەشرەت رووی لەنەهاتە
هێجکار فەتاح بەگ ئەو رۆستەم رەنگە
ئەو پیلە تەنەی شێوەی نەهەنگە
ئەو شاباز هیممەت ئەو هەڵۆ قینە
ئەو شانو باهو سەهم رەنگینە
سەرتاپا بڵند وێنەی فەرامووورز
ئەهاتە لەرزە لەنەعرەی ئەلبورز
ئەوی تیانییە دەشتی شیروانە
بۆیە لەلای من چۆڵ و وێرانە
ئاخ بۆ قادر بەگ دۆستی مەولەوی
گەردن کەچی بوون شێری سەر زەوی
هەر ئەو زانیویە شینی بۆ بکا
هەر بەیتێك جامێ فرمێسك لەتەکا
خانمان خەریك شین و هاوارە
داخی فەتاح بەگ لەسەر گشت بارە
ئاخ لاڵ بم لەکوێن شۆرە سوارانیان
بێدەنگ و ئاهەنگ گەلی یارانیان
بەو خوایە فەلەك گەر برای ئەمرد
بەناڵە دنیای هەراسات ئەکرد
دەستی نەئەچووە مەرگی جوانانمان
وێران نەئەبوو جێی خان و مانمان
خۆی کەسی نییەو جەرگی بێ ئێشە
مەرگی مەردانی کردووە بە پیشە»[12]

دوای خوێندنەوەی ئەم شیعرە دەتوانین بڵێین، هەر چەندە مەحموود پاشا وەك شاعیرێك نەناسراوەو شیعرەکەشی ناگاتە وردیو وەستاکاری شاعیرێکی وەك مەولەوی بەڵام سۆزو دارشتنێکی شاعیرانەی تێدایەو هەردێنینەوە سەر ئەوەی کە بڵێین لەوە ناچێ کە مەحموود پاشا بەدرێژی ژیانی هەر ئەم شیعرەی هەبووبێ‌و من دڵنیام گەلێ شیعری هەبوەو بەڵام یاخۆی نەیویستوە بڵاوبنەوە یاخود لەماوەی ئەم هەموو ساڵانەدا فەوتاون و لەناوچوون.
لەلایەکی کەشەوە، دڵسۆزی مەحموود پاشا بۆ شیعرو ئەدەبی نەتەوەکەی بەرادەیەك بووە کە شیعری ئەو هەموو شاعیرانەی کۆکردۆتەوەو نووسیونیەوەو لە خۆی بەهێشتری زانیون.



# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## سلێمانی

- ئازاد -

● شانۆ

«باڵندەی دەریا»

لە ٤ـ٩ـ١٩٨٩ وە کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد ـ مەڵبەنـدی گشتی ـ سلێمانی دەستیان بە پێشکەش کردنی نمایشی شانۆیی «باڵندەی دەریا» کرد.

ئەم شانۆییە کە لە هۆڵی ئەدیبان پێشکەش کرا یەکێکە لە شانۆییەکانی شانۆ نووسی گەورە «چیخۆف»، جەزا محـمـد صالح لە عەرەبیـەوە وەری گێڕابـوو ، هونەرمەند «کامەران رۆوف» یش دەری هێنابوو.

ئەو ئەکتـەرانـەی لەم کارەدا بەشـداربـوون بریتیبـوون لەم هونەرمەندانە: (ئاڤان جلال ـ مارینا، صدیق عزیز ـ نیکۆلا، عبدالقادر مصطفیٰ ـ سۆرین ، شەماڵ عبدالله رەش ـ تربلیۆف ، غفور عبدالله رحیم ـ یاکۆف ، فرمێسك مصطفی ـ نینا، حکمت هندي ـ دکتۆر دۆرن ، شادان فۆاد ـ ئەرکادینا، عبدول حەمە جوان ـ تریگۆرین، بەهار عومەر).

کارە ئیداریو هونەریەکانیش بەم جۆرە دابەش کرابـوون: (بـەڕێوەبەری لیژنەی بەرهەم ـ فائق عمر، ئەندامانی لیژنەی بەرهەم: ابوبکر سعیدو بەرێز مجید، بەڕێوەبەری شانۆ ـ حمە سعید مصطفیٰ یاریدەدەرانی بەڕێـوەبـەری شانـۆ: ابوبکر سعیدو شەماڵ فەهمي ، دیکـۆر ـ دەرهێنەر، جێبەجێ کردنی دیکۆر: بەختیار قەرەداغی ـ بژار طه ـ رێبوار نوری ـ یاسین رشید ـ جەزا رشیـد ـ سیـامەند محمد ـ فەرهیدوون زیرەك ـ خلیل أحمد ـ غفور عبدالله، پۆستەر ـ حکمت هندي ، رووناکی ـ دەرهێنەر، جێبەجێ کردنی رووناکی ـ حمە سعیـد مصـطفیٰ ـ زانا توانا ـ بژار طه جل و بەرگ ـ کوێستان جمال، ماکیاج ـ حکمت هندي ، ئێکسسوار ـ بهـاء الدین نوري ، مۆسیقار بەشی مۆسیقای کۆمەڵە، جێبـەجێ کردنی مۆسیقا ـ دڵشاد صدیق و سیروان جلال و نەریمان حەمە کریم).

● پیشانگا:

«پیشانگایەکی هونەری فۆتۆگرافی»

کۆمـەڵەی هونـەرە جوانـەکـانـی کورد لە ٨/٢٤ تا ١٩٨٩/٨/٣٠ و لە هۆڵی مۆزەخـانـەی سلێـمـانی پیشـانگـایەکی هونەری فۆتۆگرافی بۆ هونەرمەند «خالد رسـول» کردەوە کە تیـایـدا کۆمەڵێك وێنەی فۆتۆگرافی پیشان دا کە بەڵگەی هەستیاریەکی فۆتۆگرافیی جوان بوون لای ئەم هونەرمەندە.

کاك خالد لە وتەی دەطلیلەکەیدا دەڵێت: «هونەری فۆتۆگراف دەوری تایبەتی خۆی هەبووە و بەتایبەتیش لە تۆمارکردنی وێنەی دیمەنی جوان و دزێو و ئەو رووداوو کارەساتانەی لە ساتە وەختێکی زۆرکەم دا روودەدات یا لە شوێنێك دا سەر هەڵئەدات و بۆ هونەرمەندی شێوەکار ئاستەم و تووش و نالەبارە.

فۆتۆگراف هونەرێکی سەربەخۆیە، پێویستە لای ئێمە زیاتر رووناکیی بکەیتەوە سەر، با هەنگاوی گەورە بەدووی ئەم پیشانگەیەدا بێت، با دەزگا رۆشنبیریەکان هەوڵی پێشکەوتنی ئەم هونەرە بدەن.. با هونەری کوردی بەم هونەرە مەعوورەبەو دەوڵەمەند بکەین...».

ـ هونـەرمەند خالد رسول ساڵی ١٩٥٦ لە سلێمانی لە دایك بووە.



- سالّی ١٩٧٨ پیشانگەی یەکەمی شێوەکاریی کردۆتەوە.
- سالّی ١٩٨٠ پیشانگەی دووەمی کردۆتەوە.
- بەشداریی زۆربەی پیشانگە هاوبەشەکانی کردووە لە سلێمانیو بەغداو بەسرەو هەولێرو دهۆك.
- لە نەورۆزی ١٩٨٩ دا بۆ یەکەم جار بەشداریی پیشانگەی فۆتۆگرافیی کردووە لە هەولێرو خەلاّتی یەکەم، بروانامەی ئەو پیشانگایەی وەرگرتووە.
- ئەندامی کۆمەڵە وێنەگرانی عیراقە.

«پیشانگایەکی تایبەتی»

هەر لەلایەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کوردەوە، مەڵبەندی گشتی یەکەم پیشانگای تایبەتی بۆ هونەرمەندی لاو «بەختیار قەرەداغی» لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی کرایەوە.

کاك بەختیار لەم پیشانگایەدا (٥١) تابلۆی خۆی پیشان دا لەوانە: (مندالّ و گوڵ، پشوو، خۆشەویستی، ئەو، باوکم، خەون، ماتەمینی، تەنیایی، شەوێك، ئازارەکان، دافنشی، کچ و چرا، مەشکەژەنین، پیاوێکی خەوالّوو ...هتد).

هونەرمەندی لاو بەختیار قەرەداغی
- سالّی ١٩٦٥ لە سلێمانی لەدایك بووە.
- هاوبەشی پیشانگاکانی پلەی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەیی کردووە.
- ئەندامە لە کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد.

(پیشانگایەکی هونەری سیرامیك)

لە لایەن نیقابەی هونەرمەندانی سلێمانییەوەو لەناوەراستی مانگی حەوتدا دووەم پیشانگای سیرامیك بۆ هونەرمەند «هیوا عبدالله» لە هۆڵی مۆزەخانە کرایەوە.



هونەرمەند لەم پیشانگایەیدا نزیکەی هەشتاو هەشت کاری خۆی پیشان دا.

هونەرمەند «قادر میرخان» سەبارەت ئەم پیشانگایە دەڵێت: «سیرامیکی تەقلیدی: دەربرین تیایدا سنووردارە، زۆرلێکردنیش لەسەر ئەرکی دەکەوێت، تێروانینی ئێستا بۆ زمانی ئەم هونەرە وەك بەشەکانی تری هونەری شێوەکارە، گەلێ ئەرکی گەورە وا لەئەستۆیدا، دەشێ بڵێین لایەنی وەزیفەکەی دەچێتە خانەی سەنعەتەوە.

بۆ چێژ وەرگرتن لەم هونەرە پێویست دەکات بێینە سەر هەنگاوە سەرەکییەکانی بەرهەم هێنانی ئەم کارە. هیوا عبدالله لەم بەرهەمانەیدا: تێروانینێکی تایبەتی هەیە بۆ هەڵهێنجاندن لە کەلەپوورەوە، ئەمجا کەلوپەلی قورین بێ یا شتی تر.
دۆزینەوەی سیماو بالاّیەکی ئاشنا پێمان: ئەرکی ئەم و گشت ئەوانەن کە لەم بوارەدا کار دەکەن).

● کۆڕ

«مۆسیقای کوردیو ئەزموونێکی نوێ»

لەلایەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد - مەڵبەندی گشتییەوە لە سلێمانی لە ١٧/٨/١٩٨٩ داو لە هۆڵی یەکێتی نیقابەکانی کرێکارانی سلێمانی کۆڕێك دەربارەی «مۆسیقای کوردیو ئەزموونی نوێ» بۆ هونەرمەندی لاو «غەمگین فەرەج» ساز کرا.

لەم کۆڕەدا کاك غەمگین توێژینەوەی پوختی سەبارەت بە مۆسیقای کوردی خوێندەوەو لەگەڵ توێژینەوەکەشدا نموونەی تەتبیقی پێشکەش دەکراو نموونەکانیش لەلایەن کۆمەڵێك هونەرمەندی لاوەوە بەجێ دەهێنران کە بریتی بوون لە: (سامان حەمە کریم

کەمان، ڕێبوار عبد ـ کەمان ، دانا عبدالله میدیا ـ کەمان، بریار عمر ـ کەمان ، کوێستان عزیز ـ کەمان ، هێرش عمر رضا ـ کەمان ، ابراهیم محمد علي ـ کەمان، نەبەز نصرالدین ـ کەمان، ئاکۆ محمد جزا ـ فلووت، هێرش عبدالله ـ کلارنیت ، نیاز نوری ـ ڤیولا، سیروان جلال ـ ڤیولا ، شازاد محمد ـ فلووت ، گۆران کامل ـ چەڵۆ ، نەریمان کریم ـ چەڵۆ، عزیز حمە کریم ـ چەڵۆ، بهجت یحی ـ گۆرانی بێژو ساز ژەن، عدنان کەریم ـ گۆرانیو عوود، لاوك لطیف ـ مایسترۆ، بەختیار حەمە کریم ـ مایسترۆ).

شایانی ئاماژە کردنە کە کۆڕەکە ژمارەیەکی زۆر لە دڵدارانی هونەری مۆسیقا ئامادەی بوون.

«چلەی ئەدیبی خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ محمدی خاڵ»

لە لایەن دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی ـ لقی سلێمانییەوە؛ سەر لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٩/٨/٢٤ و لە هۆڵی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیریو لاوان لە سلێمانیو بە ئامادەبوونی بەڕێز جعفر عبدالکریم بەرزنجیو ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب و نووسەران و ئەدەب دۆستان ؛ کۆڕی چلەی ماتەمی ئەدیبی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ محمدی خاڵ سازکرا.

سەرەتا چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز خوێندرایەوە.

پاشان بەڕێز مامۆستا (مصطفى صالح کریم) کە کۆڕەکەی بەڕێوەدەبرد دەستی بە پێشکەش کردنی بەشداربووانی ئەم کۆڕی ماتەمینە کردو بەم جۆرە دەست بە خوێندنەوەی وتارەکان کرا:ـ

ـ وتاری دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی کە لە بری بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی دەزگا مامۆستا مصلح جەلالی؛ مامۆستا مختار فائق خوێندییەوە.

ـ وتاری یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد ـ لقی سلێمانی؛ لەلایەن کاك «فریا جاف»ە]وە.

ـ وتاری مامۆستا «عبدالکریمی مدرس» کە لەبری خۆی مامۆستا «مصطفى نەریمان» خوێندیەوە.

ـوتاری بەڕێز عبدالقادر قەزاز

ـ وتاری بەڕێز د. صالح أحمد علي کە لەبر ی خۆی بەڕێز عبداللطیف عبد المجید گلی خوێندیەوە

ـ وتاری مامۆستا جمال عبدالقادر بابان.

ـ شیعرێکی لاوانەوەی مامۆستا حسیب قەرەداغیی شاعیر کە لەلایەن کاك ئازای کوریەوە خوێنرایەوە.

ـ وتاری بەڕێز مامۆستا جمیل ڕۆژبەیانی، کە لەبر ی ئەو مامۆستا عبدالرزاق بیمار خوێندیەوە.

ـ وتاری مامۆستا د. عزالدین مصطفى رسول.

ـ وتاری بەڕێز د. شکریة رسول.

ـ وتاری مامۆستا محمود أحمد محمد.

ـ شیعرێك بە ناونیشانی «بە تیلماسکێ لە مانگەشەو فرمێسکی چاوانتان بسڕن» لەلایەن شاعیر «ئەژی گۆران»ەوە.

ـ وتارێك بە ناونیشانی «لایەنی زمانەوانی لای مامۆستا شێخ محمدی خاڵ» لەلایەن مامۆستا «ڕۆوف ئالانی»یەوە.

ـ وتارێك لەلایەن مامۆستا «محەمەدی مەلا کەریم»ە]وە.

پاش خوێندنەوەی ئەم وتارانە؛ چاو پێکەوتنێك کە بە جیهازی ڤیدیۆ لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆشبوودا تۆمار کراوە پیشانی ئامادەبووان درا.

دوای ئەوە پارچە شیعرێك لەلایەن شاعیری میللی کاك «قادر برسی»ەوە خوێنرایەوە. هەروەها بەڕێز عبدالرحمن موفتی هەندێ یادگاری خۆی لەگەڵ خوالێخۆشبوودا گێڕایەوە.

دوا وتاریش لەلایەن مامۆستا ساجد ئاوارەوە خوێندرایەوە.

ئینجا بە خوێندنەوەی وتاری بنەماڵەی خوالێخۆشبوو لەلایەن کاك «خالد»ی کوڕی خوالێخۆشبووەوە کۆتایی بەم کۆڕە هێنرا کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدەب دۆستان

ئامادەی بوون.

چەند دێڕێك سەبارەت مامۆستای خوالێخۆشبوو:

● شێخ محمدی کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەمین لە سالی ١٩٠٤ زدا لە دایك بووە.

● تەمەنی نۆ سالان بووە؛ باوکی کۆچی دوایی کردووەو چووەتە ژێر چاودێری‌و سەرپەرشتی حاجی شێخ ئەمینی باپیرەیەوە.

● لە کۆتاییەکانی سالی ١٩٣٩ داو بووە بەقازی‌و بۆ ماوەی ٢٨ سال لە کەرکوك و موسل و هەلەبجەو چەمچەمال قازی بووە .

● لە سالی ١٩٦٧ دا خانەنشین کراوە.

● لە سالی (١٩٥٤)ەوە ئەندام بووە لە کۆڕی زانیاریی عیراق.

● لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٠دا بەسەرەکی یەکێتی نووسەرانی کورد ـ لقی سلێمانی هەلبژێراوە.

● زۆر لە نووسینەکانی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی وەکو ژین و ژیان وهیواو رۆژی نوێ‌و گەلاوێژو سلێمانی‌و بلێسەو بەیان و زانکۆو پەروەردەو زانست و گۆڤارەکانی کۆڕ دا بلاو کردوەتەوە

● نزیکەی بیست و یەك کتێبی پاپکراوی هەیەو چەند دەستنووسێکیشی چاوەڕێی چاپن.

● **دیدارێکی زانستی‌و پێشانگایەك لە مەلبەندی سەرپەرشتی زانستی سلێمانی‌دا**

★ رۆژی چوارشەممە ١٩٨٩/٧/٢٦ لە مەلبەندی سەرپەرشتی زانستی سلێمانی‌دا پێشانگای سالانە کرایەوە کە تێ‌یدا ئەم مەلبەندانە بەچەندین ئامێرو بابەتی زانستی جۆراوجۆر لە بوارەکانی فیزیاو گەردوون ناسی‌و کیمیاو کۆمپیتەرو بایۆلۆژی‌و کارەباو ئەلکترۆن ...هتد، بەشداری‌یان کردبوو، مەلبەندەکانیش ئەمانە بوون: مەلبەندی سەرپەرشتی زانستی سلێمانی، هەولێر، دهۆك، مەلبەندی رۆشنبیری‌و لاوانی سلێمانی، شەهید ـ سلێمانی، چەمچەمال، عەینکاوە ـ هەولێر، کۆیە ـ هەولێر، دهۆك. سمێل، عەمادی‌یە، زاخۆ.

شایانی باسیشە کە بلاوکراوەی دیواریش هاوکات لەلایەن ئەم مەلبەندانەوە لە هۆلەکانی مەلبەندی سەرپەرشتی زانستی سلێمانی‌دا پێش کەش کرا بوو کە چەندین باس و بابەتی قەشەنگی تێدابوو.

**دیداری یەکەمی فیزیاو گەردوون ناسی:**

رۆژانی یەك شەممەو دووشەممە ٣٠، ١٩٨٩/٧/٣١ لە هۆلی مەلبەندی سەرپەرشتی زانستی سلێمانی‌دا دیداری یەکەمی فیزیاو گەردوون ناسی سازکرا، کە سەرەتا بە ووتەی بەرێز مامۆستا (حسين كريم) بەڕێوەبەری مەلبەند دەستی پێ‌کردوو تێ‌یدا ئاماژەی بۆ گرنگی ئەم جۆرە دیدارو کۆڕە زانستی‌یانە کردو پاشان کۆرەکان دەستی پێ‌کرد کە هەر رۆژەی بۆ دوو کۆڕ تەرخان کرابوو.

● **رۆژی یەکەم**

● **کۆڕی یەکەم: زانستی ئەتۆم**

لەلایەن مامۆستا (مەریوان ئەحمەد رەشید)ەوە. لەم کۆڕەدا مامۆستا باسی تەنۆلکە سەرەتایی‌یەکان و، گۆڕانکاری ووزە لەنێوان ئەو تەنۆلکانەو، دۆزینەوەی گرنگترین لایەنەکانی ئەم بوارەی فیزیای باس کردو



کۆڕەکەش لەلایەن بەڕێز کاک (ئازاد تۆفیق)موە بەڕێوە برا.

● کۆری دووەم: کەشتی‌یە ئاسمانی‌یەکان.

لەلایەن قوتابی ئەندامی بەشی گەردوون ناسی کاک ازانا رؤووف حەسەن)موە.

لەم کۆڕەدا کاکە زانا باسی چۆنێتی بەڕێکردنی کەشتی‌یە ئاسمانی‌یەکانی کرد لەزەوی‌یەوە بۆ ئەو شوێنەی مەبەستمانەو هەروەها باسی جۆرەکانی کەشتی‌یە ئاسمانی‌یەکانی روون کردەوەو کۆڕەکەش لەلایەن بەڕێز کاک (بەڵێن ئەحمەد)موە بەڕێوە برا.

● رۆژی دووەم

● کۆری یەکەم: ئەستێرە

لەلایەن قوتابی ئەندامی بەشی گەردوون ناسی (سیروان تۆفیق)موە.

لەم کۆڕەدا کاکە سیروان پێناسەی ئەستێرەو هەنگاوەکانی دروست بوون و مردنیانی کردو گرنگترین سیفەتەکانیشیانی لە بارەی پلەی گەرمی‌و بارستایی‌و چەندەهای تردا روون کردەوە. کۆرەکەش لەلایەن مامۆستا (مەریوان ئەحمەد رەشید)موە بەڕێوە برا.

● کۆری دووەم: بەراوردێک لەنێوان فیزیای کلاسیك و فیزیای نوێدا لەبەر رۆشنایی بیردۆزەی کوانتەمدا.

لەلایەن قوتابی ئەندامی بەشی فیزیا (محمد مجید عارف)موە.

برای کۆرگێر ئەو لایەنانەی روون کردەوە کە فیزیای کلاسیك دەستەوستان بوو لە لێکدانەوەی‌داو بووە هۆی سەرهەڵدانی بیردۆزەی کوانتەم ... کۆرەکەش لەلایەن مامۆستا (کاوە محمد جمال)موە بەڕێوە برا.

● شایانی باسە کە بابەتەکان بەهۆی ئامێری (ئۆفەر هێد)و فلیمی سینەمایی‌یەوە روون دەکرانەوە.

○

## دهۆک — مەتین

### «رۆژا سەرکەفتنێ‌و پێشانگەهەك»

بهەلکەفتنا رۆژا سەرکەفتنا مەزن، ل ژێر چاڤدێریا هێژا حسین عمر حاجي قایمقامێ دهوکێ، رێڤەبەریا رەوشەنبیری‌و لاوان ل رێکەفتا ۱۹۸۹/۸/۸ ل هولا رێڤەبەرێی پێشانگەها سێ یا هونەرمەندێ شێوەکاری «وعد عزیز ئاکرەیی» هاتە ڤەکرن.

ئەڤ پێشانگەهە ژ ۳۰ کارێت شێوەکاری پێك هاتی‌بو.

● وعد عزیز ئاکرەیی ●

ـ ل سالا ۱۹٦٥ێ ل ئاکرێ ژ دایك بویە.

ـ دەرچوویێ ئاموژگەها رێڤەبەرێیە سالا ۱۹۸٤.

ـ پێشانگەها یەکێ ل سالا ۱۹۸٦ێ ل ئاکرێ ڤەکریەو یا دوێ سالا ۱۹۸۷ ئەوژی ل وێرێ.

### «دەربرین دهوزانێ‌دا»

ل ئێڤاریا رۆژا ۱۹۸۹/۸/۱٤ێ کۆرەك بو هوزانڤانێ هێژا «صدیق شروەی بەرپرسیارێ لیژنا رەوشەنبیری یا ئێکەتیا نڤیسڤانێت کورد ل دهوکێ کۆرەك سەبارا «رەخنا هوزانێ» پێش کێش کر. هێژا رشید فندی کۆر گێرا. کەکێ موحازر ل پێشیا بابەتێ خوە تلا خوە درێژکرە رێبازو مەسەبێت رەخنێ‌و ل نك رەخنا کوردی یا ئەڤرو راوستیا. پاش بدرێژی لسەر نویخازیێ دهوزانێ‌دا ئاخفت.

ل دوماهیێ برادەرێت ژێری کەفتنە قاداداان و ستاندنێ سەبارا راوبوچوونێت دبابەتی‌دا هاتین: تیلی امین-



عبدالكريم فندي/فهمي بالايي/كريم جميل بياني/قسيم حسن پێزانێ ئاليخاني.

«د. ماروف خەزنەدار ل ميڤانداريا ئەدیبێت دهوکێ»

ل ئێڤاريا رۆژا ١٥/٨/١٩٨٩ ئێکەتيا نڤيسڤانێت کورد ـ تاپێ دهوکێ هێژا دکتور مار ف خەزنەدارميڤان کرد هێژارشيد فندی دکتور پێش کێش کر.

دڤێ ئێڤاريێدا کاك رشيدی سێ مەحاور پێشنيازکرن کو دکتور بو ئەديب و رەوشەنبيرێت دهوکێ ل سەر باخڤيت، ئەوژی ئەڤێت ژێری بون:

١) کوردناسی ل روهەلات و روئاڤای.

٢) سەربورا دکتوری ل وەلاتێ جەزائيریێو بارێ رەوشەنبيری ل ڤی وەلاتێ برا.

٣) هوزانا مللی يا کوردی.

پشتی نافبری بدرێژی لسەر ڤان بابەتا ئاخفتی مشە پرسيار ژێ هاتنە کرن و ژلايێ خوڤە بەرسڤا وان هاتە دان و کۆری نێزيکی سەعەت و نيڤا کێشا.

«شانوا زاروا»

ئێکەتيا نڤيسڤانێت کورد ل دهوکێ ل رێکەفتا ١٧/٨/١٩٨٩ کۆرەك بو هونەرمەندێ گەنج کاك «ابراهيم عيسێ»ی ل باغچێت ئێکەتيێ سازکر سەبارا شانوا زاروا.

هونەرمەند «فهمي بالايي» موحازرە پێش کێش کر.

ژرێڤە کورتيەك سەبارا شانوا زاروا هاتە خوياکرن.

ژلايێ: دەستپێکرن و وەرارو مەسەبا.

پاش بەحسێ شانوا زاروا ل عيراقێ هاتەکرن.

ددويڤدا ب درێژی لسەر شانوا کوردی يا زاروا ئاخفت و گوت: «هەتا نوکە کوردا چ بهايێ وسايێ پێش چاف نەدايە شانوا زاروا و زارو يێ بێ بارە ژبەر هەمێت نڤيسڤان و هونەرمەندێت وان». پشتی هينگێ هات و ئارمانجێت شانوا زاروا دەست نيشان کرن و هژمارەکا کارێت شانوگەری کرنە نمونە بو راو بوچونێت خوە. ل دوماهيێ قوناغێت شانوا زاروا هژمارتن و لسەر ئاخفت و دان وستاندنەکا گەرم و گور چێبوو ئەڤ هێژايە ئاخفتن: صبری بوتانی د. فاضل عمر عادل حسن نزار محمد سعيد صديق شرو.

«چيروکا فولکلوری ل ديوانا ئەدیبێت کورد»

ژچالاکێت ئێکەتيا نڤيسڤانێت کورد ل دهوکێ ل رێکەفتا ٢١/٨/١٩٨٩ کۆرەك بو هێژا عبدالعزيز خەيات ێ هوزانڤان هاتە سازکرن. هژمارەکا ئەديب و رەوشەنبيرێت دهوکێ لڤی کۆری ئامادەبون. سەيدا نزار محەمەد سعيد ئەڤ کۆرە برێڤە بر. ل پێشيێ کاك عبدالعزيزی سەخلەتێت چيروکا فولکلوری کوردی ل دوی هزرو بيرێت خوە دەست نيشان کرن. پاش تەرزێت چيروکا فولکلوری کوردی هژمارتن و هەر تەرزەکی ژێ ناڤەروکا چەند چيروکا گێران وەکو نمونە. ئەڤەوبابەتێ خوە ب دوماهی ئانی پشتی ب چەند خالەکا مەبەست ژڤان چيروکا پێش چاف کرن.

ل دوماهيێ چەند برادەر لسەر راوبوچونێت موحازری ئاخفتن و روناهی بسەر هنەك لايێت تاریدا بەردان و



ـمت زیندە تێروتەسەل و بتام کەت ژوان برادەرێت
ـحفتین: جلال مصطفى محمد، محسن قوچان.

**«دگەل شانوگەریا بوچی»**

ژبزاڤێت نیقابا هونەرمەندا ل دهوکێ، تیپا شانوا
ـورمشـڤـان ل رێکـەفتـا ٢٥/٨/١٩٨٩ێ ل هولا
ـوشەنبیریێو لاوان شانوگەریا «بوچی» پێش کێش کر
ـڤ شانوگەریە ژنڤیسینا فهمی سلمان ی‌یەو دەرهێنانا
عادل حسن ی‌یە.
ـارڤەکەرێت پشکدار ژی هێژائێت ژێری بون:
١ـ لقمان طیب ٢ـ عمر علي طه ٣ـ أحمد محمد سلیم
ئەڤەو سێ روژا ل دوی‌یەك شانوگەری هاتە پێش کێش
کرن.

**«ئەزو ئاگر لبەر تیشکا رەخنێ»**

دچارچوڤێ وەرزێ رەوشەنبیری‌دا یێ ئێکەتیا نڤیسڤانێت
کورد ل دهـوکێ ل رێکەفتا ٢٨/٨/١٩٨٩ هوزانڤانێ
هێـژا نجیب صالح بالایی کورەکی رەخنـەیی سەبـارا
دیوانا کاك هزرڤان عبد اللهی «ئەزو ئاگر» پێش کێش کر.
هێژا ابراهیم سموی کور بریڤەبر.
ل پێشیا بابەتێ خوە کاك نجیب ی بکورتی لسەر هوزانێ
ئاخفت وەك دەرازینکـەك بو بابـەتێ خوە، پاش ئاف
بابەتی‌دا چوخاریێو لسەر ڤان لایێت ژێری بارڤەکر:
١) وینێت سەرکەفتی‌و نەسەرکەفتی دهوزانێت
دیوانێ‌دا.
٢) وەرگرتنا سەربورا شعری ژخوەی سەربورێت ناڤدار
ژ هوزانڤانا.
٣) بکارهینانا کەلەپوری دهوزانێدا.
ل دوماهیێ ڤان برادەرا پشکداری ددان و ستاندنێ‌دا
کرن: رشید فندی، صدیق شرو، بەیار باڤی.

**«زمـانێ کوردی‌و ڤەکولینەکا بەراوردکاری»**

هوزانڤانێ هێژا قسیم حسن ماموستایێ زمانێ کوردی



ئێکـەتیـا نڤیسڤـانێت کورد ل دهـوکێ ل رێکـەفتـا
٣٠/٨/١٩٨٩ پێش کێش کر. هێـژا صدیق هروری
موحازر پێش کێش کر. ژرێڤە سەیدای تبابەکێ لسەر
مێـژوا زمـانێ کوردی ئاخفت. پاش چەنـد بابەتەکێت
رێزمانێ گرتن و ئێك ئێکە لسەر ئاخفت و نمونە ژهەردوو
زاراڤێت کورمـانجی بیت سەرەکی ئانین، ئەو بابەتێت
بەحسێ وان ژی کرین ئەڤەبون:

١) ئامرازی پەیوەندی‌و لێکدەر.
٢) نێرو مێ‌و چەند باری تایبەت.
٣) کوکرنا ناڤ و ئاولناوو ئاولفرمانی کات و شوێن و
فرمان.
٤) پلەکانی ئاولناو.
٥) فرمانی رانەبوردوی کاتی ئێستاو داهات و.
٦) راناوی کەسی تاك و کوو جوداو لکاو.
٧) فرمانی دیارو نادیارو گورینا دیاری تێپەر بو نادیار.
٨) چاووگی دالی.
ل دوماهیێ هژمارەکا برادەرێت حازر ژئەدیب و ئەدەب
دوستێت دهـوکێ لگـەل سەیـدای کەفتنـە قادادان و
ستاندنێ سەبارا راو بوچونێت دبابەتێ وی‌دا هاتین و
کور بدوماهی هات و نێزیکی سەعەتەکێ کێشا.



## «تیپا ئەفروێ كۆرەك لسەر شانوێ»

ژچـالاكێیت تیپا ئەفرو شانوێ ل دهوكێ، ل رێكەفتنا ١٩٨٩/٨/٣١ ل باغچێت ئێكـەتیـا نفیسڤانێت كورد كۆرەك بو هونەرمەند «احسان عثمان»ێ هاتە سازكرن سەبارا «دراما داستانی». سەیدا نزار محمد سعیدی كۆر گێرا.

لسەرێ بابەتێ خوە موحازری بەحسێ رهـ و قوناغێت شانوێ بگشتی كرو تلا خوە درێژكرە شانوا داستانیو دانـاسین. تبابەكێ ل نك ئەرستوی راوستیاو راو بیرو هزرێـت وی سەبـارا داسـتـانـێ ل قەلەم دان. پاش بدرێژی لسەر شانوا بریخت ی ئاخفت و چەند خالەك لسەر رێچ و رێبازێت وی بێت نوی ل شانوێ زێدەكرین رون كرن لسـەر رێكـا بەرفـرەهكرنا ئارمانجا شانوێ دژیانا ملەتادا.

ددویڤدا بدرێژی لسەر ڤان خالا ئاخفت:

١) بكارهینانا مێژوێ دشانوێدا.

٢) هاڤیبون ـ التغریب ـ دشانوێدا.

٣) داستان دشانوێدا.

ل دوماهیێ دەرفەت بو مێڤانێت كۆری هاتەدان لسەر بابەتێ كۆری باخڤن، برادەرێت ژێری پشكدار بون: عادل حسن ـ موفق رشدی ـ محسن عثمان ـ ابراهیم عیسێ ـ بائیز عمر ـ صدیق شرو.

## «پێشانگەهەكا شێوەكاری»

ل رێكەفتا ١٩٨٩/٩/٣ ل هولا رێڤەبەریا رەوشەنبیریو لاوان و بهەلكەفتنا حەفتیا قادسیا صدام ی پیروزو ل ژێـر چاڤـدێـریـا هێـژا پارێزگەرێ دهوكێ رێڤەبەریا رەوشـەنبـیریو لاوان ل دهـوكێ پێشـانگـەهـا یەكێ هونـەرمـەنـد بشـار خیرالله بشـیر هاتـەڤـەكرن ئەڤ پێشانگەهە ژ ٣٥ كارێت هونەری پێك هاتی بو.

● بشار خیرالله بشیر ●

ـ ل سالا ١٩٦٥ێ ل بەغدا ژدایك بویە.

ـ دەرچویێ پەیانگەها هونەرێت جوانە ل مویسل سالا ١٩٨٩ێ.

ـ دمیهرەجانێت سالانەدا ل پەیمانگەها هونەرێت جوان پشكداری هەنە.

## «كۆرەكێ چیروك خاندان و رەخنێ»

ل رۆژا دوشـەمبێ رێكـەفتا ١٩٨٩/٩/٤ بهەلكەفتنا حەفتیـا قادسیا صدام یێا پیروز، ئێكەتیا نفیسڤانێت كورد ـ تایێ دهـوكێ كۆرەكێ چیروك خانـدنێ بو هێژا قیران فرج ی رێكخست. هوزانڤانێ هێژا نجیب بالایی كۆر گێرا.

پشتی كاك قیران ی چیروكا خوە خاندی ئەوا كو ل ژێر نافنیشـانێ «خـرو» سەیـدا نزار محمـد سعید چەند تێبینیەك لسەر چیروكی دەست نیشان كردن.

لایـت چیروك نڤـیس تێـدا سەركـەفتی دیسـا لایێت نەسەركەفتی ل قەلەم دان نەخاسمە دەرازینك و داویا چیروكێو كێم و زێـدەهیێت ژبـهـایێوێ تینە خارێ. دویڤـدا دان وستـاندنەكا گەرم خوە كێشا مەیدانێو برادەرێت خارێ تێدا پشكدار بون:

كریم جمیل بیانی ـ بائیز عمر احمد ـ محسن قوچان ـ سلمان كوڤلی ـ عبدالعزیز خەیات و گەلەكێت دی.



ئەدرەس : هەولێر : ئەمیندارێتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ۲۰۸۸۲

# پۆستەی کاروان

## سۆران

**براو خوشکە ئازیزەکانم:**
**لەگەڵ دوا ژمارەی ساڵی حەوتەمی تەمەنی گۆڤارەکەتاندا بەیەک دەگەینەوە، لەم ژمارەیەشدا وەڵامی کۆمەڵە نامەو بەرهەم و نووسینێکی ئێوەی ئازیزو خۆشەویست دەدەینەوە: وەڵامی ئەو نامە پڕ سۆزو خۆشەویستی یانە دەدەینەوە کە لە ئێوەی دۆست و هاوڕێی «کاروان»ەوە پێمان گەیبوون و، پڕن لە وشەی شیرین و پەیمانی پشتگیری کردنی گۆڤارەکەتان کە لەگەڵ دەرچوونی ئەم ژمارەیەدا مۆمی حەوتەمی تەمەنی دەکوژێنێتەوە، مۆمێکی تازە دادەگیرسێنێ و، پێ دەنێتە قۆناغێکی تازەی خزمەت کردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی یەوە.**

**بەڕێزان:**
**ئێمە گەلێ جاری دیکەش گوتوومانە هاوکاریو دۆستایەتی ئێوە باشترین و بەتین ترین پالپشتن بۆ بەردەوام بوون و بەرەو پێشەوە چوونی گۆڤارەکەتان، جا بۆ ئەو پەیوەندی یەی ئێمەو ئێوە زۆر لە جاران پتەوتر بێ و، بۆ ئەوەی هەموو خوێنەرو نووسەرێکی کورد لە «کاروان» ڕازی بێ و، بەدڵی هەموو لایەک بێت.. داواتان لێ دەکەین تا بۆتان دەلوێ ئەو بەرهەم و نووسینانەمان بۆ بنێرن کە دەبنە مایەی دەوڵەمەند کردنی کاروان و، بە پێزکردنی بابەتەکانی.. ئەڵبەتە ئەم کارەشتان دەبێتە مایەی شانازی پێوەکردن و، لە هەمان کاتیشدا خزمەتکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی و کەلەپووری نەتەوەکەمانە.**

**بەڕێزان:** ئەمجارەش وەکو زۆر جاری دیکە دەڵێین: ئەو بابەت و بەرهەمانەتان کە بۆتان ناردووین، نامەی پەسندکردنیانتان بۆ **هاتووە، ئەوە بێ سێ و دوو بڵاودەبنەوە، ئیتر نە پێویست دەکا ئەم و ئەوی بۆ ڕاسپێرن کە دواکەوتووە زوو بڵاوی بکەینەوە، نە هەر دوای دوو سێ مانگ گورج بۆ گۆڤارێکی دیکەی ڕەوانە بکەن بێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بکەن. چونکە یەکەم: ئێمە بابەتەکان بەپێی زووو درەنگی گەیشتنی بابەتەکان و، کات و بایەخی یان بڵاویان دەکەینەوە، دووەم: کە گوتمان بڵاو**

دەبنــەوە، ئەوە دەبێتــە موڵكی گۆڤــارەكــەمــان ئیتــر ئێمە لە نووسەرەكەی زیاتر لێی بەرپرسیارین. جا گەر رەفتاری هەندێ نووســەر لەم دوو خاڵەی سەرەوە بەدەر بێت. ئەوە بێگــومان دەمانخاتە هەڵەو ئەو نەخشەیەی كێشاومانە ئاڵۆز دەبێ، ئەو كاتــە ناچــار دەبین گلەییتان لێ بكەین، ئەڵبەتە حەزیش بەوە ناكەین دڵتان بڕەنجێنین..

بە هەر حاڵ ئێمــە لە یەكەم ژمارەدا گوتوومانە كاروان موڵكی هەموو نووسەرێكی كوردە، ئێستاش لەسەر هەمان ڕاوو بۆچوونی خۆمانین و، هەرگیز لێی پاشگەز نەبووینەتەوە، جا با وابكەین زیاترین ژمارە لە نووسەرانی كورد سوود لە لاپەڕەكانی گۆڤارەكەمان وەربگرن و، هەوڵی ئەوە نەدەین پەنا وەبەر ئەم و ئەو بەرین بۆ ئەوەی بابەتێك یا بەرهەمێكمان بۆ بڵاوبكرێتەوەو، ماوەش لەبــەردەم بەرهــەمی چاك و ڕەسەن و بەسوود تەسك بكــەینــەوە، نەخێر وا چاكە ئەم ڕەفتارە واز لێ بێنین و بواری تەشەنەكردنی نەدەین.

**ئێستاش فەرموون لەگەڵ وەڵامی نامەو بەرهەمەكانتان كە بوونەتە میوانی گۆشەی پۆستەی كاروان.**

● **بۆ خوشكە چاوان یاسین حمە غەریب لە شاری سلێمانییەوە..**

پێشەكی سوپاس بۆ ئەو ووشە جوان و ڕازاوانەت كە لە نامەكەتدا هاتوون.. بەڵام داخمان ناچێ كە ئەو شیعرەی لەژێر ناوی «بــەچیم دەكــەی بمكە!!»، ئەگەرچی تا ڕادەیەكی باش سەركــەوتــوو بوو؛ بەڵام لەگــەڵ ڕووەوە لەگــەڵ ڕێــبــازی گۆڤارەكەماندا ساز نەبوو، بۆیە دەبێ ببووری كە بۆمان نەكرا بڵاوی بكەینەوە؛ خۆزگە بەرهەمی باشترت بۆ دەناردین.

● **بۆ هەڤاڵێ مە یێ خوشتڤی «كیڤی ئەمین ئەتریشی» ل پارێزگەها نەینەوا..**

ئەم گەلەك سوپــاسیاتە دكەین بۆ ئەڤ هاریكاریا تە د گەل گوڤارا مە «كاروان»؛ هەردوو هۆزانێ تە یا لبن ڤان ناڤ و نیشانێن: «ئەزو بەهار، بهار چی‌یە... كی‌یە». گەهشتنە مە، بەلێ مخابن كو هەردوو هۆزان بۆ بەلاڤكرنێ نەشیان، هیڤی دارین هۆزانێت چێتر بۆمە ڤرێكەی‌و، جارەكادی سوپاس.

● **كاكە «ع . م . ج» لە كۆمەڵگای ڕانیە،،**

كاكی برا: ئەو شیعرەی بەناوی «بێوەفا بووی بارگەت تێــك ناو نەهــاتیــەوە» بۆت ناردووین هەر هەمــووی شیــاوی بڵاوكــردنــەوە نەبــوو، بۆیە تەنها ئەم كۆپلەیەمان هەڵبژارد، هیواخوازین لەمەودوا بەرهەمی چاكترمان بۆ بنێریت، ئەمەش كۆپلەیەكی شیعرەكەتە..

**وەك مەلیكی جوانی بچووك**
**لەناو هێلانەی دڵمدا**
**ئارامت گرت..**
**بەڵام كاتێ كە گەورە بووی**
**لە شەقەی باڵەكانت داو،**
**نەهاتیەوە...**
**بێوەفا بووی... بێوەفا بووی**
**نەهاتیەوە**

● ★ ● ★ ●

● **بۆ كاك «ب . ا. نصر الله» لە بەغداوە..**

كاكی برا؛ ئەو شیعرەی بەناوی «شەوی پەستی» كە بۆت ناردووین زۆر سادەو ساكار بوو، شیاوی بڵاوكردنەوە نەبوو، خۆزگە بەرهەمی باشترت بۆ دەناردین.

● **بۆ كاكە «هەڵوێست عمر» لە هاوینە هەواری شەقلاوە..**

براله نامە جوانەكەت خۆشحاڵی كردین، ئێمەش لەگەڵ تۆدا دەڵێــین ئەو كەسانەی ڕەنج نەدەن و تێنەكۆشن مەحاڵە بگــەنە ئەو ئامانجەی مەبەستیانە هەموو پێش كەوتن و گرەو بردنەوەی گەلانی سەر زەمینیش لە ئەنجامی ڕەنج و كۆششی ڕاستەقینەی ڕۆڵە دڵسۆزەكانی‌یەوە بووە.

بەڵام برا؛ ئەو پەخشانەی بەناوی «ژوان و ......» بوو كە بۆت ناردووین؛ **یەكــەم**: زۆری ماوە ببــێ بە پەخشــانێكی سەركەوتوو و بشێ بۆ بڵاوكردنەوە، **دووەم**: لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ

ڕەوت و ڕێبازی گۆڤارەکەماندا ڕێك ناکەوێ.. بۆیە دەبێ بمان بەخشی لە بڵاونەکردنەوەی، هیوادارین هەوڵی باشتر بدەیت و هەنگاوی سەرکەوتووتر بهاوێژی.

● بەو ئەو نووسەرە بەڕێزانەی ئەم شیعرو بەرهەمانەیان بۆ ناردووین..

« تۆرانی یار، چاوەڕوانی، هاوارێك بۆ یارم، کۆرپەلەی شیعر، بۆ ژیار، بەفری داگیرکەر، بۆ شەهیدو وەتەن ، بۆچ ، دڵم، من و تۆ، ئەگـەر بێ‌تـۆ، نەورۆزو کانیو قەڵا، شارەزوور، بۆ خۆشەویستمان، لە کیشوەرێکی بێ‌نان، هاودەم، گەر دەتەوێ، هەستێك لە دەروون، ئازار شەرەفە، لەدایك بوون».

سوپـاسـتـان دەکەین بۆ هاوکاریو دڵسۆزیتان لەگەڵ گۆڤارەکەماندا، ببوورن کە ئەم بەرهەمانەی لەسەرەوە ناومان بردوون شیـاوی بڵاوکـردنەوە نەبوون، چاوەڕوانی بەرهەمی سەرکەوتووترتاینن و، هەربژین ..

● بۆ نووسەرانی ئەم بەرهەمانە:

«نالینەك ل سبێ، ئەڤین ئێکەو نابیتە دوو، دیمەنەکێ نوی لە ئەسمانێ، ئەزو هزر، هۆ جانا من».

لەگـەڵ سوپـاسێکی زۆر بۆ هاوکـاری کردنتان لەگەڵ گۆڤـارەکـەمـانـدا، دەبێ ببـوورن لە بڵاونـەکـردنـەوەی بەرهەمەکانتان چونکە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون. چاوەڕوانی بەهەرەی باشترتانین.

● بۆ برای ئازیز فرهاد سعید هەرکی لە پارێزگای هەولێرەوە..

براگیـان ئەو شیعـرەی بەنـاوی «جـانـا من»ەوە بۆت ناردووین، وەکو سەرەتا هەوڵدانێکی چاکە؛ بەڵام هێشتا زۆری ماوە بگاتە پلەی بڵاوکردنەوە، خۆزگە زیاتر هەوڵت دەدا، تاوەکو شیعری سەرکەوتووترمان بۆ بنێری..

● بۆ ئەم برا بەڕێزانە:

« حمد توفیق محمد علي، حسین طه حسین، غازی جبار عالّلاي، ئاراز باغـە جنـێری، ستار احمد عبدالرحمن، ئاوەی غەریبی، شیروان ڕێدار، دلێر، کاکە خان عبدالله محمد أمین، رزگار عزیز گەلاڵی، سفین حسین صالح، احمد کاکە مانی، س. کەریم عبـدالله، حمیـد محمـود امین قرداغی، عبدالرحمن ئاوارە، ك . ش . حمە خورشید، ئەیوب کوردی، مصطفی حمد محمدامین، علی سعید علي شێخانی، سالار . ر . م، ناصر دڵ برین، سیروان بێوار، خ . علی خورشیـد، خەبات سەودایی، ئارام . ع . ع . ر. م . دێ لێژەیی، اسماعیل سلیم هەورامانی».

برا ئازیزەکانم؛ پێشەکی لە ناخی دڵەوە سوپاستان دەکەین بۆ ئەو هەستـە بە جۆشەی لە زۆربەی نامەکانتاندا هاتوون، لە هەمان کاتیشدا پیرۆزبایی لە گۆڤارەکەمان و لە ئێوەش دەکەم کە یەکەم: کاروان لەم چەند ساڵەی تەمەنیدا توانی بەشێکی زۆر لە خوێنەرو ئەدەب دۆست و نووسەران لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، دووەم: توانی کۆمەڵێکی زۆر لە گەنجانی وەك ئێوە تەنانەت پیرەکانیش بێنێتە دەنگ و، دەست بۆ قەڵەم بەرن و، لاپەرەکانی برازێننەوە.. بێگومان ئەم دوو خاڵە بە پلەی یەکەم مایـەی شانـازیـیـەکی زۆرە بۆ کاروان.. ئەمـەیان لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە، وە بۆ ئەوەی هەوڵی هەموو لایەکمان بۆ ئەوە بێت کە خەرمانی ووشەی رەسەنی کوردی دەوڵەمەندتر بکەن، وا چاکـە نەفـرەت لە درووشمی «زۆربێو بۆربێ» بکـەین و، هەمـوولا هەوڵی ئەوەمان بێ شتی بە سوودو بە کەڵك بخەینە روو، ئەمـەش لەچییـەوە دەبێ، بێشك لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی بەردەوام و خوێندنەوەی زۆر دێتە دی.. جا هەر بەم بۆنـەیەوە وای بەچاك دەزانم لە بڵاوکردنەوەدا بەپەلە نەبن و، گەلێ جاریش بە قسەی ئەم و ئەو فریو نەخۆن و ، نەخەڵەتێن.. چونکە نووسین و بەرهەمی چاك و سەرکەوتوو لە دوورەوە دیارە..

به هەر حاڵ ئەم بەرهـەمانەی بۆتان ناردبووین هێشتا بەچـاکی پێنـەگـەیشتبـوون، دەبێ ببـوورن کە شیـاوی بڵاوکردنەوە نەبوون، دووبارە سوپاستان دەکەین.

بۆ خوشکە شیلان چۆمانی..

خوشکی ئازیـز: پێشەکی سوپاسی دڵسۆزیت دەکەین؛ بەڵام دەبێ ببـووری کە ئەو شیعرەی‌بەناوی «چۆمان»ەوە ، لەگەڵ «هـەست دەربـڕینـەکـەت» هەردووکیـان لەبـار نەبـوون بۆ

بڵاوکردنەوە چونکە گەلێ کەم و کورتییان تێدا بوو، خۆزگە زیاتر بەرهەمی شاعیرانی کوردت دەخوێندەوە تاوەکو شیعری سەرکەوتووتر بنووسیت.

● بۆ کاکە «انور نادر رسول» لە هەولێرەوە:

کاکی برا سوپاست دەکەین؛ بەداخەوە شیعرەکەت «بەفرو دیمەن» شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو، دەبێ بمان بەخشی.

● بۆ خویشکامە «دایکا ریفینگێ» ل مویسل..

خویشکا هێژا سوپاس بۆتەو بۆ هاریکاریا تە دگەل گۆڤارا مە..

ئەڤ دوو هوزانێت تە بۆمە هنارتی ل بن ڤان ناڤ و نیشانا «کیمە ئەز، سروودا ئەڤینێ»، مخابن هەژی بەلاڤکرنێ نەبوون، ئەم هیڤیدارین هوزانێت چێتر بۆمە بنێری. جارەکادی ئەم سوپاسیاتە دکەین..

● بۆ ئەو برا بەڕێزەی ئەم دوو شیعرەی خوارەوەی بۆ ناردووین:

«جێ ژوان، کوێستانەکەم»، براله هاوکاریت لەگەڵ «کاروان»دا مایەی ڕێزو خۆشەویستیمانە، بۆ بڵاونەکردنەوەی هەردوو شیعرەکە دەبێ ببووری کە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون. چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و هەربژیت.

● بۆ ئەو برایەی شیعری «سکاڵای نامۆیەکی» بۆ ناردووین..

سوپاس بۆ ئەو برا ئازیزەمان و، داوای لێبووردنیشی لێ دەکەین کە شیعرەکەی شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو، هیوادارین لێمان زویر نەبێ و شیعری باشترمان بۆ بنێرێ.

● بۆ کاکە «بارزان کۆسپدار»..

پێشەکی هیوای ئەوە دەخوازین کە کاکە «بارزان» لەمەودوا هیچ کۆسپێکی لە بەردەمدا نەمێنێ، بۆ ئەوەی شیعری سەرکەوتووتر بنووسێت، بۆ ئەو دوو شیعرەمیش «کلپەی بیرەوەری، وا دروست بووم» کە بۆی ناردووین هەردووکیان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون، داوای لێبووردنی لێ دەکەین.

● بۆ کاکە «شالاو سالار نەریمان» لە چەمچەماڵەوە..

کاکی برا، ئەو چیرۆکەی بەناوی «مل ملانێی ئەفسانەی ترس»»، کە بۆت ناردووین لەڕووی هونەری چیرۆکەوە گەلێ کەم و کورتی تێدا بوو بۆیە بۆمان نەکرا بڵاوی بکەینەوە، دەبێ بمان بەخشی.

● کاکە «ئاوات هێدی»..

سوپاست دەکەین بۆ ئەو شیعرەی بەناوی «دەنگی دووری»یەوە بۆت ناردووین؛ بەڵام داخمان ئاڵهێ کە لەگەڵ ڕێبازی گۆڤارەکەماندا ناسازێ و بەچاکیش بێنەکەبیروە.

● بۆ کاک «شێرکۆ بێباک» لە شاری سلێمانییەوە..

براکیان؛ سوپاس بۆ ئەو شیعرەی بەناوی «نامەیەکی بێ وەڵام»»، بەداخەوە هەموویمان بۆ بڵاونەکرایەوە، بۆیە تەنها ئەم دوو کۆپلەیەمان لێ هەڵبژارد، هیوادارین شیعری سەرکەوتووترمان بۆ بنێری.. دووبارە سوپاس.

● نامەیەکی بێ وەڵام

که لێت دەپرسم .. وەڵامی..
نامەم بۆچی نادەیتەوە؟
گرێی دڵ و دەروونی خۆت
بۆچی بۆمن ناکەیتەوە؟

●★●★●

دەڵێ: چونکە لەبەردەمی
ووشەکانتا دادەمێنم
لە گەورەیی هەر یەکێکیان
وورد دەبمەوەو ڕادەمێنم

●★●★●

● جارێکی دی بۆ ئەو بەڕێزانەی ئەم بەرهەمانەی خوارەوەیان بۆ ناردووین:

«ڕێبوار، سروودی مان و بەرگری، چاوەڕوانی» ببوورن لە بڵاونەکردنەوەی بەرهەمەکانتان چونکە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون، خۆزگە بەرهەمی باشترتان بۆ دەناردین.

بەم جۆرە گۆشەی ئەمجارەی گۆڤارەکەمان کۆتایی پێدێنین، بە هیوای بەیەک گەیشتنەوەیەکی دیکە لەگەڵ یەکەم ژمارەی ساڵی هەشتەمی تەمەنی گۆڤارەکەتان، گۆڤاری کاروان، هەر شادو سەرفرازبن و هەربژین.



# كاروان

مجلة ثقافية شهرية تصدرها الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب
باللغتين الكردية والعربية

رئيس التحرير
حكمت حاجي سليم

نائب رئيس التحرير
حسين رشواني

٨٠
تشرين الاول والثاني
١٩٨٩
السنة الثامنة

الثمن ٥٠٠ فلس

في هذا العدد

● رسالة السيد الرئيس القائد صدام حسين بمناسبة عيد المولد النبوي الشريف — كاروان — ١٣٠
كلمة العدد: — ١٣٣
ـ متى لايصح الا الصحيح. — نائب رئيس التحرير.
● من الشعر الكردي الحديث: — ١٣٦
ـ قصائد عباس عسكر: مشحونة بروح التصوف الباحث عن الحقيقة. — ترجمة وتقديم: جليل محمد شريف
ـ الشهيد.. — شعر: آزاد دلزار — ترجمة: عبدالله قادر كۆران
● الدراسات اللغوية: — ١٣٩
ـ اللغة الكردية ـ لهجة بهدينان.. — متي فليب البازي
● الدراسات التاريخية: — ١٤٩
ـ الوضع الدولي لكردستان (القسم الاول) — كتابة: د. م. س لازاريف — ترجمه الى اللغة الكردية: د. كاوس قفطان — تعريب: كمال غمبار

العنوان: اربيل: الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب
ـ مجلة كاروان: هاتف: ٢٠٨٨٢



# رسالة السيد الرئيس القائد صدام حسين بمناسبة عيد المولد النبوي الشريف

بسم الله الرحمن الرحيم

في مثل هذا اليوم ، وقبل اكثر من الف واربعمائة سنة ، كانت الأمة العربية تتمخض عن ولادة تعيد لها مسؤوليتها تجاه نفسها وتجاه الانسانية من موقع قيادي خاص . وكانت الانسانية ، حين كانت الأمة في مرحلة مخاض لتلد وليدها باسم الله ، في انتظار هذا الوليد بعد ترقب .... وبعد ان حان وقت الولادة ، ولد محمد بن عبدالله في الثاني عشر من ربيع الاول .

ومع هزة الولادة وتدافع امواج معانيها ، انشق إيوان كسرى ... ومن الولادة ، انشقاق إيوان كسرى ، بان غرض الولادة ... وتبدأ بداية جديدة في مسيرة الانسانية .

بعد أربعين سنة من الولادة ، تلطف الله سبحانه وتعالى ، فاختار محمداً العربي رسولاً ، فاهتزت باختياره ، الذي ابلغ عن طريق الملك الصالح جبريل ، كل مواطن السوء في ارجاء الارض ، توطئة لتداعيها على التوالي بانتشار نور الاسلام ، وانتفاضة أهل الارض ، بقيادة العرب ، على المساوىء التي نالت من انسانيتهم ، وابعدتهم عن التوازن الصحيح في مسعاهم وعلاقاتهم ورؤيتهم الى ما هو روحي وما هو مادي ، في النظرة والتصرف .

لقد انشق ايوان كسرى في الارض تعبيراً عن سقوط ثقل الرسالة على رمز الظلم والفساد في الارض وعن دور المعاني التي يطلقها رب السماوات والارض ، في احكام الصلة وإقامة التوازن بين ما هو مادي وما هو روحي ، مع أرجحية خاصة لما هو روحي على ما هو مادي لاغراض القيادة ، وأغراض اخرى حددها الله سبحانه .

وفي الولادة ، واضفاء دور النبوة ، وتبليغ الرسالة الى الانسانية ، مما كلف الله به محمداً ، صلى الله عليه وسلم ، جدد الله ثقته بالعرب مرة اخرى كملاك قيادي ، بلا منازع ، للانسانية على الطريق القويم ، بعد ان بارك ارضهم بالولادة

قال تعالى « وانه لذكر لك ولقومك وسوف تسالون » .

« صدق الله العظيم »

لقد اعلن الله بالولادة ، التي تباركت فيما بعد بالنبوة ، المطلوب هو ان تبدا الانسانية مسارا جديدا ، واعلن في ان الانسانية ، بعد ان كانت من قبل قد ارتقت الى مرحلة جديدة بولادة سيدنا المسيح ، وبالنبوة التي باركه الله بها ، مطلوب منها ان ترتقي الى مرحلة جديدة ، وان تتوّج بمرحلة ليس لها منافس من بعد ، وان العرب ، بعد ان قادوا

مرحلة ابلاغ رسالة رب السماوات والأرض في زمن سيدنا عيسى عليه السلام ، وبعد ذلك ، لم ينته دورهم في إبلاغ ما يريده الله الى الأرض عن طريق رسول جديد ، ولم ينته دورهم كملاك للجهاد والنضال ، وكمثل ونموذج يسهل مهمة الانسانية في الاهتداء الى ما هو حق . ومن كل هذا تتضح العبر والدروس .

قال سبحانه « والله اعلم حيث يجعل رسالته » .

« صدق الله العظيم »

وفي هذه المناسبة يصعب ، بل ويستحيل على من هو من امثالنا ، ان يحيط بكل معاني العلاقة سواء داخل الانسانية ، مما ارادها الله ، او التي تخص العلاقة بين الانسانية وربها ، وعند ذلك لابد من الاختيار الى ما يمكن الاهتداء اليه بصعوبة اقل ، وتقديم ما يقتضي التذكير به على ما عداه ..

ولم يُعْلِمنا الله ، سبحانه وتعالى ، بدور كهذا لاية امة ، غير امة العرب وبتواصل لم ينقطع عبر كل الانبياء والرسُل بلا استثناء .

ان العرب هم الامة التي اختار لها الله دورا قياديا مستمرا لتمتثل الى إرادته ، ولتبلغ رسالته ، الى الانسانية في الارض ، وان انتهاء دور الرُسل في ابلاغ رسالات رب السماوات والارض ، وعدم ظهور الأنبياء لم ينه دور الامة في قيادة الانسانية بالنموذج ، والتبشير بالمعاني التي ارادها الله ، وان هذا يفترض ان نتذكر دورنا ولا ننساه ، ويفترض ايضا ان تتذكر الامم الأخرى ان ملاك القيادة في الارض قد اختاره الله على التوالي ووضعه في العرب ، وانها ، اذا ما ارادت فعلا

ان لا تنقطع عن معاني الرسالات ، وان تعاون في ان تتواصل الانسانية مع هذا العمق التراثي والروحي ولا تنقطع عن معانيها الشريفة ، يجب ان لا تنسى هذا ، وان لايتجاوز عليه كائن من كان ، وان لا ينسى العرب هذا ايضا ، وان لايتجاوزوا على انفسهم ، ويغبنوا دورهم ، وان لايتجاوزوا على الانسانية ايضا عندما يتخلون عن دورهم في قيادتها .

ولكي لايتجاوز العرب على انفسهم ، عليهم ان لا ينقطعوا عن إظهار النموذج الصالح ، وممارسة دورهم على هذا الأساس ، ولا ينفع في ممارسة الدور والمسؤولية مجرد التبشير اللفظي بعبارات او جمل مكررة ، ولا حتى الاعلان والتذكير بايات من الذكر الحكيم ، ونصوص من السُنَّة النبوية المطهرة .

ان مجرد الكلام عن هذا ، فحسب ، يزيد على العربْ اوزار تقاعسهم عن دورهم ، ويزيد على الانسانية اوزارا فوق ثقل الأوزار التي تنوء بها جرّاء فعلها .

وان البداية الصحيحة ، تصوراً وتصرفا ، هي في إعادة التوازن بين ما هو مادي وما هو روحي ومعنوي ، مع ارجحية خاصة للاعتبارات الروحية والمعنوية ، كما قلنا من قبل . وان الانسانية كلها بحاجة الى ذلك النموذج ، الذي جسده الانسان العربي في العقل والعمل ، في المراحل المشرقة لمسيرة الانسانية ، بقيادة الامة العربية ، والتي اعقبت يوم شروق الرسالة السماوية . وحذار من ان نحرك الماضي تحريكا جامداً منقولاً الى الحاضر ، او ان نتراجع اليه ظناً منا باننا في هذا انما نمتثل الى معانيه وقيمه ، لاننا ، ان فعلنا هذا ، سوف نشوّه معاني كل الرسالات السماوية ، ولن نؤكد اي معنى من معانيها ، وسوف نؤكد العجز حيث التوثب مطلوب والابداع صفة القيادة والنهضة ، ونضيف الى الاشجار اليابسة اشجاراً يابسة اخرى .

ان المطلوب هو ان نتمثل معاني الرسالة السماوية التي نقلها جبريل الامين الى محمد بن عبدالله الرسول ، وان نعيد الى امة العرب دورها القيادي المؤثر ، كملاك جهادي قيادي اختاره الله ، نظرا لقدرته على الفعل والقيادة ، ونظرا لاستعداده للعطاء والتضحية والايثار ، وقبل كل هذا ، ومع كل هذا ، لان العرب قد وهبهم الله ، وهيأ لهم ، قدرة فهم رسالته ومعانيها .

